# فەرهەنگی نۆبەرە

## عەرەبی - کوردی

گیو موکریانی

چاپی یەکەم



ئاراس

# فەرهەنگی نۆبەرە

عارەبی - کوردی

## گیو موکریانی

ناوی کتێب: فەرهەنگی نۆبەرە (الباكورة). فەرهەنگێکی عارەبی - کوردییە
دانانی: گیو موکریانی
بڵاوکراوەی دەزگای ئاراس- ژمارە: ٣٦٤
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: بەدران ئەحمەد + حاجی دلاوەر
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: رەهێڵ رەشید + ئەمیر داود
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل + مەلا شاخەوان
سەرپەرشتیاری چاپ: ئاورەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٥
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی رۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٢٠٧)ی ساڵی ٢٠٠٥ی دراوەتێ

# الباكورة

قاموس مدرسي عربي- كردي

**سيرة گيو الموكرياني في سطور**

اسمه عبدالرحمان بن سيد عبداللطيف من اسرة (خزايي- الغزائي) المعروفة في مهاباد المركز الرئيسي في كردستان ايران، ولد عام ١٩٠٣ ودرس العلوم الاولية لدى اخواله وفي مجال العلوم الدينية وصل الى دراسة كتاب النموذج كما ودرس في المدارس الابتدائية ايضاً.

ولما بلغ الحادي عشر من عمره صحبه اخاه الاكبر حسين حوزني -داماو الى حلب في سوريا وهناك استمر في الدراسة حيث قبل في الصف الرابع الابتدائي، ولضعف تحدثه باللغة العربية اضطر أخاه ان يسحبه من المدرسة ويعول على تدريسه دراسة خاصة وفي نهاية السنة الدراسية قدم الامتحان النهائي للصف السادس الابتدائي خارجياً ونجح بتفوق ثم دخل المتوسطة الفرنسية ونال الشهادة اللغوية الفرنسية كما ودرس سنتين في المرحلة الاعدادية مختصاً في الكيمياء وبعدها دخل الكلية الطبية الفرنسية ببيروت وبعد سنتين ترك الدراسة ليصحب أخاه بالتوجه الى بغداد.

صحب گيوي موكرياني أخاه سيد حوزني في نقل مطبعتهم من حلب الى راوندوز وتعاونا في نشر مجلة (زارى كرمانجى - اللغة الكردية) وقاما بطبع مجموعة من الكتب الكردية ايضاً. في عام ١٩٣٥ ترك گيوى موكريانى راوندوز وتوجه الى مدينة (أربيل) واشترى مطبعة من عيسى محفوظي (فضيل) حيث قام بنصبها في هذه المدينة ونشر منها مجلة (النور- روناكى). وبعد وفاة أخيه حوزني الموكرياني عام ١٩٤٧ انفرد بادارة المطبعة ونشر العديد من الكتب واستمر في خدمة الكلمة الكردية وفي الاعوام ١٩٥٤-١٩٦٠ قام بنشر مجلة هەتاو - الشمس من مطبعته بأربيل.

كما وقام بطبع العديد من نتاجاته القيمة ودواوين شعرية عديدة لشعراء الكرد الكلاسيكيين.

يوم ١٩٧٧/٧/٢٤ توقف قلب گيوي موكرياني الكبير وودع الدنيا الفانية بعد ان ترك اثراً لا يبلى.

وحول لقبه الادبي سرد لي قائلا: «وصلت مع أخي حزني الى حلب وكانت الالقاب الادبية متداولة فعرض لي أخي جملة ألقاب منها: گيو، گودرز، پژمان، روستم، دارا، الخ... لأختار واحداً منها وكنت صبياً يافعاً لم استوعب معاني هذه الالفاظ فآثرت السكوت فأحس أخي بذلك واختار لي اللقب الادبي (گيو) الذي تلقبت به في أعمالي الادبية كافة».

**گيو موكرياني الصحفي:**

أسهم المرحوم گيوى موكريانى باصدار المجلات الآتية:

١- زارى كرمانجى (باللغة الكردية) - مجلة أدبية، تأريخية، فنية، اجتماعية. كان گيوى موكريانى (مدير إدارة) فيها وكان اخوه حزني المكرياني صاحب امتيازها ورئيس تحريرها. صدر العدد الأول منها في حزيران

١٩٢٦ والعدد الأخير الذي كان يحمل رقم (٢٤) صدر في ١٩٣٢/٧/٣١ والمعروف انها كانت تصدر في رواندوز.

٢- روناكى (النور) مجلة، اسبوعية، اجتماعية، علمية، أدبية، صاحب امتيازها المحامي شيت مصطفى ويديرها حزني الموكرياني وكان گيوى موكريانى يقوم بالتحرير فيها وطبعها ونشرها، صدر العدد الأول منها في ٢٤/ ١٠/ ١٩٣٥ وصدر العدد الأخير والذي كان يحمل الرقم (١١) في ١٩٣٦/٥/٢٦ ومن الجدير بالذكر ان هذه المجلة كانت تصدر في مدينة أربيل.

٣- هەتاو - الشمس، مجلة، اسبوعية، أدبية، صاحب امتيازها ومحررها الرئيس گيوى موكريانى صاحب إمتيازها المحامي ابراهيم عزيز دزەيى ثم تولى محمد شهاب الدين الدباغ امتيازها الرسمي ومن ثم الرائد المتقاعد جلال قادر صدر العدد الاول منها في أربيل في مايس ١٩٥٤ وصدر العدد الأخير ١٨٨ في أربيل أيضاً في ٣٠/ ١٠/ ١٩٦٠.

**من نتاجات گيوى موكرياني المطبوعة:**

١- رسالة گيو (گيونامه) كراسة لغوية تأريخية صدرت سنة ١٩٦٠ في مطبعة (كردستان) بأربيل وبتضمن (٤٠) صحيفة.

٢- الألفباء الكردية المصورة بالاحرف اللاتينية طبعها في مطبعته بأربيل عام ١٩٦٠ كما وقام عام ١٩٧٢ بطبع كتاب آخر للالفباء باللهجات الكردية السورانية والبادينانية والهورامية والفيلية وبأربعين صفحة.

٣- قاموس كردستان - قاموس كردي - كردي المطبوع في دار اراس للطباعة والنشر في اربيل عام ١٩٩٩

٤- كيف تتعلم اللغة الكردية في ثلاثة اشهر فقط وبدون معلم، يتضمن الكتاب نماذج لغوية باللغتين العربية والكردية، ومن الجدير بالذكر ان هذا الكتاب طبع ثلاث مرات في الأعوام ١٩٦٣، ١٩٦٩، ١٩٧٤ في مطبعته بأربيل.

٥- الاسماء الكردية للبنين والبنات، قام بطبعه مرتين ١٩٥٨-١٩٧١.

٦- تعبير الرؤيا (خەون نامه) لابن سيرين، قام بترجمته من اللغة العربية، طبع في أربيل عام ١٩٧١ وبحجم ٣١٠ صحيفة.

٧- الطرائف والنكات طبعها مرتين وفي عامي ١٩٦٥ و١٩٧٥.

٨- نكات الملا نصرالدين (جحا) قام بترجمته وطبعه عام ١٩٦٧ واعاد طبعه عام ١٩٧٥ ايضاً وفي مطبعته بأربيل.

**أما الدواوين الشعرية التي قام بجمعها وكتابة المقدمات لها وطبعها على نفقته في مطبعته كردستان فهي:**

١- ديوان الحاج قادر الكويى قام بطبعه ثلاث مرات وآخرها عام ١٩٦٨.

٢- (مم و زين) للشاعر احمد الخاني طبعه ثلاث مرات وآخرها عام ١٩٦٨.

٣- ديوان الشاعر (دلدار) عام ٢٥٧٣ الكردية.

٤- ديوان الشاعر (كردي) طبعه ثلاث مرات آخرها عام ١٩٧٣.

٥- ديوان الشاعر الملقب بـ(أديب) طبعه مرتين ثانيهما عام ١٩٧٦.

٦- ديوان (نالى) طبعه مرتين ١٩٦٢، ١٩٧٣.

٧- ديوان الشاعر مصباح الديوان الملقب بـ(أدب) قام بطبعه ثلاث مرات آخرها عام ١٩٧٦.

٨- ديوان الشاعر (طاهر بك الجاف) طبعه ثلاث مرات آخرها عام ١٩٦٦.

٩- ديوان الشاعر (احمد مختار الجاف) طبعه مرتين آخرهما عام ١٩٦٩.

١٠- ديوان الشاعر (ملا محمد الكويى) طبعه أربع مرات آخرها عام ١٩٦٩.

١١- ديوان الشاعر (سالم) طبعه مرتين، ثانيها عام ١٩٧٢.

١٢- ديوان الشاعر (صافي) طبعه ثلاث مرات آخرها عام ١٩٧٣.

ومن المعروف ان جميع الدواوين والكتب قام بطبعها في مطبعته (كردستان) بأربيل.

**نتاجاته الغير مطبوعة:**

١- تأريخ الادب: يتضمن سيرة الالاف من الشعراء وادباء الكرد من جميع ارجاء كردستان والمئات من صور لاولئك الادباء.

٢- طبابة گيو: تتضمن المسودة الازهار والثمار والشجيرات الطبية التي تستخرج منها الادوية الشعبية الكردية المجربة لمعالجة المئات من الامراض والاورام.

# نۆبەرە

## فەرهەنگێکی قوتابخانەییی عارەبی - کوردییە
## نزیکەی ٢٥٠٠٠ وشەیە، دانراوی گیو موکریانییە.

**گیو موکریانی لە چەند دێڕێکدا:**

نێوی عەبدوڕەحمانە کوڕی سەید عەبدوللەتیفە و لە بنەماڵەی خەزاییە. لە ساڵی ١٩٠٣دا پێی ناوەتە سەر رووی زەوی و لەلای خاڵەکانیدا خوێندوویەتی. لە زانستی کۆندا (ئوغووذەج)ی تەواو کردووە و لە قوتابخانەی سەرەتاییشدا خوێندوویەتی.

لە تەمەنی یازدە ساڵیدا لەسەر خواستی کاکی حوسێن حوزنی (داماو)ی موکریانی روو دەکاتە حەڵەب لەوێش لە خوێندندا بەردەوام دەبێ و لە پۆلی چوارەمی سەرەتایی دادەندرێت، لەبەرئەوەی نەیتوانیوە بەزمانی عەرەبی بخوێنێتەوە، بەڵام قسەی پێ کردووە ویستوویانە بیبەنە پۆلی دووەم. بەهەشتی داماوی کاکی لە قوتابخانەی دەردێنێ و مامۆستایێکی تایبەتی لە ماڵەوە بۆ دەگرێ لە کۆتایی ساڵدا یەکسەر تاقیکردنەوەی پۆلی شەشەم بەسەرکەوتوویی دەدا. روو لە قوتابخانەی ناوەنجیی فەرەنسی دەکات. جالیسییەی فەرەنسی تەواو دەکا. دوو ساڵ لە بەشی کیمیا دەخوێنێ و داخلی کۆلیجی پزیشکی فەرەنسی دەبێ لە بێروت. دوو ساڵێک لەوێدا دەمێنێتەوە بەسەریدا دێنە بەغدا و خوێندنی لێ تێک دەچێ.

گیوی موکریانی لەگەڵ داماوی کاکی، ئەو چاپخانەیەی، کە لە حەڵەبەوە هێنابوویان لە ڕەواندوز دای دەمەزرێنن. گۆڤاری زاری کرمانجیی پێ بڵاو دەکەنەوە و چەند نامیلکەیەکی تریشی پێ چاپ دەکەن، گیوی موکریانی لە ساڵانی ١٩٣٤-١٩٣٥دا رەواندوز بەجێ دێڵێ و روو دەکاتە هەولێر و چاپخانە بچووکەکەیان هەر لە ڕەواندوز بەجێ دێڵێ و چاپخانەیێکی گەورەتر لە موسڵ لە فضیل (عیسا مەحفووزی) دەکڕێ و گۆڤاری ڕوناکیی پێ چاپ دەکەن. لە دوای کۆچکردنی داماوی کاکی لە ساڵی ١٩٤٧دا خۆی بەتەنیا هەڵسووڕاندنی چاپخانەی کەوتە ئەستۆ و لە خزمەت و ڕاژەکردنی وشەی کوردیدا بەردوام دەبێ. ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٥٤تا ١٩٦٠ گۆڤاری هەتاوی پێ بڵاودەکردەوە. چەندین دیوانی شاعیرانی کلاسیکی کوردی کۆکردەوە و چاپی کردن، بێ لە بەرهەمە بەنرخەکانی خۆی. لە ١٩٧٧/٧/٢٤دا دڵی گیوی موکریانی لە لێدان وەستا و ماڵئاوایی لە جیهانی ڕۆشن کرد.

**نازنێوی ئەدەبی ئەوڕەحمانی موکریانی**

وەکو خۆی بۆی گێڕاومەتەوە. کاتێ دەگاتە حەڵەب. کاکی، نێوی خواستەمەنیی زۆر دەبێ وەکو، گیو، گودەرز، پژمان، روستەم، دارا... و داوای لێ دەکا کە لەوانەدا نێوێک بۆ خۆی هەڵبژێرێ، ئەویش منال دەبێ نازانێ کامیان هەڵبژێرێ بۆیە بێ دەنگ دەبێ لە ئەنجامدا بەهەشتیی کاکی یەکەمین نێوی خۆی پێ دەبەخشێ کە گیو بوو.

### گیویموکریانیی فەرهەنگ نووس

هەر کە گیوی موکریانی لە حەڵەب دەبێ شارەزای زمانی عەرەبی و فەرەنسی دەبێ، چاوی بەفەرهەنگی زمانانی دی دەکەوێ، کەڵکەڵەی فەرهەنگ دانانی دەکەوێتە مێشک و ماوەیێکی زۆر بەلادیێیەکانی کوردستاندا دەسووڕێتەوە بۆ کۆکردنەوەی وشەی کوردی، هەر وەک لە خۆیم بیستووە هاندەری یەکەمی ئەم کردەوەیەی کاکی دەبێ لە ئەنجامدا ئەم فەرهەنگە چاپکراوانە ڕێک دەخات:

١- فەرهەنگی ڕابەر - المرشد: فەرهەنگێکی عەرەبی - کوردییە لە شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٥٠دا لە چاپخانەی کوردستاندا چاپی کردووە، کە نزیکەی ١٥ هەزار وشەیە.

٢- فەرهەنگی کۆڵکە زێڕینە: ئەم فەرهەنگە بەزمانی کوردی، فارسی، عەرەبی، فەرەنسی و ئینگلیزییە لە ساڵی ١٩٥٥دا لە هەولێر لە چاپخانەی کوردستان بۆ چاپی یەکەم ١٣٢ لاپەڕەی ناوەنجی لێ چاپکراوە. بەڵام چاپی دووەمینی لە ساڵی ١٩٦٦دا بە"٢٤٠" لاپەڕە دەرچووە.

٣- فەرهەنگی مەهاباد: فەرهەنگێکی "کوردی - عەرەبی"یە لە هەولێر، لە ساڵی ١٩٦١ لە چاپخانەی کوردستاندا چاپ کراوە، ٨٠٠ لاپەڕەی ناوەنجییە و نزیکەی "٣٠" هەزار وشەیە.

٤- فەرهەنگی نۆبەرە - الباکورە: ئەم فەرهەنگە عەرەبی کوردییە. ئەم فەرهەنگە لەسەر دەستووری فەرهەنگەکانی ڕۆژئاواییەکانە، تا ئەگەر قوتابییێکی سەرەتاییش ئارەزووی هەر وشەیێکی عەرەبی بکات بەبێ ماندووبوون و زۆر بەشوێن داگەڕان زوو بیدۆزێتەوە بەپێچەوانەی (المنجد) و فەرهەنگەکانی دیی عەرەبی، کە کەسێکی تەواو لە ڕێزمانی عەرەبی پسپۆڕێکی پوخت نەبێ ناتوانی زۆرترین وشە پێویستەکانیان تێدا بدۆزێتەوە.

### گیو موکریانیی ڕۆژنامەوان:

ئەو گۆڤارانەی گیوی موکریانی هاوبەشیی دەرهێنانی کردوون ئەمانەن:

١-زاری کرمانجی: گۆڤارێکی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و مێژوویی و هونەری بووە. گیوی موکریانی بەڕێوەبەر بووە و داماوی موکریانی خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر بووە. لە حوزەیرانی ١٩٢٦دا یەکەمین ژمارەی و لە ١٩٣٢٧/٣١دا دوا ژمارەی دەرچووە. ئەم گۆڤارە تەنێ ٢٤ ژمارەی لێ بلاوبووە.

٢- ڕووناکی: گۆڤارێکی هەفتەیی و کۆمەڵایەتی و عیلمی و ئەدەبی بووە. لەبەر چەند هۆیەک پارێزەر شێت مستەفا خاوەنی ئیمتیاز بووە. بەڵام بەڕێوەبەری ڕاستەقینەی حوزنی موکریانی بووە و گیویش یاریدەدەر و چاپکەری بووە و بەوتاریش هاوکاری کردووە. یەکەمین ژمارەی لە ٢٤/ ١٠/ ١٩٣٥دا و دوا ژمارەی لە ٢٦/ ٥/ ١٩٣٦دا چاپ کراوە هەمووی ١١ یازدە ژمارەی لێ دەرچووە.

٣- هەتاو: گۆڤارێکی ئەدەبیی هەفتەییی کوردی بوو،ە گیوی موکریانی خاوەنی ئیمتیاز و هەڵسووڕێنەری بووە.سەرنووسەری پارێزەر ئیبراهیم عەزیز دزەیی، لە دوای ئەودا پارێزەر محەمەد شەهابەدین دەباغ بووە و دوا سەرنووسەری ئەفسەری خانەنشین ڕەئیس جلال قادر بووە. یەکەمین ژمارەی لە مانگی مایسی ١٩٥٤دا و، دوا ژمارەی لە ٣٠/ ١٠/ ١٩٦٠دا بلاوبۆتەوە، کە ژمارە ١٨٨ بوو.

**بەرهەمە چاپکراوەکانی دی:**

١- گیونامە: نامیلکەیەکی چل لاپەڕەییە، مێژوویی و زمانەوانییە. لە ساڵی ١٩٦٠دا لە شاری هەولێر لە چاپخانەی کوردستاندا چاپی کردووە.

٢- ئەلف و بێی کوردیی وێنەدار بەپیتی لاتینی: لە هەولێر لە ساڵی ١٩٦٠ چاپ کراوە لە ژێر هەمان نێونیشاندا کتێبێکی دیی لەسەر ئەلف و بێی کوردی، کە بەشێوەکانی سۆرانی و بادینی و هەورامی و فەیلییە دانا، ١٦٠ لاپەڕەی قەبارەی ناونجییە لە ساڵی ١٩٧٢دا دەرچووە، نزیکەی چل لاپەڕەیەکیشی بۆ کورتەی ڕێزمان تەرخان کردوە.

٣- تعلم اللغة الكردية: کە بۆ فێربوونی زمانی کوردییە لە ماوەی سێ مانگدا بەبێ مامۆستا. هێندێ بابەتی ڕێزمانیشی بەزمانی کوردی و عەرەبی روون کردووەتەوە. ئەم کتێبە سێ جار لە ساڵانی ١٩٦٣، ١٩٦٩، ١٩٧٤ لە هەولێر، لە چاپخانەی کوردستان چاپ کراوە.

٤- ناوی کچ و کوڕانی کوردی: لە هەولێر دوو جاران چاپ کراوە لە ساڵانی ١٩٥٨و١٩٧١دا کە سەدان نێوی کۆن و نوێی کوردی تێدایە(*).

٥- خەون نامە : لە زمانی عەرەبییەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی، لە هەولێر لە ساڵی ١٩٧١دا لە چاپخانەی کوردستان چاپ کراوە کە ٣١٠ لاپەڕەیە.

٦- بۆ پێکەنین: چاپی یەکەمین لە ساڵی ١٩٦٥ و چاپی دووەمین لە ساڵی ١٩٧٥ چاپ کراوە.

٧- مەلای مەشهوور: چاپی یەکەمین لە ساڵی ١٩٦٧ و چاپی دووەمینی لە ساڵی ١٩٧٥ لە هەولێر چاپ کراوە.

**ئەو دیوانانەی کۆی کردوونەتەوە و پێشەکیی بۆ نووسیون و چاپی کردوون:**

١- دیوانی حاجی قادری کۆیی، هەولێر چاپی دووەمین، ١٩٥٣، چاپی سێیەمین ١٩٦٢

٢- ئەحمەدی خانی: مەم و زین، هەولێر چاپی سێیەمین، ١٩٦٨

٣- دیوانی دڵدار، هەولێر، ٢٥٧٣

٤- دیوانی کوردی، هەولێر چاپی دووەمین ٢٧١٣ چاپی سێیەمین ١٩٧٣

٥- دیوانی ئەدیب، هەولێر چاپی یەکەمین ٢٥٧٣، چاپی دووەمین ١٩٧٦

٦- دیوانی نالی، هەولێر چاپی سێیەمین، ١٩٧٣

٧- دیوانی ئەدەب، هەولێر چاپی سێیەمین، ١٩٧٦

٨- دیوانی تایەربەگی جاف، هەولێر، چاپی سێیەمین ١٩٦٦

٩- دیوانی ئەحمەد موختار بەگی جاف، هەولێر، چاپی دووەمین، ١٩٦٩

١٠- دیاری مەلا محەمەدی کۆیە، هەولێر، ١٩٦٩ چاپی چوارەمین

١١- دیوانی سالم، هەولێر، ١٩٧٢، چاپی دووەمین

١٢- دیوانی صافی: هەولێر، ١٩٧٣، چاپی سێیەمین

**بەرهەمە چاپنەکراوەکانی دی:**

١- مێژووی وێژە (تاریخ الأدب): کە شوێنەواری هەزاران هەستیار و داهێنەر و زانا و دانەرانی هەموو گۆشەیێکی کۆن و تازەی کوردستانی تێدایە و، وێنەی چەند سەد بوێژێکی تێدایە(**).

٢- پزیشکنامەی گیو: لەو گژوگیایانەی کوردستان دەدوێ، کە بۆ گەلێک نەخۆشی تاقی کراونەتەوە و چارەسەری گەلێک دەرد و ئازار و برینی لەشیان پێ کراوە و دەشکرێت.

کوردستانی گیوی موکریانی

---

(*) لە دوای پێداچوونەوەمدا بۆ سێیەمین جار لە چاپخانەی خۆماندا هەر لە هەولێر لە ساڵی ١٩٨٥دا چاپ کرایەوە.

(**) بەرگی یەکەمی ئەم شوێنەوارە بەنێوی کەشکۆڵی گیو لە بەهاری ١٩٨٦ دەرچوو و لە بەغدا چاپ کرا.

## سەرنجێک لەلایەن دەزگای ئاراس-ەوە

کاتێ خۆی کە دەزگاکەمان فەرهەنگی کوردستان-ی مامۆستای گەورە گیو موکریانیی لە چاپ دا، پەنای بۆ ئەوەبرد لیژنەیەک بۆ تەتەڵە و پاکنووسکردن و پڕکردنەوەی کەموکورتییەکانی ئەو فەرهەنگە پێکەوە بنێ. لە پێشەکیی چاپی فەرهەنگی کوردستاندا، بەڕێز د. کوردستان موکریانی کە سەرپەرشتیاری لیژنەی ناوبراو بوو، ئاماژەی بەکاری لیژنەکە داوە، بەڵام لە چاپکردنی ئەم فەرهەنگەدا نەمانتوانی لیژنەیەکی هاوشێوە بۆ هەمان مەبەست دابنێینەوە ئەویش لە سۆنگەی کەمیی کادیری پسپۆڕ یان دەست نەکەوتنی کەسانی خۆماندووکەر لەم بوارەدا.

کێشەی هەرە ئاڵۆزی ئەم فەرهەنگەی بەردەست، ناخۆشیی دەسخەتی مامۆستا گیو بوو. جگە لەمە، لە پاش و پێشکردنی وشەکاندا ناڕێکوپێکی بەدی دەکرا و وشەی دووبارەش زۆربوون. هەروەها چەندان وشەی ئاخاوتنی گەلێریی عارەبیش (واتە: زمانی عامی) خرابوونە ناو فەرهەنگەکەوە کە دەبوایە لابدرێن. ئێمە وەکو دەزگا هەموو ئەم کارانەمان بەجێ گەیاند و کاتێکی زۆر و ماندووبوونێکی زیادەمان بەخت کرد بۆ پیت لێدان و نووسینەوە و هەڵەبژێریی ئەم فەرهەنگە. لەم پێناوەدا چەندان ساڵە ژمارەیەک لە کارمەندانی دەزگای ئاراس بەدڵسۆزییەوە کار لەم فەرهەنگەدا دەکەن و ناوبەناوێک پشوویەک دەدەن ئینجا دەگەڕێنەوە سەری. هەرچەندە لەو باوەڕەشداین کەوا هێشتا کەموکورتی لە کارەکەدا ماون لەبەرئەوەی وەک گوتمان کەسێکی تایبەتمەندمان دەست نەکەوت. لێرەدا دەبێ ئاماژە بەڕۆڵی کارمەندی لێهاتوو کاک شاخەوان کەرکوکی (مەلا شاخەوان) بکرێ کە ئەرکی پێداچوونەوە و هەڵەبژێریی لەم فەرهەنگەدا کێشاوە. شایەنی ئاماژەپێدانە، تەنیا چەند پیتێکی سەرەتای ئەم فەرهەنگە لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی رابردوودا لەلایەن زانکۆی سەلاحەدینەوە چاپ کرابوون، بەڵام ئەوانیش هەر پڕبوون لە کەموکورتی.

بۆیەش ئەم سەرنجانەمان لێرەدا نووسی تا ئەگەر یەکێک لە دواڕۆژدا سەرنجی دەفتەرە دەسخەتەکانی مام گیوی ئەمر بدات، ئەم راستییانەی سەرەوەی لەبەرچاوبێت. هەڵبەتە گیو موکریانی لە کاتێکدا ئەم کارە بێ وێنانەی ئەنجام داوە نە کەسی لەگەڵدا بووە هاوکاریی بکات و نەهیچ کەرەستە و ئامێرێکی پێشکەوتووشی لەبەردەستدا بووە کارەکەی بۆ ئاسان بکات. ئەو تەنیا وچان نەدان و دڵسۆزی و خۆبەخت کردن پشتیوان و هاندەری بوون.

دەبێ ڕۆڵی خاتوون کوردستانیش لەبیر نەکەین کە زۆر هاوکاریی دەزگاکەمان دەکات بۆ چاپکردن و چاپکردنەوەی بەرهەمەکانی حوسێن حوزنیی مامی و گیو موکریانیی باوکی. سوپاسی دەکەین و هەر سەرکەوتووبێت.

بەدران ئەحمەد حەبیب

هەولێر ٨/٤/٢٠٠٥

# أ

**أ:** پیتی یەکەمین (ئابێ)ی عەرەبییە.

**أ: اداة الاستفهام مثل: الیس کذلك؟** ئایا وا نییە؟ ئایا، ئەرێ، داخووا، چما، ما، چمان، ئاخۆ، ئاخووا، هەبێ، هەیاران.

**ائتلاف:** هۆگر بوون، ڕام بوون، هۆگری، ڕامی سازان، ڕاهاتن، کۆک بوون، لودان، هۆگری یەکتری بوون، تەبایی.

**أب (ج). آباء:** باب، باوک، باڤ، باو، تاتە، تاتۆ.

- **زوجة الاب:** زڕدایک، باوەژن.

- **أب الزوج أو الزوجة:** خەزوور.

**آب (أغسطوس):** مانگی گەلاوێژێ، پووشپەران، لە (٢١ی ناب تا ٢٠ی ئەیلول) مانگی هەشتەمینی ڕۆمییە و ٣١ ڕۆژە.

**اباءة:** بێزاری، مل نەدان، قایل نەبوون، سەرپێچی، کەدەری و وەرز بوون.

**أبابیل:** پەڕەسلێرکە، دەستە دەستە.

**إباحة:** ڕەوادیتن، بەدروست دانان، ڕەوابوون.

**إبادة:** لەناوبردن، قەلاچۆ تێخستن، دوابڕینەوە، لەنێوبردن، زیندەوار نەهێشتن، ئەجکاندن، لەناوچواندن، قڕ تێخستن، لناڤ برن، تەفروتووناکردن.

- **بالسیف:** بەشیری قڕ تێخستن، قەلارکردن، قڕکردن.

- **البکارة:** تۆڵەشکاندن، کچێنی بردن.

- **أباً عن جد:** پشتاو پشت.

**إبالة:** کۆڵ پێدان.

**ابان:** هەڕەت، کات، جەنگە، بافت، تاڤ، تانگ، گۆنەر.

- **في ابانه:** لە کاتی خۆیدا.

**ابانة:** ئاشکرا کردن.

**ابتداء:** دەست پێکردن، مل لێنان، دانەبەر، هەری کردن، سەرەتا، بەرێ، بەر، داگیراندن.

**ابتدائي:** بەرایی، پێشایی، سەرەتایی.

**الابتداع:** داهێنان، لە نوێوە دەرهێنان.

**الابتذال:** چوواندن، بەکاربردن، کۆن کردن.

**الابتذال:** شەبوون، بێ نرخی، کۆنی.

**الأبتر:** وەجاخ کوێر، کوور دوواندن، دار کور، کەم و کوریدار، دوا بڕیاگ، دوو بڕیاگ، قولە، کلک بڕاو، کولە قولت، دووڤ، کورت، قوندە.

- **طائر أبتر:** باڵندەی قوند، قوڵە.

**الابتراء:** دادانی پێنووس (قەڵەم).

**الابتسام:** زەردە، نەرمە پێکەنین، زەردەخەنە، زەردەلێوی، بزە، بزە خەنە، گوژینەوە، زەردە هاتن.

**الابتسامة الرقیقة:** شەکرەخەنە، شەکرە خەندە.

**الابتعاد:** دوور کەوتنەوە، دەرکران، زەران تەوانگ، شەلپینی، دەربەدەری، لاچوون، وەلاکەوتن، هەلاکەوتن، دووری کردن، خۆ دوورخستنەوە.

**ابتعد:** دوور کەوە، لاچۆ، هەلاکەوە.

**الابتغاء:** ویستن، خوازتین، ئارەزوو کردن، وایستن، ڤیان، ڤین ڤێن.

**الابتکار:** بڕوانە ابداع.

**الابتلاء:** پێوەبوون، هەڵوەدابوون، دووچاربوون.

- **الابتلاء بنکبة:** تووشی نەگبەتی هاتن.

- **الابتلاء بالمرض:** تووشی نەخۆشی هاتن، نەخۆش کەوتن، تەڤزین.

**الابتلاع:** قووت دان، هەڵلووشین، لرفدان، لرفکردن.

**الابتناء:** دروستبوون، بناخە دانران، دروستکردن.

**الابتهاج:** کەیفهاتن، دڵخۆشی، شادوخەڕۆبوون، پشکووتن، گەشبوونەوە، کەیفخۆشی، خەنی بوون، دڵخۆش بوون، دڵ ڕوون بوونەوە.

**الابتهال:** پاڕانەوە، لالانەوە، دادوهاوار کردن، نزوولە، نیشتووی شیری.

**الابتیاع:** کڕین و فرۆشتن.

**الأبج:** زەق، زاق، چاوکـراوە و زەقـە بەلان: لە ترسـان یا لەبەر سەرما و یا واق ورمانێ هیچ نابینێ.
**الابجد:** شێوە و ڕێککەوتنی ئەلف و بێی عەرەبییە شێوەکە بریتییە لە: (آ ب ج د، ھ و ز، ح ط ی، ک ل م ن، س ع ف ص، ق ر ش ت، ث خ ذ، ض ظ غ.) لەوانەی سەرەوە وشەی دەستکرد دروست دەکرێ وەکو: (ابجد، هوز، حطی، کلمن، سعفص، قرشت، ثخذ، ضظغ). بۆ هەر تاکێکی ئەمانە ژمارەیەکی تایبەتی دروست کراوە بەو چەشنە: آ ١ ب٢ ج٣ د٤ ھ٥ و٦ ز٧ ح٨ ط٩ ی١٠ ک٢٠ ل٣٠ م٤٠ ن٥٠ س٦٠ ع٧٠ ف٨٠ ص٩٠ ق١٠٠ ر٢٠٠ ش٣٠٠ ت٤٠٠ ث٥٠٠ خ٦٠٠ ذ٧٠٠ ض٨٠٠ ظ٩٠٠ غ١٠٠٠ ئەبجەدی زۆرتر بۆ تۆمارکردنی مێژووی بوون و یا مردنی ناودار و هونەرمەندان بەکاردەبرێت.
**الابخر:** زار بۆگەن، دەم گەنیک.
**الابجع:** بڕوانە (أبج).
**أبد:** بێ ئەنجام، بێ پایان، هەمیشە، هەر چاخ، هەر گاث، بینا، تم، تموتم.
**أبداً:** هیچ، هیچ کاتێکی، هەر، قەت، هەرگیز، توو.
**- إلى الأبد:** هەتا هەتایە، هەتا سـەر، تا سـەر، هەمـیـشـە، جاویدان.
**ابداء:** ئاشکرا کردن، پیشاندان، دەرخستن، ڤەوارندن، ڤێقراندن، دەست پێکردن.
**الابداع:** داهێنان، هەڵبەستن، لە نوویەوە چت دروستکردن، دەرهانین، دەرهاوردن، دەرهێنان، هەڵخستن، جـوانکاری، شیرینکاری.
**الابدال:** گۆڕین، گوهازتن، گوهێراندن.
**الأبدال:** مرۆیانی خانەوادە و ڕەسەن، پیاوی خودا.
**ابد الآباد:** بڕوانە إلى الابد.
**ابد الدهر:** هەمیشە هەتا هەتا.
**الابدي:** ئەمـر، جـاویدان، پایندە، هەتاسـەر، جـاویدان بێ بەرودوایی، هەر هەبوونی.
**الابدية:** هەمیشەیی، جاویدان.
**الابراء:** پاکانەکردن، بەجێهێنان.
**الابرار:** چاکان، چاککاران، کارچاکان، خوداناسان.
**الابراز:** دەرخستن، نیـشـاندان، جـەلیـاندن، بەرهسکردن، جـەلـبـاندن، ئاشکراکـردن، هەڵقـوتاندن، دەربڕین، بەرزانی، وەرزین، هەڵڕژتن.
**الابرام:** پێداگرتن، قایمکردن، ڕکەگرتن وەسەر سووڕمان خستن.
**الابرة (ج) أبر:** دەرزی، چەنی، سۆ.
**- الابرة الثلاثية:** شرینقەی سێ لانە.

**- ثقبة الابرة:** کونی دەرزی.
**- محفظة الابرة:** دەرزیدان.
**- ابرة اللسع:** چزووی پێوەدانێ.
**ابرد:** ساردتر.
**ابرش:** سـوورسپی تێکەڵاو، جیل، خاڵێکی جیـاوازی ڕەنگی خۆی لە لەش دابێ، ڕەشکەوورگ، بازگ، ڕەشبۆرە.
**الابرص م. برصـاء:** گـول، دووزام، گـەرۆل، بەلێـوەشێن، پیسکەبازی، شلە، کەسێکی لەشی پەڵە پەڵەی سپی تێدابێ، بۆ نێرینانە.
**الابرق:** ڕەشبەڵەک، ڕەش و بارگ: ڕەش و سپی، ئەبلەق.
**ابري:** دادانی پێنووس (قەڵەم).
**الابرية:** کرێوە.
**الابريسم:** ئاوریشم، هەوریشم، ئارمووش.
**الابريق (ج) اباريق:** ئافتاوە، مەسینە، خوشدەر، (حەوت جوش) لوولێنە، لوولە هێن.
**- ابريق خزفي:** لوولێنە.
**- ابريق القهوة:** قاوەدان.
**- ابريق وصحن:** ئافتاوە و لەگەن.
**الابصار:** دیتن، بینین.
**الابط (ج) اباط:** بنهەنگڵ، بنکەوش، بنکەڵێنە، بن چنگ، بن دەس، بن باخەڵ، بنکەش، کلێشە، گەبەر.
**- تحت الابط:** کرچوو.
**الابطاء:** دواخستن، وەدرەنگ خستن، سست و خـاوکـردنەوە، درەنگ کردن.
**الابطال:** پووچکردنەوە، پووچاندنەوە، لەکارخستن.
**الابعاث:** ناردن، وەڕێ خستن، هەناردن، کل کـودن، ڕەوانەکـردن، شاندن، ڕکیاستەی، وکیاندن، شاناندن -شەهاندن، ڕکیانەی.
**الابعاج:** قویاندن.
**الابعـاد:** دوورخـسـتـنەوە، دەرکـردن، چەپاڵەدان، دەرانین، دەربەدەرکردن، سرگومکردن، قاودان.
**الابعد:** دوورتر.
**الابعد:** دوورترین.
**الابغاض:** ڕک لێ بوونەوە.
**الأبغض:** دوژمنتر.
**الابقاء:** هێشتنەوە، وەدواوادان، بەجێهێشتن، گلدانەوە.
**الأبقار:** ڕەشەوڵاخ.
**الابقع:** پەڵە پەڵە، پنگ پنگ، ڕەش بەڵەک.
**الابكاء:** گریاندن، گرەوناى.
**الابكاء:** کردنە بەیانی، بەیانی کردنەوە
**الابكم:** لاڵ، بێ زمان.
**الابل (ج) اباب:** وشتر، ئارڤانە، هەشتر، هی نێر و مێ.

- **راعي الابل:** وشترەوان.

**الابلاء:** گرفتارکردن، پێوەکردن، لە کارەساتەوەدان.

**الابلاس:** ناهومێدکردن.

**الابلاغ:** ڕاگـەیاندن، وەڵام دان، گـەیاندن، پێ زاناندن، وەڵام دانەوە.

**الابلغ:** زمان پاراوتر.

**الابلق:** بەڵەک، بازوو، ئەبڵـەک، بازگ، ئەبڵـەق، باز، بازیی، کمژ، شڵ، کاسەڵە، سوورسن، دوو ڕەنگ، پڵپڵی.

**الابلق:** سووسکە، سورەباڵە (باڵندە).

**الابله:** گێل، گـەمشۆ، چەپنگ، دیلانە، گەوج، لازودان، لاژگ، بێ مـێـشک، نەهشـێن، هەپلە گـون، بێ هۆش، هێـڕ، حـۆل، سەرچڵ دەبەنگ، هۆڕ، کەودەن ولحی.

**الابليس:** شـەیتـان، دێو، پەریرەشک، ئایـتـەر، شـیـدان- مـرگ، پەریمرگ، پەری ڕەش.

**ابناء:** دروستکردن.

**ابن (ج) ابناء:** کـوڕ، کـورک، قلووس، پز، پسـر، وەچە، بەچە، وەند، ڕۆڵە.

- **ابن الاخ:** برازا، کوڕی برا، برازایی.
- **ابن الاخت:** خوشکەزا، خوارزا، ماڵەزا، کوڕی خوشک.
- **ابن الزوج والزوجة:** زڕکوڕ.
- **ابن الخال:** خاڵۆزا، لالۆزا، کوڕی خاڵ.
- **ابن السبيل:** ڕاڕەو، ڕێڕەو.
- **ابن العم:** ئامـۆزا، پسـمـام، پزمام، هاپوزا، کوڕ ئاب، کوڕە مام.
- **ابن العمة:** پورزا، پلکزا، تیتکزا، میمکزا، کوڕی پوور.

**الابناء:** کوڕگەل، کوڕەک.

**ابن آوى:** چەقەڵ، توورگ، وادی، دووخۆر، تیروو.

- **اللغة:** هاوزمان.

**الأبنة (ج) الأبن:** مێخەکە، بزمار، گرێ.

**ابنة:** کچ، کـیـژ، دۆت، کەنێ، ترە، کناچە، کەنیشک، دوویت، دوویت.

- **ابنة الاخت:** خوشکەزا (کە کچ بێ).
- **ابنة الخال:** خاڵۆزا، (کە کچ بێ).
- **ابنة الاخ:** برازا (کە کچ بێ).
- **ابنة الزوج او الزوجة:** زڕکچ.

**ابن عرس:** مشکی دارە خورمایە، ڕاسوو،

**ابهاج:** شاد و گەش کردنەوە.

**الابهام:** قامکە گەورە، تیلا پەرانێ، کەلە بەرانکی، پەنجە کەڵە، تلیا کردی، تلیا گزێ، پەرانەک، تیلا بەرانکێ، کلکەگەورە، شەس.

مبهم: گۆنک، نەناسراو، نەزانراو، نادیار، پۆشراو.

**الابهة:** ١- فـەر، گـەورەیی، مـەزنی، شکۆ، جوانی، نرخداری، ٢- فیز، هەوا، لووت بڵندی، شانازی، مەزناهی،

**الابهل:** ڕوی کێوی.

**الابهم:** زمان گیراو، زمان بەستراو، زووان بەسە.

**أبهى:** جـوانتـر، ڕووناکـتـر، نرخـدارتر، ڕەندەتر، نەوارتر، ڕەوشەنتر.

**ابوالهـول:** ئابیـدەیەکـە لە نزیک اهرامی مـصـری، ناوی بووێژێکیشە.

**ابهمان:** هەرەس، هەسەم (تهافت الثلج من الجبل).

**ابو:** وشەیەکە دەخرێتە سەر نازناوی عەرەبی وەکو (ابو الحسين).

**ابوان، ابوين:** دایک و باوک، باب.

**ابو البراقش:** قەلەموونە، بووقەلموون، بەقلەموون.

**ابو بريص:** شەوگەرد، مارمێلکە.

**ابو البشر:** باوکی مرۆیان (ئادەم).

**ابوة:** بابەتی، بابێتی، باڤێتی.

**ابو الحسناء:** بووکە سوورە، بووکە سـوور، کە باڵندەیەکی بەرزگ سوورە.

**ابور:** زۆرخـۆر، خۆرا، چڵـێس، نان کـوژ، چڵ، چڵـەک، فرەخـۆر، تێرنەخۆر، خووارا، زاخۆران، بلامکەر.

**ابو سريع:** گووژاڵک (گیایەکی زۆر تاڵە) کاڵکە مارانە.

**ابو مليح:** جووڕە کلاونە، جووڕە پۆینە.

**الابيض(م) بيضاء:** سپی چەرموو، چەرمگ، چەرمک، چەرمی، چەرمووک، کمژ (تەنیا بۆ ماڵاتە).

- **ابيض شفاف:** دووڕی.

**آت:** هاتوو، هاتیار، (کەسێ کە بێت).

**الاتان:** ماکەر، مۆکەر، ماخەر.

- **احـتكاك نكتى الاتان وقت اللقـاح:** قـەوچە، قـەوچە قـەوچ، لەوچە لەوچ.

**الأتاحة:** ماوەدان.

- **اتاحة الفرصة:** دەرفەتدان، ماوەدان.

**أتباع:** ژێردەستان، دەستوپێوەند.

**اتباع:** وەدووکەوتن، شوێنکەوتن، وەدوواکەوتن، پەیڕەویکردن، بڕوانە (اقتفاء).

**الاتجاه:** ئاست، بەرامبەر، ڕاست، ڕووکار، ڕێباز، ڕێڕەو، ڕووەو، بەرەوئاقار، حاست، ڤەراڤەر، کەرخ، هێزا، هەناس، ئاراست.

- **الاتجاه العكس:** پشتە وێڵ.
- **اتجاه العمل:** ڕێبازی کار، ڕووی کار، ئاستی کار.
- **على اتجاه:** ڕووەو، بەرەو، بەرامبەر.
- **وحدة الاتجاه:** یەکرووی، یەکڕەنگی، یەکرایی.

**اتجاهي:** ڕێبازی.

**الاتحاد:** یەکێتی، یەکگرتن، کۆکی، هاودڵی، تەبایی هەڤاڵبەندی، هەڤدانی، هەڤدڵی، یەک دەستی، بێ هەمبەری، تەڤایی، جووتی، ڕایی یەکی.
**اتحاد الصناعات:** یەکگرتەیی پیشەسازکان.
**اتحاف:** دیاری ناردن.
**الاتخاذ:** ڕاگرتن، گرتن، گیران.
**الاترنج:** ترنج.
**الاتزان النفسي:** لەنگەری دەروونی.
**الاتزان العقلي:** لەنگەری هۆش.
**الاتساع:** فراوان، گوشار بوون.
**الأتصاف:** هەڵزان، پێ هەڵکوتران.
**الاتصال:** جووتبوون، گەیشتنە یەکتری، ڕێککەوتن، ئاشنایی، نێزیکی، نیوان، بەندیواری.
**اتعاب:** فلکردن، ماندووکردن، شەکەستکردن، کەفتکردن، لەبکاندن، قەرمەلاندن، قرهاندن، وەستاندن، ئازاردان، هەڤاندن.
**الاتعاظ:** پەند وەرگرتن.
**الاتفاق:** ڕێککەوتن، سازان، تەبایی، پێکهاتن، ڕێکبوون، یەکبوون، یەکدڵی هەڤاڵبەندی، هەڵکەفت، یەکدەسی، هەلکەوتن، پاکەوتن، یەکێتی، دەستبەندی، ڕێکی.
- **الاتفاق السري:** کەین و بەین.
- **نعم الاتفاق:** خواوڕاستان، خۆش بەختانە، خواکرد.
**الاتفاقية:** تەپانامە، پەیانامە.
**الاتقاء:** خۆپاراستن، خووەدان ئالیلێ، بەرادان، ڕیزکردن.
**اتقاد:** کلپەکردن.
- **درجة الاتقاد:** پلەی کلپەکردن.
- **متقد:** داگیرساو.
**اتقان:** شارەزایی، بەڵەدیی، کارزانی، هوشیاری، پوختکردن، کارچاکی، باشکردن، دامەزراندن، پاوەجێکردن.
- **اتقان الدرس:** وانە ڕەوانکردن.
**المتقن:** کارزان، کارناشنا، کاربێن، بەڵەد، شارەزا، ساڵوز، فێرس، جەرجهە، کارچاک، نکوول.
- **أتقن العمل:** شاکار، شاکردار.
**اتقی:** پارێزگارتر.
**اتكاء:** پاڵدانەوە، پشت پێوەدان، پشت پێوەنان، پاڵەوەدان، بەلاداهاتن.
**اتكال:** پشت پێبەستن، بروا پێهاتن.
- **الاتكال على الله:** پشت بەخودا بەستن.
**اتلاف:** لەناوبردن، لەناوچواندن، نەبووکردن، تەفروتوونا کردن، لەنێوبردن، پتیوار کردن، ڤەمهاندن، کزیر کردن، لە دەستدان.

**أتم:** تەواوتر.
- **اقام حجة:** ڕاملخستن، خستنە مل.
**اتمام:** تەواوکردن، ڕەبەڤکردن، بەسەربردن، بڕیاندنەوە، بڕینەوە، تەکووزکردن، دوایی پێهێنان، کۆتایی پێدان، بەئەنجام گەیاندن.
**اتوون:** ئاوەدان، ئاگرخان، توون.
- **اتون الحمام:** تونگخانە، کولخەن، کولخانە.
**اتهام:** بوختان پێکردن، دانەپاڵ، شڵتاخ، توانج پێکردن، خستنە ملی، گومانباری، نانەپاڵ، بەدناوبوون.
**اتي (م) آتية:** هاتوو، هاتیار، دوارۆژ دادێ.
**اتيان:** هێنان، هاوردن، هێناندن.
**اتيت به:** هێناومە.
**أثاث:** کەلوپەل، پرتووک، چمەک، شمەک.
- **الاثاث البيتية:** ناوماڵ، نێو ماڵ، بارخانی، پڕپۆڵ، نێڤماڵ، بزگوڕ، خرتوپرت، دەرودۆر، کەلەپوور، کەلوپێل.
- **اثاث البيت القديمة:** پاتاڵ.
- **اثاث المهد:** مەدبەند.
**آثار:** کەرخ، شوێنەوار، کاتەوار، کۆنینە، دێرینە، یادگار.
- **آثار الحرب:** پێوشوێنی شەڕێ.
- **آثار الكهرباء:** کارەکانی کارەبا.
- **آثار قديمة:** کەلەپووری دێرینە، شوێنەواری حەنتیکە، شوێنەواری کۆنینە.
- **مديرية الآثار القديمة:** بەڕێوەبەرایەتی پاشماوە و شوێنەوارە کۆنەکان.
**أثارة:** شۆڕشکردن، وروژاندن، فیتدان، کار تێکردن سەرێ بزواتن، هەڵساندن، هڵگافتن، هاندان، پۆپێ پساندن، لام و فەک پێکرن، آران. خرۆشاندن، زلکردن.
- **اثارة الحرب:** شەڕ بەرپاکردن، شەر هەڵایساندن.
**أثبات:** بەڵگە هێنانەوە، سوورکردنەوە، ساخکردنەوە، ڕاکراو کردن، پێ سەلماندن، پێ لەجێ ڕاگرتن، چەسپاندن، ڕوونکردنەوە، قژیلاندن، وەڕاستگێڕان.
**اثر (ج) آثار:** شوێن، نیشانە، سووسە، بافت، دەووس، کەرخ، تەزوو، پرتووک، پێوشوێن، تانی، تاو، شۆب، شوێن، فەرمایشی پێغەمبەر.
- **الاثر الحراري للتيار الكهربائي:** شوێنکا گەرمیی تەزووی کارەبا.
**أثر:** شوێن، دوایی، بەدوای، دوا، پاش.
- **أثر القدم:** پاجێ، جێپا.
**أثر يؤثر تأثيرا:** بروانە (تاثیر).
**اثر - أثر:** بەرین، پان.

**اثراء:** هەبوون، دنیاداری، ماڵداری، گردوکۆ.
**أثري:** کەڤنار، ئەنتیکە، دێرین، کۆنینە، دێری.
**أثفية (ج) اثافي:** سێ کوچکە، سێ پا، سێ پێ، دوستان، سەرناورە، کوچکەبەرد.
**اثقال:** گرانبار.
- **حامل الاثقال:** بارهەڵگر.
**أثكل:** پیاوی ڕۆڵە مردوو.
**أثل:** گەز، تەرگەز
**الثلاثاء:** سێ شەممە.
**أثلم:** کەل، کەلۆس.
- **أثلم الاسنان:** ددان کەل.
**اثم (ج) آثم:** گوناح، گوناهباری، شەرفرۆشی، گوناه، سووچ، تاوان، پیازە، سەوس.
**آثم:** گوناهبار. تاوانبار، سووچدار.
**أثيم:** گوناهبار، تاوانبار، پیازە.
**اثمار:** بەرهێنان، بەرانین، بەردان، وەبەرهاتن، هاتنەبەر.
**اثمد:** کل، سورمە.
**اثناء:** دەم، کات، هەل، چاخ، گاو، گاڤ، هنگا، لەکاتی.
**اثنا عشر، (اثني عشر):** دووازدە.
**اثنا عشرية:** ڕیخۆلە درێژە.
**اثنان واثنين:** دوو، دووێ، ددۆ. دوان.
**اثنان وثلاثون:** سی و دوو.
**الاثنين:** دووشەممە. دووشەنبە، دووشەم
- **يوم الاثنين:** ڕۆژی دووشەممە
**اثيت:** خەفە.
**اثير:** ١- بەرز. ٢- بڵند، هەڵبژاردە. ٣- ترووسکەی شییر. ٤- لە کۆندایە و وشەیە گوتراوە کە جۆلایی نێوان زەوی و ئەستێرانی پڕ کردووە. ٥- شلەیەکە کێشی نییە.
**اجاءة:** هێنان، هانین، هێناندن، هاوردن.
**الاجابة:** وەڵامدانەوە، هەرێکرن، بەلیاندن، بەرسیڤدان، وەگرتن.
**اجاج:** تاڵاو، ئاوی تاڵ، شۆراو.
**اجارة:** کرێ، جەمەک، پێمزک، بەکرێدان.
**اجازة:** دەستوور، بار، ڕێدان، دەستوور، ودم، ورمێ، خولک، ڕێدان، هێزە، پایدۆستی، پای دۆستنامە، وچان، ڕێ.
- **الاجازة الاعتيادية:** وچانی ئاسایی.
- **الاجازة الدراسية:** وچانی خوێندن.
- **منع الاجازة:** پاسدان.
**مجاز:** (بەمیمی بۆردار) دەستووردار، ڕێدراو، ودمدار.
**اجاص:** هەڵووچە، هەڵووژە، کارچڤ، کارچک، گاشکە.
**اجاص الاسود:** هەڵووچەرەشە هەڵووژەرەشکە، گاوبار.

**اجانة:** تەشت، سووێنە.
**اجبار:** ڕوو لێکردن، بێگار پێکردن، ناچارکردن، سەپاندن، بەسەردا- سەپاندن، زۆرەملێ، زۆرەکی، زۆربگیر.
**اجباري:** زۆرەکی، زۆربایی.
- **التجنيد الاجباري:** قاف کردن.
**اجتباء:** خڕکردنەوە، کۆکردنەوە، ورووژاندن، هەڵبژاردن، ڤەهەواندن، زجیف کرن، ڤەیدان.
**اجتذاب:** کشان، ڕاکشان، کشران، کێشەمان، کێشان.
**اجتراء:** زاتکردن، وێران.
**اجترار:** کاوێژ کردن، کاوینەوە، کایێن، پۆرساندن.
**اجتلاب:** کشران، کێشران، کێشان.
**اجتماع:** کۆبوونەوە، گردەوەبوون، مرۆشیان، گردبوونەوە، مۆڵ بوون، هەڤجڤان، سلسات، هوومێن، وێککەوتن، پەرگەهان جڤین، جڤان، خڕبوونەوە.
- **اجتماع الضدين:** کۆسەوریش.
- **اجتماع المواشي في المآوي وقت الظهر:** مۆڵ بوونەوە.
**اجتماعي:** کۆمەڵی، بەرگهایی، جڤانی، کۆمەڵایەتی.
- **الشؤون الاجتماعي:** کاروباری کۆمەڵایەتی.
- **العدالة الاجتماعية:** دادی کۆمەڵایەتی.
- **مديرية الشؤون الاجتماعية:** بەڕێوەبەرایەتی کاروباری کۆمەڵایەتی.
**اجتناء:** خڕکردنەوە، کۆکردنەوە، میوە چنین، چنینەوە.
**اجتناب:** دووری کردن، لادان، تەوەسان، تەکینەوە، خۆپارازتن، خۆدوورخستنەوە، پارێزکردن، خۆدوورگرتن.
**اجتهاد:** تێکۆشین، هەوڵدان، کۆشەوەکردن، لۆڤەکردن، تەقەلادان، ڤەپچاندن، خەفتان، خەباتکردن، خەبتێن، کۆشێن، ولایێن، خەبتان، خەفتیان، ڤەپچیێن، کۆشان.
**اجتياز:** ڕابردن، تێپەڕین، ڕەتبوون، ویاران، تێکشان، تەورین، تێپەڕبوون، ڕەوان بوو.
**اجحاف:** زۆر بێ دادی کردن، پێ لەبەر تێپەڕاندن.
**اجداد:** باب و باپیر.
**اجدع:** گوورەی براو، لووت براو.
**اجذم:** گول، دووزام، پیسک بەلوەشێن، گەر، یەکدەس، دەستبراو.
**اجر:** اجور، خشت.
**أجر (ج) اجور:** خێر، دفنان، تۆڵەی چاکە، پاداش.
**اجراء:** بەجێهێنان، جێبەجێکردن، ڕاییکردن، گەڕاندن، پێکهێنان، ئەنجامدان.
- **لاجراء اللازم:** بۆ جێبەجێکردنی پێویست.
- **لاجراء القياس:** پێوان، ئەندازە گرتن.

**اجرار:** کاوێژکردن، کاوینەوە، پۆرساندن.

**اجرام:** بڕوانە (جرم).

**اجرام سماوي:** ئەستێرەکان.

**اجرب:** گەر، لەشگەر، گروو، گرۆ، گوری، پێشکی.

**اجرة:** کری، مز، جەمەک، پێمزک، مزە.

– **اجرة الحمولة:** کرێبار.

– **اجرة العمل:** کارانە، کرێی کار، دەستکرێ.

– **اجرة الاعمال اليدوية:** دەسکر، دەسکرد، کرێ دەست.

– **العمل بالاجرة:** کرێکاری.

– **اجرة الماء:** ئاوانە، کرێی ئاو.

– **اجرة الكهرباء:** کرێی کارەبا.

– **اجرة يومية:** ڕۆژانە.

**اجرس:** زیت، ڕزت.

**اجزاء:** بڕوانە جزء.

**الاجسام المضادة:** دژە لەش.

**اجفال:** ڕەوینەوە، ڕەوانەوە.

**آجل:** داهاتوو، هێزێک لەمەوپێش.

**اجل:** هۆ، بۆ، لۆ، ئەرای بۆ، پەری، لە پێناوی، ژ بۆ.

– **لأجل:** لەبۆ، لۆ، لەبەر، سەبارەت، بەهۆی.

– **لاجلك:** بۆتۆ، لۆتۆ، تەرا، ژبۆ.

**الاجل:** ملە خرە، گەرووەخرە، خرە.

**أجل (ج) اجال:** مەرگ، ئاکام، دواگیان، وادە دوایینی ڕۆژگاری ژیان، ئەنجامی ژیان، مەودا، مۆڵەت.

– **الاجل الاخير:** دوا مەودا.

**أجل:** ١– بەڵێ، ئارێ، ئا، ئەری، لەبێ، با، هانەری، ئەدی، ئەددی، ئەی ئەی، ئەبێ. ٢– گەورەتر.

**اجلاء:** لە ماڵ و نیشتمان دوور کەوتنەوە.

**اجلاس:** دانیشاندن، نیشاندن.

**اجلس:** دانیشە، بنیشە، ڕۆنێ.

**اجلاف:** ئەلۆ جەلۆ، هەرزەو خوێڕیان

**اجلال:** بەشانوشکۆیی، ڕێز و قەدرگرتن.

**أجم:** مێشە، بێشە، دارستان، جەنگەڵ.

– **حيوان الاجم:** کۆڵ، بێ شاخ (بۆ نێرانە).

**اجماد:** بەستن.

**اجماع:** هەڤچاندن، بەدۆستی گەل کارکردن، ڕێڵجاری ١– کۆمەک گرتن، کۆمەک بەستن، هێوراندن. ٢– بەرهەڤبوون، کۆبونەوە، خڕکردنەوە.

**اجمال:** کورتکردنەوە، قوڵەکردنەوە، سەردەوس، کورتکردن.

**اجمة (ج) آجام:** قامیشەلان، تەڵ، بێشە، دارستان.

**اجمل، الاجمل:** جوانتر، جوانترین

**اجنبي (ج) اجانب:** بێگانە، بیانی، هاڤی، وەدەر، کەڵتەوەن، ئاوارە، تاجیک، نەناس، نەناسراو.

**اجهاء:** ڕەواندنەوەی هەور و چتی تر.

**اجهاد:** ئەرک کێشان.

**اجهار:** ئاشکرا کردن، دەنگ هەڵهێنان

**اجهاش:** قڵپەی ئاوێ، قڵپەی گریانی، ئیسک، ئیسکۆتک.

**الاجهاض:** لەبەر چوون، بەرهاوێژتن، دوور خستنەوە، لەبارچون، بەرخستن، لەباربردن.

**الاجهر:** ڕۆژکوێر، کەسێکە بەرۆژ چاوی نەبینێ.

**الاجهرة:** مشتوکوشت، (گەمەیەکە).

**اجهزة:** ئامراز.

**اجهزة اطفاء الحريق:** دەزگای ئاگر کوژێنەوە.

**اجوس:** زرت، چاوزبیت.

**اجوف:** پووتەڵ، پووچ، بەتاڵ، هولۆڵ، نێوبەتاڵ.

**اجوي:** ڕەشتاڵە.

**أجير (ج) اجراء:** کرێگرتە، پالە، ڕەنجبەر، ڕێنجبەر، کرێکار، نۆکەر، ڕەنجدەر، مزوور، مزەوور مزبەر، مزەبەر.

**الآح:** سپێنەی هێلکە.

**احاد:** یەکان، یەکەکان، یەکەیەکە، یەکیەک، یەکیەکە، لە ڕاوێژی ئەژمێرێدا، دەستەی بەرایی لە (١) تا (٩). احادی پێ دەڵێن

– **احادي العدد:** یەکانی ژمارە.

– **السكر الاحادي:** تاکە شەکرە.

**احاطة:** هەوشەدان، گرتنەبەر، دەورەگرتن، گرتنەناو، داگرتن، دەورەدان، دانەبنار، گەرگرتن، زانین، ئاخڵەدان، تەنوورەدان، تەوەنەدان.

**احالة:** گێران، هەواڵە کردن.

**احباء:** دۆست و برادەران.

**احبار:** زانایان، کۆچکانی ئایینی.

**احبال:** زگ پڕبوون.

**احبولة:** داو، داڤ.

**احتباس:** گیران، ڕاگیراوکران، چوونە گرتووخانە.

**احتباس البول:** لە (بول)دا بیدۆزەوە.

**احتجاب:** پەناگرتن، چوونە ژێر پەردەوە، پەناگیری، ڕووگرتن، پەنهان بردە.

**احتجاج:** لێ گرتن، تۆران، ڕق بوونەوە، بێزاری، بەدەستە لێ هەڵستان.

**احتجام:** خوێن بەردان، خوێنی خۆ گرتن.

**احتدام:** بڕوانە (اضطرام).

**احتراز:** پارێزگاری: خۆپاراستن، پارێز کردن، دووری کردن.

**محترز:** پارێزکار.
**احتراس:** دیدەوانی، پاسەوانی کردن، کێشکچیەتی، پارازک کردن، کێشکڤانی کرن، خۆپارازی.
**احتراف:** بوونە خاوەن پیشە.
**احتراق:** سووتان، گڕگرتن، سۆتەی، سۆتن، سوچیای، سۆزان، سووتن، سووتیان، شەوتان، شەوتین، سووزیان، سزیان، سۆهتن، پرووزیان، چزیان، سۆزیان، داپلۆخان.
- **احتراق ذاتي:** سووتانی خۆیی.
- **احتراق فم المعدة:** دڵە کزێ.
- **احتراق القلب:** دڵسووتان.
- **صوت احتراق الخشب:** لزمە.
- **الاحتراق الداخلي:** سووتانی ناوەکی.
- **سريع الاحتراق:** خۆش سووت.
- **صوت احتراق الوقود وغيره:** کێسک، لرفە.
**احترام:** ڕێزگرتن، قەدر و ئووداگرتن. ڕووگرتن، خەماندن، دکراندن بەراییکردن، بەز، ڕێز، سەنگینی، گرانی، سەلاری.
**احتساب:** بژاردن، کونگردن، بژاردران، بەشبوون، تێڕایی.
**احتشام:** بوونە خاوەن نۆکەر و شکۆبوون، بەشکۆیی.
- **عدم احتشام:** هەرزان، بێ ڕێزانە.
**احتضار:** گیاندان، گیانەڵڵا، گیانکەنیشت، ناوزینگدان، بەلادا هاتن، دوا گیان، هەوزینگدان، دەمی سەرەمەرگ. گیاندان (ئامادەبوون)، (چەنەگە هەڵتەکاندن).
**احتضان:** لەباوەشگرتن.
- **احتضان الدجاجة:** کورک بوون، کڕ کەفتن.
**احتفاظ:** پارێز گاری، هەڵگرتن، پارێزران.
**احتفال:** ئاهەنگ، کۆبوونەوە، کۆمەگ، بەستن، جڤات بەستن، زیوە کردن، ڕەبسین، زێوە گرتن.
**احتفال بجنازة:** چەمەربەستن، شینوشەپۆڕ، شیوەن کردن، چەمەبەر.
**احتقاب:** هاوپشتی، دووپشتەکی.
**احتقار:** بەچاوی سووک تەماشا کران، سووک و کەنەفت بوون، بەگچکە و سووک تەماشاکران.
**احتقان:** خوێن تێزان، پەنران، تێزان، شاف، حوقنە لە خۆدان.
- **احتقان من الجلد وتورمها على شكل عقد:** لیر، لر، لرگ.
**احتكار:** ماڵگرتن، شتومەک بۆ گرانی هەڵگرتن، نۆتە نۆتە کردن، یەکپەلی، قۆرخ، کشف.
**احتكاك:** لێخشان، لێکخشان، سووان، هەڵگیران، لێخشاندن.
**احتكاك الجلد:** سیرە.
**احتلال:** داگیرکراو، داگیراو، زەوتکراو تێرژان، دەست بەسەرداگرتن، ڤەگرتن، داگیرکردنی وڵات و وڵاتگرتن.

- **احتلال عسكري:** سوپا گیری.
**احتلام:** خەون دیتن، لە خەوندا ئاو هاتنەوە.
**احتماء:** پارێزگاری، خۆ دوورخستنەوە.
**احتمال:** وێچوون، لاوابوون، پێ وابوون، بارهەڵگرتن.
**احتواء:** داگرتن، دەورەگرتن، تێدابوون، کۆکردنەوە، داگیرکردن، کۆبوونەوە، لەناوخۆگرتن.
**احتياج:** نیاز، نیازمەندی، کێماسی، دەسکورتی، ئاتاجی، کەماسایی پێداوستی، ئاوسەرکەمی، ژاری، هەژاری، بارچەوتی، پێویستی، نەداری، خزان، داماوی.
**احتياط:** یەدە، یەدەک، یەدەگ، دەژ، یەدەگ، نوستوو، پێشبینی تێبینی، دووربین، پارێزگارکردن، بەتەگبیر و پارێزگاری کردن.
- **احتياط عسكري:** پاڵگە و پشتیوانی لەشکری، پاڵگەی سوپایی، پشتیوانی سوپایی.
- **ذو احتياط:** دوورە پارێز.
- **عدم احتياط:** ناپارێزی.
- **المحتاط:** چەگناس، پێش بین، دووربین.
**احتياطي:** سپێر، بێ عەرد، دژە.
**احتيال:** فێڵکردن، تەفرەدان، لەخشتەبردن، فێڵبازی، تەڵەکەبازی، دەبیە کردن، شووین گۆمەکێ.
**احجار كريمة، احجار ثمينة:** بەردانی نرخدار وەکو ئەڵماس و ئیتر.
**احجية:** مەتەڵ، مەتەڵۆک، مامک، قەوسەڵە، تشتانۆک.
**احد:** کەس، هیچ کەس.
**احد (ج) آحاد:** یەک، تاق، تاک، یەی، یەک، ئێک.
- **يوم الاحد:** ڕۆژی یەکشەممە.
- **احد الاحدين:** هەڵکەوتوو، بلیمەت، یەکێ، کەسێ.
**احداً:** هیچ کەس، کەس.
- **لم أرى احداً:** کەسم نەدیت.
- **لا احد:** هیچ کەس، توو، تووکەس.
**احادي:** تەوەر.
**الاحد:** یەکشەممە، کیپراکی.
**احدب (ج) الحدباء:** کۆف، چەماوە، کۆم، کووڕ، کۆماوە و پشت خوار، پشت دەرپەڕیو و پشت کووڕ.
**احداث:** قەوماندن، قچاندن، بەرپاکردن، پەیداکردن، دەرهاوردن، هەڵخستن، خانووبەرە داهێنان، وەدەرهاوردن، داهاوردن.
**احداث الافقي:** دوری بۆ.
**الاحداثيات:** دوری تانوپۆ.
**احداث الفتنة:** گێچەڵ هەڵاییساندن.
**احد عشر:** یازدە.
**احدوثة:** وەڵامی تازە.

**احدی:** یەک بۆ مێیینانە.
**احدیة:** یەگانەگی، یەکێتی، یەکتایی.
**احری:** باشتر، لێوەشاوەوەتر.
**- بالاحری:** باشترین، بەلێوەشانەوەتر.
**احراج:** دەغەڵی.
**احـــراز:** پارازتـن، پارێزاندن، چنـاندن، بابـێن، چەپاڵـەدان، دەسکەوتن.
**احراش:** گژوگیا، مێشە، دەوەن، لێر، لێرەوار، جەنگەڵ.
**الاحراق:** سـووتاندن، ئاور تێبـەردان، چزاندن، چزە لێـوەهاتن، ئاگردان، شەوتاندن، کەماندن، کزانەوە، سووتانن.
**- احراق القلب:** بڕوانە (شفقه).
**احراقیة:** سووتەمەنی، ئاوردوو، ئاردوو، ئاگردوو.
**احرام:** ١- نارەواکردن. ٢- چوونە ئاوداب و دەستووری حەجەوە.
**احساء:** دەرخواردەدان.
**احـــساس:** هەســـتکردن، زانین، دلـێن، دیتن، دەســتکەوتـن، دونگەکردن، هەست و خۆش ویستن.
**- ذو احساس:** هەستدار.
**- عدم احساس:** گێل، دەبەنگ.
**- احـساس القلب:** بەدڵداهاتن، دڵ گـەواییـدان، تێـر دلێن، دڵ لێدان.
**- الاحساس بالجمیل:** پێزانین.
**- الاحساس الکیمیاوی:** کیمیکە هەست، هەست کیمیایی.
**احسان:** خێر و چاکەکردن، بەخشین، جوامێریێ، ڕەندی، چاکە، چاکی، چاکێتی.
**احسن:** باشتر، نەشپ، چاتر، چاکتر، قەنجتر، جوانتر.
**الاحسن:** چاترین، باشترین، خاسترین، قنجترین، جوانترین.
**احسن الاعمال:** شاکار.
**احسنت:** ئافەرین، بەهبەهـ، چاکت کرد، لە منت کەوێ.
**احشاء:** زیر ڤچک، ورگ ڕیێ، هەناو ئێـوزگ، گیـپاڵ، ناوزگ، هەناث، هورگ.
**العضلة الاحشائیة:** هەناوە ماسولکەیی.
**احـصـــاء:** ئـەژمـــاردن، بژاردن، ئامـــار، هەڵبـــژاردن، ژێر کـــۆ، سەرژماردن.
**احصاء النفوس:** سەر ژمێر، سەرژمارە، سەرنووس.
**احصان:** تێکەڵاو کردن، ژن لێک هێنان.
**احصان:** قایمکردن، پارێزگاری.
**احضار:** ئامـادەکردن، سـازکردن، دروسـتی خـۆکردن، چەکـاندن، تەدارەک کـردن، بەردەست کـردن، ســازدان، هێـنان، هانـێن، هاوردن، هێناندن.
**الاحضار مجدداً:** ئامادەکردنەوە، هێنانەوە.
**احضاریة:** ئامادە نامە.
**احطاب:** زەنگە.
**احفاد:** نەوان، کوڕەزایان، نەڤی، چیرک.
**احق:** شانتر.
**احقاب:** ساڵانی درێژ یەک لە دوای یەکتری.
**احقاد:** ڕق هەڵساندن.
**احقاق:** گەرەککردن، داوای مافکردن.
**احقر:** پەستر، گچکەتر.
**احکاك:** لێخستن.
**احکام:** ڤەبرین، قایمکردن، دامەزراندن، پاوەجێکردن.
**احکام:** بڕوانە حکم.
**احلاء:** شیـرینکردن.
**احلاف:** سووێنەدان.
**احلال:** ڕەواکردن، ڕەوادیتن.
**احلام:** ئاشووپ، پاشوو، (خەونانی پەشێو و ئاڵۆزان).
**احلی:** شیرینتر، جوانتر.
**احلیل (ج) احالیل:** جوو، چووک، سیرەت، شوێنی میزپێدا کردن لە لەشی مرۆڤدا. ٢- شوێنی شیر لێ هاتن لە مەمک دا.
**احماء:** داخستن.
**احماض:** ترشکردن.
**احمال:** بارخانە.
**احمال واثقال:** بارخانە، گرانبار، باروبارخانە: باروبنە.
**احمد:** پێ هەڵکوتراو، هەڵنراو، زۆر هەڵنراو.
**احمر(م) حمراء:** سوور، سۆر، گوڵیی.
**احمر غامق:** سووری تۆخ، سووری تێر.
**احـمر فـاتح:** ئاڵ، ســووری کـراوە، ســوورێکی گـەش، پیــوازی، پیکازی.
**احمر اللون:** سوورخون.
**احمرار:** سوور هەڵگەڕان، سووربوونەوە.
**- درجة الاحمرار:** پلەی سووربوونەوە.
**احمض:** ترشتر.
**احمق (م) حمقاء:** گێل، گەوج، قەهێکەر، حۆل، هەریی هەرێ، بێ مـێـشـک، نەزان، کـەر کـەرە، پاڵە، نەشکەفـتـە، بودەڵ، تۆلاز، خرپۆ، ڕێژگاڵ، ڕێژگاو، ڕەوتەڵە، کەرکوتێن، کەرکەدان، زەرزیب، بێ کـەڵک، گـەلحـۆ، نەزانکار، لەگـام، نەهشێن، کەمهۆس، زەرزیپ.
**- کالاحمق:** گەوجانە.
**احنة (ج) احن:** قین، ڕق، ڕک، پشم، پرووشە، دەخەز، کەڕب.
**احنف:** گێر، چەوێل.
**احنی:** کۆم، کووڕ.

**حور:** چاوجوان، چاومامزی، چاورەش.

**حوال:** بروانە حاڵ.

**حوط:** نزیکتر، دووربین، قایمتر.

**حول (م) حولاء:** خێل، چاو لەهەوا، قیچر، چەمچک، کاش، چ‌ڤشاش، چاولار، چاڤ هاول، تیل، قیچ، خوێل.

**حول العین:** خێلی.

**حول العین الیسری:** چەپ خێل.

**حوی:** رەش، سیا، سیاون.

**حیاء:** زیندەوار، زیندەوەر، زیندوو، زیندی.

- **أحیاء الراقیة:** زیندەوەرە بەرزەکان.
- **الاحیاء الدقیقة:** زیندەوەرە وردەکان.
- **الاحیاء المجهریة:** وردە زیندەوەر.

**احیاء:** زیندووکردنەوە، بووژاندنەوە، گیان وەبەرهێنانەوە، ڤەژاندن، پەرنساندن، ڤژاندن، ژیاندن، ژیاندنەوە.

- **احیاء الذکری:** بیرەوەری زیندوو کردنەوە.
- **احیاء الفتنة:** گێچەڵ هەڵایساندنەوە.

**حیان (حین):** گەلێ.

**حیاناً:** جار جارە، بەین بێن، جارناجارێ، جاروبار، گاگا، نێو نێوە، تاوتاوە، ناوناوە، هاوورهاوور، بێن بێنە، بەهەڵکەوت.

**حیف م. حیفاء:** زەوییەکە بارانی نەگاتێ.

**حیل:** فێڵبازتر.

**آخ:** ئاخ، داخ، داد.

**أخ (ج) اخوة، اخوان:** برا، برادەر، هاواڵ.

- **أخ الزوج:** شووبرا، هێوەرتی، ژنبرا.
- **أخ الزوجة:** ژنبرا، بوورا.
- **أخ في الرضاعة:** برای شیری، شیربرا.
- **أخ الصهر:** برازاوا.
- **أخ من احد الابوین:** زڕبرا.
- **أخ الاب:** براباب، براباڤ، باڤبرا.
- **أخ الکبیر:** کاک، کاکە، کا، کەک، کەیان، کەیۆ، کەیین، کریف، براگەورە.

**أخ:** نیخە، ییخ، ییخە.

**اخاء:** برایەتی، برادەرایەتی.

**أخافة:** ترساندن.

**أخماء:** دامرکاندن، رامکردن، داکاساندن.

**أخبار:** دەنگوباس، هەواڵ.

**اخبار:** ئاگادارکردن، پێراگەیاندن، وەلامدان، پێ زاناندن، وانەزانین، دەنگ کردن، راگەیاندن، ڤراندن.

**أخبث:** پیستر.

**اخبوط:** جانەوەرێکی دەریاییە چەنگاڵی بڵندی هەیە.

**اخت (ج) اخوات:** خوشک، واڵە، خوچکە، خووەهر، خوار، واڵێ، خێشک.

- **اخت الزوج:** دش، بالتوور، شووخوشک.
- **اخت الزوجة:** ژن خوشک، گۆرم، خوشکی ژنێ.
- **الاخت من الرضاعة:** خوشکی شیری، شیر خوشک.
- **اخت الکبری، اخت الکبیرة:** دێت، تات، تاتە، تاتک، خۆنک
- **اخت من احد الوالدین:** زڕ خوشک.

**الاختباء:** خۆشاردنەوە، خۆڤەشارن.

**اختبار:** تاقیکردنەوە، بەراوەرد، شارەزایی.

- **انبوبة الاختبار:** بۆری تاقیکردنەوە.

**اختبوط:** جلە.

**اختتام:** براندنەوە، کۆتاکردن، کۆتایی هاتن، بەدوا لێ گەیاندن، بردنەسەر، برینەوە، دوایی پێ پێدان، سەرهاتن، بەرچوون، مۆرکران، تەواوبوون.

**اختتان:** خەتەنەکران.

**اختراع:** داهێنان، رەخساندن، هەڵبەستن، نقاری، بەردەباری، دەرهێنان، لە نووژەنەوە دروستکردن، داهاووردن، هەڵنان، ناڤەریدکردن، مژدانەدەر.

**اختراق:** رێگا کردنەوە، دڕ پێدان، شەق کردن، برین، پێداچوون، دڕان، پارچەبوون.

**اختزام:** برین، لەبن دەرهێنان.

**اختزال:** لێکردنەوە، کەمکردنەوە.

**اختصار:** کورتکردنەوە، کۆتاکردن، کوتە برینەوە، سەردەوس، رێ برین، سەرپۆرت، ڤولە کردنەوە، کۆتابوون، کۆتاکردن.

- **باختصار:** بەکورتی.

**اختصاص:** پسپۆری، پسپۆڕیتی لەمەربوون، رەچەڵەکناسی، رەگەزناسی.

**اختصاصی:** پسپۆڕ.

**اختصام:** دوژمنایەتی کردن، دژی یەکتری بوون.

**اختطاف:** رفاندن، فراندن، رفێنران، فرێنران.

**اختفاء:** خۆشاردنەوە، پەنهان بوون، پەناگرتن، بەرزەکرن، خۆدزینەوە، شارەرانەوە، شاریان.

**مختفي:** بزر، گوم، ون، بەرزە، شاردراوە.

**اختلاج:** پلدان، پڵدان، هەڵتەکان، لەرزین و پلدانی لەش، دەمار لێدان، پەرین.

**اختلاس:** دەست پیسی، دزین، چت بەدزی شاردنەوە، خۆنابووتکردن، رفاندن، دزی، دزێتی.

**اختلاط:** تێکەڵی، تێکەڵاوی.

**اختلاف:** ناتەبایی، ناکۆکی، نارێکی، جیاوازی، لنجی، بەژکی، بێ سەروبەری، نالەباری، جوودایی، کەشمەکەش، کەشماش، گێرە و کێشە، نایەکسانی، جودایەزی.

**اختلاف:** ساختە.

**اختلال:** پشێوی، شێواوی، ئاڵۆزی، خەسجر، ئاژاوەیی، نیگەرانی، ئاژاوەڵە، شپرێوی، سەخڵەیی، شپرزەیی، زلەقیان، بەرباد.

**اختناق:** خەفەبوون، خنکان، خەندکێین، گەرووگیران، خەتسین.

**اختیار:** سەرشتە، هەڵبژاردن، پێسیر. هەڵکێشاندن، سەر رشتەداری، پەسندکردن، ئارەزوو، دەستەڵاتداری، توانایی، دەستەڵات.

**اختیال:** قوودەیی.

**اخشم:** کەسێکە کەپۆی پان و ئەستوور بێ و یا بۆن نەکات، کەپۆ ڤلچ.

**اخداع:** بروانە (اغفال)

**اخدر:** شەوی تاریک.

**اخدع:** فریوبازتر.

**الاخدري:** کەرە کێوی.

**اخدود (ج) اخادید:** چاڵ درێژدووکە، شووێن لێدانی لەش بەقامچی.

**الاخدود:** گۆل، قەڵەشتی زەوی، کەندر.

- **اخدود طولي:** درێژە کەندەک.
- **اخدود العرض:** پانە کەندەک.

**اخذ:** وەرگر، وەرگیر.

- **اخذ الدم:** خوێن وەرگر.

**اخذ:** وەرگرتن، گرتن، گرتنەوە، گیردان، بردن، بەردەی، سەندن، سەنن.

- **اخذ الضريبة:** باج ئاستاندن، باج وەرگرتن.
- **الاخذ غصباً:** ستاندن، ئەستاندن.
- **اخذ الاستمرارية:** بین گرتن.
- **أخذ الشيء بشدة من شخص آخر فجأة:** راپسکاندن.
- **اخذ وسلب:** گیرادار.

**أخر:** دواخستن، گلدانەوە.

**آخر (ج) اواخر:** دوایی، ئەنجام، دەمایی، پاشین، پایان، بنەبان.

**آخر (ج) آخرون:** ئیدی، ئیتر، ئیکە، دیتر، تیریکە، دوایی، دوادانە، تر، دی، کە، پاش، پایان، دیی، پاومان، پاشین، دوایین، دوامیین.

- **آخر الامر:** لە ئەنجامدا، سەر ئەنجام، دوایی کار.
- **آخر انتاج:** پاشەرۆک، دوابەر، پاشەنەر.

**الآخر:** ئەوی دی، ئەویتر، تر، دن، دواترین، یەکیتر، ئیتر، ئیدی.

**الاخرى:** ئەوی دی، ئەویتر، تر، دن، دواترین، یەکیتر، ئیتر، ئیدی.

**اخراب:** وێرانکردن، کاولکردن.

**اخراج:** راونان، دەرکردن، دەرهێنان، قاودان، دەربەڕاندن، پاسدان، وەدەرنان، کێشانەوە، لێدان، دواندن، رادان، ڤەوتاندن، جەلباندن، درانین، دووا، وێژتن، دەرچواندن، وەدەرخستن، دەردان، دەرکێشان، دوورهانین، دوورهاوردن، کرندەر.

- **اخراج تمثيل:** دەرهێنان.
- **اخراج كمركي:** وەدەرهاویژتن.

**اخراجات:** دەرکرد.

**اخرب:** خراپتر، وێرانتر.

**الاخرة:** پەسلان، رۆژی هەرەدوایی.

- **يوم الاخرة:** رۆژی دوایی.

**آخر حد:** تا- هەتا.

**آخرين:** بروانە(ساترین).

**اخرس (ج) خرساء:** لاڵ، بێ زمان.

- **اخرس الله لسانه:** لالایی گاتێ.

**اخرم:** کەسێکە کەپۆی کونکرابێ، لە زاراوەی عەروضیدا هەڵبەستێکە کە لەوانە بێ دەستی تێوەردرێ.

**اخرى:** ئیدی، ئیتر، ئیکە، کە، ئیدیکە، دن، دیتر.

- **مرة أخرى:** هەم جارێکی تریش.

**اخروي:** پەسلانی.

**اخرق:** کەمهۆش.

**أخس:** زەبوون و هیچو پووچتر.

**اخسار:** دۆڕاندن، لەدەست چوون.

**اخشاء:** زیق.

**اخشم:** کەسێکە کەپۆی گەورەبێ یا هەستی بۆنکردنی نەبێ، کەپۆفش.

**اخصاء:** خەساندن، ئیختەکردن.

**اخصائي:** پسپۆڕ. رەچەڵەکناس، رەگەزناس.

**اخصاب:** لێگرتن، پیتێن.

**اخضاع:** سەر پێ شۆڕکردن، سەرویێ نزم کردن، بەردەست کردن، رامکردن، سەر پێ دانەواندن، سەر پێ چەماندنەوە، پێ دانەواندن، هێنانەبەر.

**اخضر (ج) خضراء:** سەوز، کەسک.

**اخطاء:** سووچ و تاوانکردن، سوچباربوون، سووچباری، پیازە، بەزە، سەردوس کردن، بەرزەکردن.

**اخطار:** پێراگەیاندن، پێزاناندن، ئاگادارکردن، لبەرکەتن، تەریرکردن، راگەیاندن، هاکردن، ئاگادارکردن.

- **الاخطار النهائي:** دوواراگەیاندن.
- **اخطارية:** ئاگانامە، یادنامە.

**اخطبوط:** بروانه (اخبوط).
**اخفاء:** شاردنەوە، حاشاردان، ڤەشارتن، ڤەشارن، وەشاردن، پەنهانکردن نەدیوکردن، باندان، بزرکردن گومکردن، تاقەت کردن، وەشاردنەوە، هونداکرن، هویلاتن، زێرەوکردن.
**اخفاف:** سووکبار بوون، سووکبوون.
**اخفاق:** بەزین، بەزان.
**اخفش:** ژێر کەوتن، چاوبچووک، شەو کتوکوێر، چاو بێهێز، ناوی یەکێکیش بووە لە زانا گەورەکان، زانیاری (نحو).
**اخفض:** نزمتر، نەویتر.
**اخفی:** پەنهانتر.
**اخلاء:** چۆڵکردن، بەتەنهایی دانیشتن. گۆشەگیری.
**اخلاص:** دڵپاکی، یەکڕوویی، کار ڕاست، دڵ پاککردنەوە، دڵسۆزی و پاک و خاوێن کردنەوەی دۆستایەتی، جەرگسۆز، جگەرسۆزی.
**اخلاصیة:** تاسواس.
**اخلاط:** چتانی تێکەڵ و پێکەڵ (لە پێشدا بەخوێن و زەرداو و سەرداو و بەلغەمیان) گوتووە.
- **اخلاط اربعة:** پیشوونیان مەبە ستیان لە خوێن، سەفراسەودا، بەلغەم)بووە
**اخلاف:** جێ گیپران، جێ نیشینان.
**اخلاف:** بەپەیمان ڕەفتار نەکردن، بەپێچەوانەی بەڵێن جوولانەوە و ڕەفتارکردن.
**اخلاق:** ڕەوشت، خوو، لە(خلق)دا بیدۆزەوە.
- **اخلاق حسنة:** خۆشخوویی، هیچاکی، هێمن.
- **ذو اخلاق حسنة:** مەند.
- **اخلاق سیئة:** بەدخوویی، بەدتووزمی.
- **سيء الاخلاق:** بلح، بەدخوو، بلحەڕوو، نەڤاچل.
**اخلال:** زیان و گەندی گەیاندن.
**مخل:** زیانەر.
**اخلص:** دڵپاکتر، خاوێنتر.
**أخلف:** چەپە، چۆپە، ختێل، گێل.
**اخماد:** دامراندن، کوژاندنەوە، خەفەکردن، ڕۆنەفتادن.
**اخمص القدم:** قوولایی پێ، لواسری پێ، دڵی پێ، چالاتی پێ، لەپان.
**اخن:** منگن، خمخم.
**اخناق:** خنکاندن.
**أخْنس:** کەسێکە کەپۆی ڕۆچووبی و سەری کەپۆی قیت بووبێتەوە.
**اخوان:** برایان، برادەران.
**أخوة:** برایەتی، برادەرایەتی، دۆستایەتی، هاوەڵایەتی، برایی.

**اخوص (ج) خوصاء:** چاولە قووڵ ڕۆچوو، بای گەرم
**اخوف:** سامناکتر.
**اخوي:** برایانە، ئاوالانە، دۆستانە، برایەتی، برایی.
**اخیار:** چاک کارزان، هەڵبژێردراوان.
**اخیر (ج) آخرون:** دوایی، پاشینی، پایان، دووماهکی، پادمان، پاشت، نی هەرە دوایی، دوادانە.
**الاخیر:** پاشترین، دواترین، پاشینە.
- **بالآخیر:** لە ئەنجامدا، دوامین، هەرە دوایی.
- **الی الاخیر:** هەتا سەر.
**اخیراً:** لە کۆتاییدا، لە دواییدا، لە ئەنجامدا، پاشکێ، دواجار، لە دوایە، لە پاشان.
**الاخیر:** هەرە دوامین، هەرە دوایین.
**اخیف:** کەسێکە چاوێکی ڕەش و ئەوی تری شین بێ.
**اداء:** پێکهێنان، بەجێگەیاندن، قەرزدانەوە، جێهێنان.
- **اداء الدین:** قەرزدانەوە.
**آداب:** ڕێوشوێن.
**أداة (ج) ادوات:** مراز، ئامراز، ئەمراز، ئامێر، دەزگا، دیش، ئاوراز، پیت، پەل.
**الادوات:** کەلوپەل.
- **اداة الاندهاش والتعجب:** ئامرازی سەرسوڕمان.
- **اداة انکاري:** حەو، تەو.
- **اداة التعریف:** ئامرازی ناسیاوی، ئامرازی ئاشنایی، ئامرازی شوناس.
- **اداة التعریف المعین:** ئامرازی ناسیاوی، ئاشکرا.
- **اداة تعریف غیر معین:** ئامرازی شوناسی ئاشکرانەکەر.
- **اداة التعلیق:** ئامرازی پەیوەندی.
- **اداة التمني:** ئامرازی ئاوات.
- **اداة التنکیر:** ئامرازی ئاشنایی، ئامرازی نەناسراو.
- **اداة الجر:** ئامرازی پەیوەندی.
- **اداة الربط:** ئامرازی پێ بەستن (اداة العطف).
- **اداة الطرب:** لۆخا.
- **اداة الرجولیة:** چوو، چووک، ڤەمیش (کێر).
- **اداة العطف: (الربط):** ئامرازی بەستنەوە، پێوەند، ئامرازی هۆدانەوە.
- **اداة النکرة:** ئامرازی نادیار.
**ادارة:** ڕابووردن، بەسەر بردن.
**ادارة:** بەڕێوەبەرایەتی، سەرپەرشتی، هەڵسووڕاندن، بەڕێوەبردن، گێڕان، ڕابەرتن، سەخبێرن، دەهم، کۆچەل، * خولدان، سووڕاندن، بەڕێوەبەرایەتی، کەوە، کوچەل، بەنەری دیوان، ئاواز.

**سجاف:** درز، کۆبە، سەرکۆبە، پەراوێز.
**سجال:** دۆڵچەی ئاوێ.
**سَجّان:** بەندیخانەوان، زیندانەوان، پاسەوان، گرتووخانەوان، دووساخوان، بەنیوان، بەندیوان، زینانەوان.
**سجة:** شاران.
**سجد سجداً:** کڕنۆش بردن.
**سجدة:** کڕنۆش، نێوچاوان لەسەر زەوی دانان بۆ خۆ نزم کردن و خودا پەرستی، کڕنۆش.
**سجس:** شلوێیی و لێڵ بوونی ئاو.
**سجع (ج) أسجاع:** (١) وتە و ئاخاوتنی پاشبەند دار (بە قافیە) و دوارێک لە پەخشاندا. (٢) گمەگمی کۆتران.
**سجع سجعاً:** دووایی ڕێکخستن، دووایی ڕازاندنەوە، سەروادار، وتەی پاشبەند دار.
**سجف:** بڕوانە (ستار).
**سجل:** بڕوانە (دلو).
**سجل (ج) سجلات:** تۆمار، زابەند، فەرمانناوە، پەراوی دادگا و دیوانەکانی دەوڵەتییە کە فەرمانانی دەوڵەتی تێدا تۆمار دەکرێت.
**سجل قيد الطلاب اليومي:** تۆماری ڕۆژانەی ناو شاگردان.
**سجل الأحوال:** ناسنامە، شناسنامە، تۆماری بار.
**سجل الأحوال المدنية:** هەواڵی ژیاری، زابەند، تۆماری باری شارستانیەتی.
**سجن (ج) سجون:** بەند، بەندیخانە، گرتووخانە، زیندان، دووساخ خانە، ڕاگرتووخانە، گرتی خانە، زینان، زنان.
**سجن التوقيف:** ڕاگرتووخانە، ڕاگراوخانە، گرتی خانە.
**مديرية السجون العامة:** بەڕێوەبەرایەتیی بەندیخانەکانی گشتی.
**مدير السجون العامة:** بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی گشتی.
**سجن سجناً:** گرتن، زیندانی کردن.
**سجن المنفرد:** سالوول.
**سجنجل (ج) سناجل:** بڕوانە (مرآة).
**سجود:** کڕنۆش بردن، نێوچاوان لەسەر زەوی دانان، ڕوو خستنە ئەردێ
**سجور:** دەستەچیلە، چیلکە، چڵ و چێو.
**سجية (ج) سجايا:** بڕوانە (خلق (ج) أخلاق).
**سجيل:** گڵمەت، بەردەمەرە، بەردەشاخ، تەوەنەڕێژێ، بەردە ڕژاگ، بەردە ڕێژە (لە سەنگ-گڵ وەرگیراوە).
**سجين:** گیراو، بەندی، گرتوو، گراو، زیندانی، دووساخ کراو، گرتێ، گیریاگ، بەنی، نیگا دێریاگ.
**سجين سياسي:** گیراوی ڕامیاری.
**سحاب (ج) سحب، سحائب:** هەور، ئەور، کەرەوەر، ئەڤر
**- قطعة سحاب:** پەڵە هەور، گابەل.
**سحابة:** پەڵە هەور، گابەل.
**- قطعة كبيرة من السحاب:** گەواڵە.
**سحاب أبيض:** هەوری سپی.
**السحاب الخفيف:** هەوری تەنک.
**السحاب القاتم:** هەوری ڕەش.
**- إنقشاع السحاب:** هەڵبڕکان، هەڵبڕینگان، هەڵبڕینگاندن.
**سحار:** بڕوانە (ساحر).
**سحاقة:** پانپانۆکێ، کوسکوسانێ.
**سحب:** کێشان، کێشانەوە، کێشاندنەوە، ڕاکێشان، دەڤتێن، خرکاندن، خشاندن، خوشاندن، ڤەکشاندن، ڤێڤراندن.
**سحب اليد:** دەست کێشانەوە.
**سحج:** پاک کردنەوە، تێکوڵ لێ کردنەوە، کەلبتێن، کەلبتاندن.
**سَحَر:** بەیانی، بەیانەکی زوو، نەخری، تاریکەوور، پەزوو وان، شەوەکی.
**سحر (ج) أسحار:** مستی، یاتوو، ئەفسوون، ئەفسوونگەری، جادوو، تەلەسم، بارێمژن، چاچۆڵ، چازوو، جاچۆڵ، جاچۆڵگەری، جادووبازی، جادووگەری، دەمبەستی، ئەفسانە، چاوبەست، چاوبەند، چاوبەس.
**سحر الحلال:** هونەر لە هەڵبەست و پەخشانانیدا نواندن، هونەر لە کردار و پیشەگەریدا.
**سحق:** کوت لێ ژەنین، خۆ پێوەنان، قەرمچاندن.
**السحق:** هاڕین، وردکردن، پلخاندن، پلێخاندنەوە، گەرمژاندن، پلێشاندنەوە، چرتکردن، گەلفاندن، گەلفچاندن، سوونەوە، گژمراندن، ئارین، پەلساندن، داهاڕین، ڕجرجاندن، سوون، هاڕاندن، هاڕینەوە، هەڕین، هەسووان، هێراندن.
**سحق الشيء تماماً:** هاڕین، قرچەشکێن.
**سحور:** پارشێو، پاشێو، پارشام، پاشیو، پارشیڤ، پێش بەری بەیانی.
**سحيف:** هاڕەی ئاش.
**سخاء وسخاوة:** بەخشش، جووامێری، دڵفراوانی، دڵگوشادی، جوامەردی، جووانمەردی، جووانمێری، مەردی، مەردەمێری، دڵفرەیی، بەخشندەیی، دەسەنە، دەسوازی.
**سخافة:** (١) نەزانی، نیازانی، بێهایی، لەگامی. (٢) بۆدڵەیی، گەوجی، بۆدلی، سووکی، بێ هیری.
**- التكلم بالسخافة:** فلتاندن، فلتەکردن
**سخام:** (١) خەڵووز، ڕەژوو، ڕەژی. (٢) تەنی، ڕەشایی بنی تاوە و مەنجەڵان. (٣) تووکی نەرمی باڵندان.
**سخام المصباح:** تەنی، دووەدەی چرا.
**سخاوة:** بڕوانە (سخاء).

**سختيان:** تيمانج، چەرمی دەباغی کراو.

**سخر:** بڕوانە (**تسخير**).

**سُخرة:** بێگار، سۆغرە، فەرحە، جرار، فرح، قەشمەرجاڕ، زۆرەملێ.

**سخرية:** مەزاق، گەپ، قەشمەری، تەڕانە، تيز، زرتەک، سوويار، تەوزە، زرتۆلە، گاڵتە، قەوسە، گەمە، قەشمەرجاڕی، ريشخەنەجاڕی، تيزجاڕ.

**سَخَط:** ڕق، بێز لێ بوونەوە، قرس، قەڵس.

**سُخط:** ڕق، بێز لێ بوونەوە، قرس، قەڵس.

**سخلة:** ڕەتەوی، کاووڕ.

**سخلة صغيرة:** کۆڵەبڕە.

**سخن:** گەرم.

**سَخّن:** بڕوانە (**تسخين**).

**سخونة:** (١) گەرمی، گەرمایی، تين، گەر، گەرماڤ، گەرمێتی، گەرماهی. (٢) تا، نۆبەتێ، تێ، یاو، پرتاڤ، تەو.

**سخيّ (ج) أسخياء:** دەسگوشاو، دەس و دڵدار، سەرپەتی، کورد، خاوەند دڵ، جوامێر، شاخيس، مەردەمێر، دڵفرە، دڵفراوان، دڵگوشاد، بە دڵ، جۆمەرد، جووانمەرد، جوانمێر، دەست ئاوەڵە، دەست گوشاد، ڕەند، مەرد، بەخشندە، دەسواز، پارە بەخش.

**سخيف:** فشوفۆڵ، سست، بێ هێز، کەم هۆش.

**سخين:** گەرم، ئاوی گەرم.

**السخينة:** سايلە.

**سد (ج) أسداد، سدود:** بەنداو، بەند، پێش بەست، تيغە، پەرژين، بەرزەخ، بەست.

**سد:** بەستن، ڕاگرتن، بێندن، پەرژين، گرتن، قووچاندن، بەربەست کردن، نژاندن، بەرهەڵست کردن، پێوەدان، تەيان، چووقاندن، ژەنن، داخستن، گاڵەدان، بەست.

**سد الباب:** دەرگە داخستن.

**سد الفم:** دەم قووچاندن.

**سد الماء:** بناوان.

**سداة (ج) أسدية:** نەخۆشييەکی کەپۆيە تووشی کەپۆی هەر کەسێکی بێ ئيتر بۆن ناکات.

**سدانة:** ڕاژەی ماڵی خووا کردن، پەردە داری، دەرکەوانی و ڕاژەی کەعبە.

**سداد:** سەرە شووشە، دەروانە، دەمەوانە، دەم بەست، پشک.

**سداد الكوز:** سەرقاپ، زارەوانە، تۆپەوانە، سەر، دەمەوانە.

**سَداد:** ڕاستی، دروستی، ڕاوەستاوی، پايەداری.

**سدادة:** پۆڕک.

**سداسي:** شەش لۆيی، شەش گۆشەيی، شەش چينی.

**سدّة:** دەرگا، پێشدەرگا، پێشگر، گرفت هێنەر، بەر دەرگا.

**السُّدّة:** بەن، بەند، بنکە، ئاوبارە، بەرزەخ، بەنگە، بەست، بەربەند.

**سُدّة:** دەربوونەيەکە دەرنەچێ، دەرگا، پێشدەرگا، کورسييەکی بڵند وە مينبەری بچێ، دەرمانی گير.

**سدد:** نيشانە گرتن، سێرە گرتن.

**سدر (ج) سدور:** موورد، داری مووردتکێيە.

**السدر:** کونار، مۆرد.

**سدرة:** کەنار، قەراخ.

**سدس (ج) أسداس:** شەش يەک، دانگ.

**سَدوس:** تەيلەسانی سەوز، سەرپۆشی کەسک.

**سدل:** داخستن.

**سدى:** ڕايەڵ تان لە پيشەی تەون و جۆلاييدا تانە ئەوەيە کە لەگەڵ پۆيەکانی دەبری لە تەنيندا.

**سدى ولحمة:** تان و پۆ، ڕايەڵ (لە تەون و جۆلاييدا).

**السدى:** شەونم، خوناو، قەراو.

**سدية:** دەستە بەرە.

**سديد:** قايم، ڕاست، دروست.

**سِر:** بڕۆ.

**سِر:** گەرای ماسييان.

**سر (ج) أسارير:** خەتی بەری دەست و چينی نێو چاوان.

**سِرّ (ج) أسرار:** (١) ڕاز، نهێنی، ڤەشار، پنی، لم، فەرمانی نهێنی، سرتە، پەنامەکی. (٢) پرۆز، بەند و باو.

- **المشارك في السر:** هاوڕاز، هامراز.
- **المشاركة في السر:** هاوڕازی.

**السر الخفيّ:** ڕازی نهێنی.

- **أسرار صغيرة:** وردەڕاز.
- **أمين السر:** ڕازدار، ڕازنووس.
- **كاتب الأسرار:** ڕازنووس.
- **إفشاء الأسرار:** زمان شڕی.
- **مفشي الأسرار:** زمان شڕ.

**سراً:** بە دزی، بە پەنهانی، لەپاڵەوە، بەبێ دەنگی، بەنهێنی

- **الكلام سراً:** سرتە.

**سر الليل:** نهێنيی شەو.

**سراء:** خۆشی، شادمانی، ئاسانی.

**السراء والضراء:** خۆشی و ترشی.

**سراب:** سەبەقی، لەيلان، ڕەورەووک، هاڵ، سەراو، ورشە، بەردە تراويلکە، پەيەرک، پەيرک، گەرگە، ڕەوڕەو، هەڵم و ڕەنگی ئاو، بەرد، دار يان خانووبەرە وە يان زيخ وردە بەردێکە لە دوورەوە وەکو ئاو بترووسکێ.

**سراج (ج) سرج:** دەستەچرا، دەسەچرا، چرای دەستی.

**سراج المساكين:** مەبەست لە مانگەشەوە.

**سَرّاج:** زین دروو، زین دۆز، مارەکەر.

**سراجة:** زین درووێتی.

**سرادق (ج) سرادقات:** سەردەق، سەرپۆش، پەردە، خێوەت، گەردەلوولە.

**سرادق الخيمة:** کۆمانج.

**سِرار:** چینی ناو لەپی دەست و نێوچاوان.

**سِراط:** رێگای گوشاد.

**سراعة:** لەزاندن.

**سراي، سراية:** سەرای میری، سەرای دەوڵەتی.

**سِراية:** (١) پەتا، درم، تەنینەوە، لێ گرتنەوە، تێ گەڕان، تێ چڕژان، پەرە ئەستاندن، تەنینەوە، زایین، سەر دەرخستن، دەرکەوتن، پەیدابوون، دەردان، دەڵاندن. (٢) شەورۆیی.

**السرب:** درز، دەرز.

**سرب الرجل:** پیاوەکە رۆیشت.

**سرب الماء:** ئاوە کە رەوان بوون، لەبەرچوون، دەڵاندن.

**سرب (ج) أسراب:** مێگەلی ئاسک و پۆلی باڵندانە، رەوە.

**سرب الحمير:** کەرەگەل، هەرەگەل.

**السرب (للخنزير وغيره):** هوورەم.

**سرب الطيور:** پۆلی باڵندان.

**سرب النحل:** پوورەهەنگ.

**سربال (ج) سرابيل:** بڕوانە (سروال).

**سرة (ج) سرات:** نێووک، ناووک، ناڤک، نێفک، نەە، نێڤک.

**- تحت السرة:** بەرزنگ، بەرمووسڵدان.

**سرج (ج) سروج:** زین، بارەکە، بەر.

**- قربوس السرج:** قەڵپووز.

**- حنية السرج:** قاڵتاخ، تەکەڵتوو.

**سرج اللباس:** نێفەک.

**سرجون:** سەرگین، قەرسەقول.

**سرجين:** سەرگین، قەرسەقول.

**سرّح:** بڕوانە (تسريح).

**سرحال:** بڕوانە (ذئب).

**سرحان:** بڕوانە (ذئب).

**سرخوب:** (١) چەقەڵ. (٢) درێژ و ئەندام رێک. (٣) ماینی کلک درێژ.

**سرد:** کلکگیر.

**سرداب (ج) سراديب:** سارداوە ژێرخان، سارداو، ژێرخان، ژێرزەمین، سەرداو، ماران، ژێرزەوی، رێسان، سێزان، ژێرزەوینی.

**سرطان:** قرژاڵ، قرژانگ، شێرپەنجە، کەوگیرە، کێفژاڵە، کێڤژاڵە، کێمجاڵە، قرژنگ.

**سرطان:** کۆنگرە (بورج)ێکە لە کۆنگرەکانی ئاسمانی، کۆنگرەی قرژاڵ، مانگی چوارەمە بەپێی ژمێریاریی کۆنگران، بورجی قرژاڵ.

**السرطان (مرض):** شێرپەنجە، خرچەنگ، قرژاڵە، جوولبر، گرتەکوو، برین و زامێکی زۆر پیس بێ، کەوگیرە، چنگار.

**سرع سرعاً وسراعاً:** تاڵووکە کردن، پەلەکردن، لەزین، لەزیان، هنجران، لەزاندن.

**سرعة:** چاپووکی، تاڵووکە، گورجی، هەشتاوی، پەلە، خێرایی، سات، شاتری، فێرز، هەڵە، هەڵەداوان، پرووشی، جەخت، تاو، گوژمە، هەرەمە، تەووژم، لەز، ئەبابۆزی، پڕتاوی، توندوتۆڵی، چالاکی، چەسپان، چوستی، گوڕ، توندی، تیژی، گورج، گورجوگۆڵی، گوژم، خێرایی، توندی، تەردەستی، هولوو، پەلە.

**- بسرعة:** خێرا، بەپەلە، بەپڕتاوی.

**السرعة في العمل:** هەڵەکاری.

**سرعة التنفس:** هەناسە بڕکێ.

**سرعة الحركة والعمل:** کرپ.

**سرعة المشي:** رەوت

**- بأية سرعة:** کووتێرا، چەزوو، کێرا

**السرعة المنتظمة:** خێرایی رێک و پێک، خێرایی چون یەک

**السرعة غير المنتظمة:** خێرایی نارێک، خێرایی ناچوون یەک

**سرفة الجراد:** پاکورە

**سرفوت:** سەمەندەر

**سرق سرقاً وسرقة:** دزین، دزی کردن، ئەبابۆزی کردن، چرپانن

**سرقة:** دزی، دزێتی، ئەبابۆزی، چرپ، دەست پیسی، دزین، قرپ، ماڵبرین

**سرقة (دودة في مكمن الأعشاب تموت الأغنام اذا أكلها):** کرمێکە لە قەفی گیایاندا هەر ئاژاڵێکی بیخوا دەیکوژێ بە زمانی کوردی (مافەتە)ی پێ دەڵێن.

**سرقين:** سەرگین، زبڵ، تەپاڵە.

**سرمد:** هەر، هەمیشە، هەر هەبوون، ئەوەیە کە سەرەتا و دوایی نەبێ.

**ليل سرمد:** شەوی درێژ.

**سرمدي:** هەمیشەیی، هەر هەبوونی.

**سرو:** سەروو، سەرو (دار).

**سروال فوقاني:** شەرواڵ، پانتۆڵ، رۆتک، شەڵوار، شاڵوار.

**سروال (ج) سراويل:** شەڵوار، شوواڵ، دەرپێ، پاپۆش، دامانپۆش، ساتان، پابەرە، پابەرێ، پاوەرێ.

**سروال صوفي:** پەشمە، شاڵ.
**سروال للنساء:** ئاوالكراس، ئاوەڵكراس.
**سرور:** شادی، شادمانی، کەیفخۆشی، شایی،ساڵغی، دڵخۆشی، بسکە، دەباخ، دڵشادی، شەوق.
**- ظهور السرور والفرح:** ترینگە.
**سُري:** شەورۆیی.
**سريّ:** پەنامەکی، رازی نهێنی، رازی پەنهان، ژێر جلەکی، نهێنی، نادیار.
**سريان:** شەورۆیی، تەنینەوە، کار لێک کردن، لێک گرتنەوە.
**سرية (ج) سرايا:** تیپێکە لە لەشکرێکی، لق.
**- آمر السرية:** سەرلق.
**سرير:** تەخت، تەختی نووستن، قەرەوێڵە، چارپایە.
**- غطاء السرير:** کوللە، مەچەکدان.
**سريع:** چوست، چەسپان، بەگوڕ، خێرا، پێتمار، نەبابۆز، بەپەلە، تیژ، چالاک، گورج، هەشتاو، پروەش، توند و تۆڵ، فرز، کرژ، کۆڵ، گوریز، بە گوژمە.
**سريع الإحتراق:** خۆش سووت.
**سريع الإنتقال:** تیژهۆش، بیر تیژ، زوو تێگەیشتوو.
**سريع البكاء:** گرینۆک.
**سريع التأثير:** سەرپل.
**سريع الجريان:** خوڕ، خێرارەو.
**سريع الحركة:** خۆشڕۆ، تیژڕۆ، تیژرەوت، توندڕۆ، چالاک.
**سريع الخطى:** تیژڕۆ.
**سريعاً:** بە پەلە، بە لەز، بە تالووکە، بەگورجی، بەزوویی، بەتوندوتۆڵی، جێبەجێ، خێرا خێرا، زۆر زوو، دەمودەست.
**سريع السير:** توندڕۆ.
**سريع العمل:** چالاک، توند و تۆڵ لە کاراندا.
**سريع الغضب:** رق نەستوور، جنگز.
**سريع المشي:** تیژڕۆ، خۆشڕۆ، بەزۆک، تیژرەوت.
**سطارة:** خەتکێش، راستە.
**سطام:** کوڵۆوەژ، کوڵۆوەژێن.
**سطح (ج) سطوح:** (١) روو، رووکار، سەرروو، رووبەر، سەلەندە. (٢) پانایی، بەرینی، پێنایی. (٣) سەربان، بان خانی، سەلەندە، سەربێنک.
**- سطحان متلاقيان:** دوو رووی بە یەکتر گەییو.
**سطح أفقي:** سەر رووبەکی ئاسۆیی.
**سطح البناء:** سەربان.
**سطح البحر:** رووی دەریایە.
**- مقاييس السطوح:** پێوەرەکانی روو.
**- سطحان متوازيان:** دوو رووی تەریب.

**سطح الجسم:** سەرلەش.
**السطح الصغير:** بانانووچکە.
**سطح في الهندسة:** بان، سەر روو، روو، رووکار، رووی هەر چێتێکی کە پان بێ.
**سطح كروي:** رووی خڕۆک.
**سطح الماء:** سەر ئاوی.
**السطح المائل:** رووی لار، لارەروو.
**سطح المربع:** رووی چوارگۆشە.
**سطح المستوي:** رووکاری تەخت.
**سطح المنحني:** رووی چەماوەوە.
**سطح المنخفض الصغير:** بانێژە.
**- حواشي السطح:** سوواندە، گوێ سوواندە.
**- فوق السطح:** بان ماڵ.
**- تمدد السطحي:** رووبەرەکشە.
**سطحي:** ساویلکە، سادە لەوح.
**- المساحة السطحية:** رووبەری روو، رووبەری رووکار.
**- حواشي السطح:** گۆرگە.
**- وحدة السطوح:** یەکەی روو.
**سطوح متلاقية:** رووکارەکانی بەیەک گەیشتوو.
**السطوح المتناظرة:** رووە هاوجێکان.
**السطوح المتوازية:** رووبەری تەریبی.
**- مقياس السطوح:** پێوەرەکانی روو، رووپێو.
**- متوازي السطوح:** غیەک.
**سطر (ج) سطور:** دێر، دێغ، گێر، چێر، خێز، قوڕ، داخ، داغ، خەت، بۆ چووم، دێخ، راستە، رێزی وشە، پیت، دار یان دیوارانە، رزن، کەشە.
**سطر سطراً:** دێردێر کردن.
**سطرلاب:** بروانە (أسطرلاب).
**سطل (ج) سطول:** سەتڵ.
**سطوة (ج) سطوات:** زەبر، هێز، توانایی، تین، زۆرداری، دەستەڵات، راسەر، کەلێژ، زەبروزەنگ.
**- ذو سطوة:** دەستەڵاتدار، گوندار.
**سعادة:** خۆشبەختی، هات، بەختیاری، فەڕ، کامرانی، بەختەوەری، پیرۆزکاری، پایەبەرزی.
**سعادة الحظ:** بەختەوەری، کامرانی.
**سعادة الفلان:** فیساری پایەبەرز، فیساری بەختیار.
**سعار:** گەرمی، هاری، هارێتی، ئاگری سەختی برسێتی.
**سعال:** کۆخە، کۆکە، قڵخە، قۆخە، کۆکین، کووخک، کووکە، قرزە، کوویکە، کۆخین، کۆرک.
**السعال البسيط:** نەرمە کۆکە.

**السعال الجاف:** وشکە کۆکە.
**سعال خفيف:** نەرمە کۆکە.
**السعال الديكي:** کۆخەڕەشە، کۆکەڕەشە، خەندەکووک.
**سعال المواشي:** مەقار.
**- كثير السعال:** قڵخن، کۆخن.
**سعاية:** قسەچین، بەدگۆیی.
**سعاية البريد:** شاتری.
**سعت:** سمڵ، سۆتکە، سۆتەکە.
**سعة:** فراوانی، گوشادی، ڕۆزی.
**سعة الرزق:** خوادان، گونجایش، خودادان.
**سعتر:** جاترە، هەزبێ، جەهتر، هەزبیە.
**سعد (ج) سعود:** پیرۆزی، چاکی، باشی، بەختیاری.
**سعدان:** عەنتەر، مەیموون.
**سعر (ج) أسعار:** نرخ، مەزندە، بەها، خاراج، خەراج، کرێژۆک، بایی.
**سعر تسعيراً:** نرخ یا بازاڕ و مەزندەکردن.
**سعر الجملة:** کۆبایی، کۆبایتی.
**سعر الصرف (في التجارة):** نرخی گۆڕینەوە.
**سعر الفائدة:** نرخی سوود.
**سعر المفرد:** تاک بایتی.
**السعر الحرارية:** کالۆری.
**سعف:** پێکهێنان، یارمەتیدان.
**سعف:** لکی دارانە، لک و گەڵای دارە خورمایە، جیازی بووکان
**السعفة:** خەرکانە، زەردە - جۆش.
**السعل:** کۆخین، کۆکین، قڵخاندن.
**السعلب:** سالە، سالم.
**سعود:** خۆشبەختی، پیرۆزی.
**السعي:** تەلاش، هەڵپەهەڵپ، پەلەکوتێ، پەل وەشانن، کۆشش، کۆشین، تێکۆشین، هەوڵ، تەقەلا، کۆشەوە، خەبات، کونوکۆ، ولایین، پەلەقاژە، خەفتانی، لۆقبر، هەڵپە، چلوچۆ، خەفتیاتی، خەفتیان، خەفتان، قەپچاندن، قەپچین، کروکاش، کۆشان، لۆقە، لۆقەلۆق، ڕاکردن لە نێوانی (صفا و مروە)دا.
**السعي السنوي:** تێکۆشانی سالانە، کۆششی سالانە، ژمارەی سالانە.
**سعى سعياً:** هەوڵدان، تێکۆشین، خەفتان، خەباتکرن، قەپچاندن، کارکردن، ڕۆیشتن، ڕووتێکردن.
**سعيد (ج) سعداء:** بەختیار، خۆشبەخت، کامران، بەهات، خوودان بەخت، بەخت کەنۆک، بەختەوەر، ناوچاو پاک، خۆشحاڵ.
**سعيد الحظ:** بەختیار، کامران.

**سعير:** گڕی ئاوری، گوڕی، سوولی، شید، بڵێسە، دۆژە.
**سف:** توولە مار، تیرە مار، ئەسپە مار.
**سف سفيفاً:** تێپەڕینی باڵندە یا هەور بەسەر زەویدا.
**سفاح:** بروانە (سفاك).
**سفارة:** باڵیوزخانە.
**سفاك:** خوێنرێژ، خوێنخۆر، مێرکوژ، دەڤ لخوین، دەم بە خوین، ونرێژ، هوونرێژ، زەراڤ.
**سفال:** قاپ و دیزە و گۆزەی گڵی.
**سَفال:** نزمی
**سفالة:** (١) سووکی، حیزەبخۆیی، بێ شەرمی، بڵچی، کنۆسی، هەندەیی، ساتوولی، بڵحی. (٢) خواردە.
**سفان:** کەشتیەوان، قەفتان.
**سفاهة:** سەرسەرێتی، بێ هۆشی، هەرزەیی.
**سفح:** داوێنی کێوی، بنار، پنار.
**سفح الجبل:** پەلە، بنار، پاڵ بەندەنی کێوان، تەلان، داوێنی کێوی، پاڵ چیای، قەدی کێوی.
**سفح التلول والجبال:** تەلان.
**سَفَح سفوحاً (الدم):** خوێنرژتن.
**سَفَح الدمع:** فرمێسک هەڵوەراندن.
**سفر (ج) أسفار:** کۆچ، ئۆغر، گەڕان، چوون، ڕێبواری، ڕۆیشتن، ڕارەوی، ڕێرەوی، ڕۆیین، گەشت.
**- رفيق السفر:** هاوڕێ، هامڕا، هاوڕا.
**- أدوات السفر:** هوور و موور.
**سَفرة:** گەشتێک، گەڕانێک.
**سفرة مدرسية:** گەشتی قوتابخانەیی.
**سُفرة:** سفرە، خوان، خوانچە.
**سفرجل (ج) سفارج:** بهە، بیهە، بیهووک، بێ، بەهێ، بەی.
**- حب السفرجل:** بێدانە.
**سفعة:** بروانە (لطم).
**سفك سفكاً (الماء والدم):** ڕژتن، ڕشتن، ڕهتن، ڕێژاندن، ڕێژنای.
**سفقة:** بروانە (لطم).
**سفك الدماء:** خوێن پژاندن، خوێنرژتن، ونرێژی، خوێنرێژی.
**سفل سفولاً:** نزم کردن، دانەواندن.
**سفل:** نزمی، نەورایی، نزمێتی، نەوری، پەستی.
**سفلة:** سپڵە، بەدنمەک، نزم، ناکەس.
**سفلى:** نزمی، نزمیتی، نەویەتی، نەوێتی، پەستی، خواروو، ژێرەوە.
**- الجهة السفلى:** ژێرایین، لای خوارەوە، لای نزمی، وار.
**- من الجهة السفلى:** لە ژێرەوە.
**سفليس:** فەرەنگی، کفتی.

- **مرض السفليس:** نەخۆشیی فەرەنگی، کفتی.
**سَفَه:** نەزانی، بێ هۆشی، بەدخوویی، خودسەری.
**سفود:** سیخ.
**سفود البندقية:** زمە.
**سفور:** ڕووی ئاوەڵە، ڕووی بێ ڕووبەند و پێچە.
**سفول:** نزمی، سووکی، کەمی.
**سفيحان:** هۆڕ، جەواڵ و تێری زۆر گەورە.
**سفير (ج) سفراء:** (۱) باڵیوز، باڵوێز، سەرشابەندەر، سەرئێلچی. (۲) نامە، پەرتووک.
**سفيف النسيج العريض:** شۆرتک.
**سفيفة:** قەیاسە، کەژوو، کەژی.
**سفيل (ج) سفلاء:** هەرزە، سووک، گرزە، حیزەبخۆ، کنۆس، جیوەڵەک، هەرچی و پەرچی، دلسفک، وەینەک، بەترف، بلح، دوون، نزم.
**سفين:** هۆرەی داری یا هی ئاسنییە، پوواز، زەمۆمە.
**سفينة (ج) سفن، سفائن:** گەمی، گەمیە، کەشتی، پاپۆڕ.
**سفينة بحرية:** کەشتی دەریایی.
**سفينة حربية:** کەشتی شەڕێ، کەشتی جەنگێ.
**سفينة شراعية:** کەشتی بایەوان، کەشتی چارۆکەدار، بایەوان.
**سفينة الصحراء:** کەشتی بیابان.
**سفينة طرادة:** گەمیی شەڕی، کەشتی ڕاونەر.
**سفينة فضائية:** کەشتی هەوایی، کەشتی ئاسمانی.
**سفينة مدرعة:** کەشتی زرێدار.
**سفينة مدمرة:** کەشتی ڕمێن، گەمیەی ڕووخێنەر.
**سفينة نوح:** قەنتەرە.
- **ربان السفينة:** گەمییەوان، کەشتییەوان.
**سفيه (ج) سفهاء:** گەوج، نەزان، بێ کەللە، بۆنی، فلێتە، سەرسەری، مایەپووچ، بێ هیـر، گەلۆر، بێ هۆش، ترۆ، چوخـتی، حەپنگ، دیلان، دیلانە، وەینەک، هەرزە، ڕوو هەڵماڵراو، حەیتە.
**سق:** زەنگ.
**السقاء:** ماسی گرە (باڵندە).
**السقاء:** ئاوکێش، پیاڵەی ئاو خواردنەوە.
**سقاء (ج) أسقية:** کوندەی ئاوێ، کونە، دێمکە، جەوەندە.
**سقاطة:** واڵە.
**سقامة:** نەخۆشی، لەش بەباری.
**سقاية:** ئاودان، ئاودێری
**سَقَب:** دیرەک، تیرەک، ستوندی خێوەتان.
**سَقَر:** جەهەننەم، ئەتوون، ئارتوون، دۆژە، ئاورخان، جەحەندەم.
**سُقط:** ئاگرێکە لە کاتی دامرکاندنیدا.
**سقط:** بڕوانە (سقوط).
**سَقَط (ج) أسقاط:** گەند، خراپ، چپکدار، کەموکوڕی دار.
**سقط:** بەراوێژتن، بەر هاوێژتن.
**سَقطة:** تاوان، خلیسکان.
**سقف (ج) سقوف:** میچ، کۆسەر، سەراپیتە، زگی میچ، بن میچ، سقیک، ئەرزینج، ساپیتە، بان.
- **سهم السقف:** داری دارەڕایە.
- **زوايا السقف:** سەراسووێ.
**سقف الحلق:** مەلاشوو، ئاسمانی دەم.
**سقم (ج) أسقام:** بڕوانە (مرض).
**سقوط:** کەوتن، کەفتن، گلانە خوار، داکەوتن، کووڕبوونەوە، بەربوونەوە، گلیان، پێراهاتن، تەکەربوون، ڕاکەتی، داکەوتن، داکەفتن، ڕمان، بەلاداهاتن، کەوتنە خوارەوە، کەفتەی، وەرۆیین، وەشان، وەرەسیان، وەردەوەبین، وەرسان، وەرسین.
**سقوط من شاهق:** خۆ فڕووجکردن، فڕفجووک، کەتن.
**سقوط الأوراق:** خەزەڵوەران، گەڵاڕێزان.
**سقوط المصارعين جملة على الجانب:** گاوبار.
**سقى سقياً:** ئاودان، ئاڤدان، ئاویاری، دێرانن، دێراندن.
**السقي ليلاً:** شەودێری.
**سقيفة:** کەپر، سەکۆ.
**سقيم (ج) سقام، سقم:** بڕوانە (مريض).
**سك سكاً (الباب):** دەرکە داخستن.
**سك البئر:** چاڵاو هەڵکەندن.
**سك النقود:** پارە لە سکە دان، پووڵ لێدان.
**سكَّاف:** کەوشدروو.
**سكافة:** کەوشدرووێتی، قۆندرەچێتی.
**سكَّاك:** سکەلێدەر.
**سكان:** دانیشتوان، ڕۆنیشتوان.
**سكان الأرياف:** دەشتی، دەشتەکی.
**سكان السواحل:** هەڤاڤ.
**سكان القرى:** دێیانی، دێهاتی.
**سَكَّان:** کێردگار، کێردگەر.
**سكب:** ڕژتن، ڕێژتن، ڕێژنای، ڕشتن، هەڵڕشتن، ڕژاندن، ڕژانن، ڕێژاندن، ڕێژنای، ڕهتن.
**سكب الماء ونحوه على شيء:** ئاوپێداکردن.
**سكة (ج) سكك:** (۱) ڕێگا، ڕێ، ڕیی. (۲) پووڵی کان، دراوی کان، (۳) کووچە، گەڕەک.
**السكة الحديدية:** ڕێگای ئاسن، ڕێی هەسن، هێڵی ئاسن.
**السكك الحديدية:** ڕێگایانی ئاسن، ئاسنەڕێ.
**سكة المحراث:** هاڵەت.

**سكة:** مرازێکە کە پوولی لاژوارد (معدن) بەوی لێدەدەن.
**سَكَت سكوتاً:** خامۆش بوون، کپ بوون، مات و بێ دەنگ بوون
**سكتة:** (١) مەرگی کوتوپڕ، نەخۆشێکە هەموو ئەندامی لەشی مرۆڤی لە جوولان دەخا پشوونەبێ. (٢) تەگەرە.
**سكتة قلبية:** مەرگی کوتوپڕ، دڵ وەستان، پەرکەم، دەردی کوتوپڕ
**سُكر:** (١) مەستی، سەرخۆشی، سەرمەستی. (٢) پڕکردن، تژی کردن.
**سُكّر:** شەکر، قەند، چەخموور.
- **نبيذ السكر:** شەکراو.
- **مرض السكري:** نەخۆشیی شەکری.
- **فحم السكر:** خەڵووزی شەکری.
- **رأس سكر:** کەللە شەکر.
- **قطعة من السكر:** کولۆ قەند، کەڵپە شەکر.
- **كسارة السكر:** قەند شکێن، شەکر شکێن.

**السكر الأحادي:** تاکە شەکر.
- **وعاء للسكر:** شەکردان، قەندان.

**سكرات الموت:** گیاندان، گیانەڵلا، ئاویلکەی مەرگێ، چەنەگە هەڵتەکاندن.
**سكر نبات:** نەبات.
**سكران (ج) سكارى:** سەرخۆش، مەست، سەرمەس، سەرمەست، لوول، گیژ، مەس (بۆ نێرینانە).
**سَكرة:** سەختی مەرگ، مەستی، گومڕاهی، بێهۆشیی سەردەمی گیاندانێ.
**سكرتير:** سلیف، نهێنی نووس، رازنووس، نهێنیا.
**السكرتير العام:** ڕازنووسی گشتی.
**سكرتير المحكمة:** رازنووسی دادگا.
**سَكرى:** سەرخۆش (بۆ مێیینانە).
**سكري:** شەکری.
- **البول السكري:** شەکرەمیز.

**سكري اللون:** شەکەری، رەنگی شەکەری.
**السكريات المختلفة:** شەکرە هەموو جوورەکان.
**سكرية:** قەندان، شەکردان.
**سكف:** سەکۆ.
**سكن سكوناً:** (١) ڕاوەستان، دامرکان، بێ دەنگ و مات بوون. (٢) دانیشتن.
**سكّن:** بروانە (**تسكين**).
**سكنة (ج) سكنات:** بار و چۆنیەتی، پایەداری.
**سكنجبين:** نەسکەنجەبین، سکەنجەبین.
**سكن:** (١) بنەگە، نیشتەمەنی. (٢) نیشتەجێیی، دانیشتن، جێگربوون.

**سكوت:** خامۆشی، داکاسان، بێ زمانی، دامرکان، دامرکانەوە، دەمکوتی، دەمگرتن، گەورین، ماتی، مامشی، کش و ماتی، ئارامی، بێ دەنگی، ئارامگرتن، بەلیبوڕ، شابوون، متەق لە خۆ برین، کپی، هێمنی، هێدێتی.
**سكون:** ئارامی، بێ دەنگی، ماتی، وەستان، ئارام گرتن، بەلیبوڕ، تاقەتگرتن، جێگرتن، داکاسان، دەمکوتی، دنجی، دینجی، راوەستان، ستاربوون، سرەوتن، سرەوان، هێمنی، سرەوانەوە، سرەوت، دانیشتن، کپ بوون، کپی، کڕبوون، کش و ماتی، حەسانەوە، مات بوون، وەرقە، هەدادان، هێوری، متەق لەخۆبڕین، وەقرەگرتن، هاڵەوبوون، هێدی بوون، هێمنی، ڕام بوون، دامرکان.
**السكون المطلق:** وەستانی سەربەخۆ.
**سكونة:** لە ماڵێ دانیشتن، ئارامی، هێمنی.
**سكير:** ئارەقخۆر، مەیخۆر.
**سكين (ج) سكاكين:** چەقو، کێرد، کێرک، چێر، کارد، بەنبر، کێر، وێرد.
**السكين الكليل:** چەقۆی کول.
**سكينة:** ئارامی، ئارامێتی، هێواشی.
**سل:** سەلە، سەوەتە، قەرتاڵە.
**سلّ (مرض السل):** دەردە باریکە، دەخەز، دیق، وەرەم، ئازار، باریکە، ژانا زراڤ، سنگژاری.
**السل الرئوي:** دیقی سیپەلاک، وەرەم.
**السل العظمي:** تیراوی.
**سلاب:** بەرگی رەش، جلکی تازیەداری.
**سلات:** کاسەلێس.
**سلاح (ج) أسلحة:** چەک، جەبە، چەکی شەڕ و ڕاوێ.
- **مذخر الأسلحة:** جەبەخانە، سکدار، چەکخانە، قۆڕخانە.
- **مخزن الأسلحة:** جەبەخانە، سکدار، چەکخانە، قۆڕخانە.
- **نزع السلاح:** چەککردن.

**سَلاخ:** کەوڵکەر.
**سلاسة:** نەرمی، خۆشخوویی، رامی، رەوانی وتار و وشە.
**سلاطين:** کەیان.
**سلاق:** باری لێو، بەڵغی سەر لێو و پووک و زمان.
**سلاقي:** تاجی، تاژی، تانجی، بۆنچی.
**سلاك:** شووشەی زێر و زێو.
**سلالة:** نەتەوە، تیرە، بنەماڵە، بابک، باڤک، دوندان، زۆم، تووشماڵ، بەرەباب، خانەوادە، ڕەگەز، جووم، بنەچە، بنەچەکە، نەڤیچرک، وەچە.
**سلالة الأخ:** برازا.
**سلالة العم:** ئامۆزا، ئاپۆزا.

**سلالة الحور:** پەریزادە.
**سلام:** چەقەنە.
**سَلام:** (١) رزگاری، ئارامی، باش، خۆش، ئارامیتی، پاکی، هێمنی، ئاشتی. (٢) یادکردن، شەگگە، فەلات، رۆژ و شەوباش، دروود، سلاو، سلاڤ، پاتە.
**السلام علیکم:** (١) رۆژتان باش، شەوتان باش، شەگگە، خرتال، فەلات. (٢) لە لای عەرەبان بۆ مالیاواییش بەکاردەبرێ، لای ئێوەمان خۆش.
**- دار السلام:** بەهەشت.
**- مدینة السلام:** بەغداد.
**- نهر السلام:** دەجلە.
**سلامة:** پاکی، رزگاری، لەش ساخی، ساغی.
**السلامة الشخصیة:** ئێرپایتی تەن.
**سلامی:** جومگەی ئەندامانی لەش.
**سلامیات:** گرێیەکانی پەنجە، مووروەکانی گەی پەنجە و شوێنەکانی دیکەیە، کلاوەی پەنجە، وردەجمگەی لەش، پلەکان، پلۆچک، پلەکانان.
**سلامیات القدم:** شانەی پەنجەی پێیانە، وردە ئێسکەکانی پەنجەی پێیانە.
**السلامیة:** پلۆچکە.
**السلب:** سەروپێ، کەللەپاچە.
**سلب:** رفێنراو، گراو، پێست لێ کراوەوە.
**سلب سلباً:** رووتکردن، لێ ئەستاندن، تالانکردن، دارنین، رووتاندنەوە، داپلۆسین، شێلاندن، داپلۆساندن، شەلاندن، لێ کردنەوە.
**سُلب:** پۆشاکی رەشپۆشی تازیەدارانە، پۆشاکی کوژراوانە کە بۆ بکوژ بڕیاری لەسەردراوە.
**سلب الراحة:** ئارامی لێ هەلگرتن، ستار لێ هەلگرتن.
**سلب ونهب:** راووڕووت.
**سلبی:** ناتەبایی.
**سُلت:** جۆی رەشە.
**سلة (ج) سلال:** سەلە، قەرتالە، بەرچنە، تریانە، سەبەتە.
**السلة:** چنگنە.
**سلجم:** بروانە (شلغم).
**سلح:** ریقنە، جیقنە.
**سلّح:** بروانە (تسلیح).
**السلحفاة البریة (ج) سلاحف:** کیسەڵ، کووسی، کیسۆ.
**السلحفاة البحریة:** رەقە، رەقیاو.
**السلحفاة المائیة:** رەقە، رەقیاو.
**- فحیح السلحفاة والحیة:** کیفاندن، کیفە، کیفەکیف.
**- ترس السلحفاة:** قاپێلکی کیسەڵێ.
**سلخ:** دوایی مانگانی قەمەرییە، رۆژی هەرە دوایی مانگانە.
**السلخ:** رووتاندنەوە، داڕووتاندن، دارنین، ڤەرووتاندن، کەولکردن، جەلتاندن، خرتک کردن، کەفلاندن، داکەندن، داکەناندن، قەرووچکاندن، کەڤەلکرن، کەڤلاندن، کوروون، داماڵین.
**سلخ الوبر:** کۆلکەرنکردن.
**سلخ الجلد بدون تشقیق:** گروون.
**سلس:** نەرم، ئاسان، رەوان، رام، گوێدێر.
**سلس البول:** میزن، میزەچۆرتکی، دەڵەمیزە، چرتەمیزە، میزدۆ، میزەچۆرتکێ، میزەچرکێ.
**سلسال:** ناوی خۆش و سارد و رەوان.
**سلسبیل:** (١) نەرم، خۆش. (٢) ناوی خۆش و روون. (٣) دەڵێن کانیە لە بەهەشتێدا.
**سلسل:** ناوی خۆش.
**سلسلة (ج) سلاسل:** زنجیر، جۆل، شاران، پۆت، سۆلان، زنجیرە، رشتە.
**سلسلة تلجم بها:** قەراسە.
**سلسلة الجبال:** زنجیرەی کێوان، ڕێزەچیا، سەفان، سەفین، کێر.
**سلسلة دقیقة:** رێزە، زریزە.
**سلسلة رفیعة:** رێزە، زریزە.
**سلسلة ذهبیة:** کوومرب.
**سلسلة النسب:** بنەچەکە، سەرجەلە، رەگەز، وەجاغ، زنجیرەی رەسەن، تۆماری زنجیرەی باو و باپیران.
**سلطان (ج) سلاطین:** شاهەنشا، میری میران، میری گەورە، بەڵگە، توانایی خوندکار، خونکار، سان.
**سلطانی:** شاهەنشایی، میری میرانی.
**سلطة:** (١) دەست و دوو، توانایی، هێز، دەستەڵات، راسەر، کەلیڤ، دەستڕۆیی، دەستدرێژی، زەبەر، زەبەردەستی. (٢) ناولەپ، ناڤلەپ
**- صاحب السلطة:** کاربەدەست، دەستەڵاتدار، دەستدرێژ
**- فقدان السلطة:** لە دەستەڵات کەوتن، دەست نەرۆیشتن
**السلطة الإداریة:** دەستەڵاتی بەرێوەبەری.
**السلطة التشریعیة:** دەستەڵاتی یاسادانان.
**السلطة التنفیذیة:** دەستەڵاتی هەڵسووڕاندن.
**السلطة القضائیة:** دەستەڵاتی دادوەری، دەستەڵاتی ناوبژیکەری
**السلطة المطلقة:** دەستەڵاتی ئازادی و بەرەڵایی.
**سَلَطة:** سەلاتە.
**سلطنة:** میرێتی، خونکاری، شاهەنشایەتی، پێداری، میرینی، شایەنشایەتی.

**دار السلطنة:** دەربار، بارەگای میری، بارەگای شای.
**مقر السلطنة:** شانشینی.
**سلعة (ج) سلع:** بڕوانە (بضاعة) کەلوپەل.
**سَلعة:** لوو، تشپۆک، پرزک، سۆ، لۆک، تشپۆ، لوویی، لک.
**السلف:** هاوزاوا، هاواڵ زاوا.
**سلَف سلفاً:** وەپێشکەوتن، ڕەپێشکەوتن.
**سلف:** مالوو کردن، ماڵە لێدان.
**سلف (ج) سلفان:** بارەکەو، کوواریی، بار، کارەکەو، کێبار، بەستی، دووماهک، گووار، گوواری، کەوبار.
**سلف (ج) أسلاف:** نەتەوە، ، دوندان، پاشکەوتوو، وەرێنان، پێشینان.
**سلفاً:** پێشەکی، پێشین، دەست پێشینی.
**سلف تسليفاً:** بەجێ هێشتن، هێشتنەوە، ماوزۆ، لێگەڕان.
**سلفات الزنك:** توتیا.
**سلفات النحاس:** مووروەی شین.
**سلفاح:** پەڵۆشە (گیایەکە).
**سلفان:** هاوزاوا.
**السلفة:** بەرکوڵ، سەرکوڵ.
**سلفة (أخت الزوج):** دش.
**سلفة:** پێشینە، پێشەکی دانی بەشێکە لە پووڵ یا لە هەر چتمەکێکی دی لە بەرانبەر پووڵ یا چتێکی دیکەدا، بە قەرزدان پێشین، دەستگیری پێشەکی.
**سلفه المال:** ماڵی بەقەرز دایە.
**سلفه الشيء:** پێشکەشی کرد.
**السلق:** سڵق، زلق.
**السَلق:** کوڵاندن، کەلاندن، کەلژاندن، جۆشاندن، گرنیای، پژاندن، پلپخاندن، کەلهاندن.
**سلك:** بڕوانە (سلف سلفان).
**سلك:** پلووسک، لووساووک، سوولاووک.
**سلك (ج) أسلاك:** (١) رشتە، رستە، کشتەک، بەند، رستەک، دووماهک، رستک. (٢) دەزوو، مەچیر. (٣) تەل، تێل.
**- أسلاك المقاومة:** تەلی بەرهەڵستی.
**سلك:** هۆنین، هۆنینەوە.
**سلك حديدي:** تەل، تیل، سیم.
**سلك شائك:** ئاسندڕک، دڕک ئاسنینە.
**سلم سلاماً:** ڕزگاربوون، قوتاربوون، دەربازبوون، ساخ دەرچوون
**سلم:** هێوەرە، ئاشتی، ئارامی، وەرم، تەوتین.
**سَلَم:** دارەشیلان.
**السلم (رحم الحيوان):** پاوور.
**سَلَم:** (١) بەسەر، ڕیێدە، سەلەم، ڕوبێدە، مردە، سووت. (٢) کڕین و فرۆشتنی دەخڵ و دان. (٣) خۆ بەدەستەوەدان، گیران

**- إعطاء السَلَم:** بەسەردان.
**سلم (ج) سلالم:** نەردیوان، پەیژە، پێ بلێقە، نێردیوان، سەردووک، پێ پیلکە، پێ پلەکان، پاچینە.
**السلم الخشبي:** پێ پیلکە دار، پەریز، پاپیلکە، پەیجە، سردی، سترد، پیسی برک، پێ پەلاس، پێگەهـ، سەردووک، مەردیوان
**سلم نقالي:** پەیژە، نێردیوان.
**سلم القياس العددي:** پەیژەی پێوانی ژمارەیی.
**سلم (عليه) تسليماً:** شەگگەی لێ کرد، ڕۆژباش و شەوباشی لێ کرد، فەتال و فەلات کردن.
**سلمى:** ناوی ئافرەتانە، مارمێلکەی سپی، ناوی هۆزێکی عەرەبانە.
**سلهب:** درێژ، بڵند (بۆ مرۆڤان و یەکسمان).
**سلوان:** بەرد یا مۆرێکە کە بۆ چاو و زار هەڵدەگیرێ.
**سلوة:** خۆشی و شادمانی، ئارامی و دڵنیایی.
**سلوقي:** بڕوانە (سلاقي).
**سلوك:** ڕێگا ڕۆیشتن، ڕەفتار، شێوە، ڕەووش، سینچی، ئەدا، ڕەووشت، شێوە، جر، هیم، نەریت، ڕەویەت، خوو، کردار، بانەک، پرەنگ.
**سلوك جيد:** خۆشخوویی.
**سلوك رديء:** خووی خراپ، خووی گەند.
**- حسن السلوك:** ڕەوش باش، خۆشخوو.
**- سيء السلوك:** بەد ڕەوشت.
**سلوى (ج) سلاوي:** (١) شلاقە، شیلاقە (باڵندەیە). (٢) هەنگوین، هەنگڤین، هنگڤی، کاریت، گەزۆ. (٣) گەزۆ، شۆک.
**سلى:** پزدان، پزدانک، منداڵدان، پسدان، دەولیباز، پزان، یاوەرە.
**سليب:** هۆش براو، ماڵبراوە، ژن یا وشتری بێچوو مردوو.
**سليس:** نەرم و ڕێک.
**سليط:** زمان پاراو، مرۆی زمان درێژ.
**سليطة:** ئافرەتی زمان درێژ و زمان پیس.
**سليقة (ج) سلائق:** سەلیقە، نهاد، سرشت.
**السليقة:** شۆرباوی گۆشتی، گۆشتاو، ئاو گۆشت.
**سليكون:** سلیکۆن.
**سليل:** (١) شیر لە کالاتی هێنانە دەر. (٢) کوڕ، کوڕک، قلووس، زا، زادە.
**سليلة:** کچ، کیژ، دۆت، کەنیشک.
**سليم:** ساز، ساخ، بێ ڕووشە، دروست، ساق.
**سليم البنية:** لەش ساخ، تەندروست.
**سليماني:** سلیمانی (دەرمانێکی ژەهرە لە جیوەی وەردەگیرێت)

**سم (ج) مسام:** (۱) کونە وردەکانی پێستی لەشە. (۲) کونی دەرزی و سووژنی.

**سم:** کونی دەرزی و سووژنی.

**سم (ج) سموم:** ژەهر، ژار، ئاغوور، زار، زەهر، ژەحر.

**سم الحية:** ژەهری ماری، ژەهرەمار.

**سم السمك:** ژەهرەماسی، ژارماسی.

**سم الفأر:** مەرگەمووش.

**السم القاتل:** ژەهری هەلاهیل، ژەهری کوژندە.

**سم الهلاهل:** ژەهری هەلاهەلا.

**سماء (ج) سماوات:** ئاسمان، فەلەک، چەرخ، گەردوون، چەپگەر.

**- كبد السماء:** کەشکەشانی فەلەک.

**- سبع سماوات:** فیست.

**سماجة:** ناشیرینی، بێ شەرمی.

**سماح، مسامحة:** هێلان، خۆشبوون، لێبووردن، چاوپۆش، دەقساندن، قان.

**سماحة:** خێرخوازی، پایەبەرزی، جوامێری، کارچاکی، بەخشندەیی، بەخشش.

**سماخ، صماخ (ج) أصمخة:** کونی گوێ.

**سماد:** پەین، زبڵ.

**السماد الحيواني:** پەینی ولاخ و ئاژاڵان، ئاژەڵەپەین.

**سماد كيمياوي:** پەینی کیمیایی.

**- الأسمدة الخضراء:** سەوزەپەین، پەینی سەوز.

**السمارة:** سی و جیگەر، جەرگ و دڵ.

**سماط:** (۱) سفرە، خوان، سەخردان، پێدەکەر. (۲) بەرە، پۆل

**سماع:** بیستن، گوێدان، گوێ لێبوون، شنەفتەی، بهستن، شنەفتن، ژنەفتن، شنەوتن، ژنیەن، ئەژنەفتن، ئەژنەوین، خرچاندن، ژنەوین.

**سمّاع:** بیستەر، زۆر بیستەر.

**سماعة:** (۱) دەنگەر، مرازێکە هێزی بیستنێ پتر دەکات، مایکرۆفۆن. (۲) تەلەفۆن، دوورەژنەو، بیستۆک.

**سماعة التلفون:** کۆشی دوورەژنەو.

**سماعي:** دەماودەم، گووێ بیست، ژنەویاگ، ژنەفتی.

**سُمّاق:** سماق، ترش، تورش، سڤۆک، تونم.

**سمّاك:** ماسی فرۆش.

**سماك:** ناوی دوو ئەستێرەی رەوشەنە لە ئاسمانێدا.

**سَماكة:** ئەستوورایی

**سمّان:** رۆنگر، رۆنفرۆش.

**سمانة، سماني:** هەوێردە، کەرەواڵە (باڵندەیەکە).

**سماوة:** پەردەی پێشدەرگای حەوشێ، هەیوان.

**سماور:** سەماوەر، سەماڵاوەر.

**سماوي:** ئاسمانی، ئەزمانی.

**سمباذج:** سماتە.

**سَمت:** رێگا، لا، تەنیشت.

**سِمت:** شوێنی داخ، نیشانە، ناوونیشانە.

**سَمت الرأس:** لە زاراوەی (هیئة)دا نوختەیەکە لە ئاسمانێ کە مرۆ تەماشای کات لە سەر سەرەوەی وییە.

**سمة:** نیشانە، قەرە، شەقڵ.

**سمة:** لاسەرە.

**سمح سماحة:** لێبوورین، لێبووردن، چاو لێ پۆشین، چاو لێ قووچاندن.

**سمح بكذا:** چاکەی لەگەڵ کرد.

**سمح له بالشيء:** داییێ، بە چێتێکی چاو لێ پۆشی.

**- لاسمح الله:** خودا نەخواستە، خولا نەخواستە، خوا نەکا، خودا نەکردە.

**سمر (ج) أسمار:** (۱) شەو، تاریکایی شەو. (۲) چیرۆک، سەربردە، ئەفسانەی شەوێ، بەسەرهات.

**سُمرة:** رەنگ گەنمی، گەنمی، گەنم رەنگ.

**سمرة:** شەوارە، شەو رابوێری.

**سمرة ما يؤكل ليلاً:** چەرەز، شەوچەلە.

**سمرمر:** ئاهەمەلۆچ، ئاپتەر، ئاینەمەل، تۆوخۆر، باڵندەیەکی کوللە خۆرە.

**سمسار (ج) سماسرة:** دەلال، جانباز، جامباز، کەسێکە لە نێوانی دوو یا چەند کەساندا کار بکات.

**سمسار القرية:** گزیر.

**السمسارة الخاطبة:** قەلاووز.

**سمسرة:** کۆستەکی، دەلاڵی.

**سمسم:** کونجی، کتاڤ، قونجی، شەیدانک.

**سمسمة:** گەنەمۆری، گێرگە، وردە مێروولە.

**سمط:** بەرموور، ملوانە، ملوانک، گەردانە، گوتەمر، خەناوکە، خوناوکە، رشتە.

**سمط المهد:** گەلازە.

**سِمع:** فەرخە گورخ.

**سَمع (ج) أسماع:** هێزی بیستن، بیستن، گوێ.

**السمع:** بیستن، ژنەفتن، شنەفتەی، بهستن، شنەوتن، ژنیەن، ئەژنەفتن، ژنەوایی، ئەژنەوایی.

**سمع (ج) مسامع:** گوێ.

**خفيف السمع:** گوێ سووک.

**سمعة:** دەنگ و ناو، ناوبانگ، دەنگ و دۆر، فاک و فیک.

**- سيء السمعة:** بەدناو، ڤنۆ.

- **سوء السمعة:** بەدناوی، ڤنۆیی.

**سمعية:** بۆریی گوێچکەیە.

**سمك:** ئەستوورایی، ئەستووری، پۆز، گێپەرە.

**سَمك (ج) أسماك:** ماسی.

**سمك أحمر:** سوورەماسی.

**سمك بني:** خرسوورە، ماسیی قاوەیی.

**سمك قطان:** قاشەماسی.

**سمك ضخم:** نەققە.

- **فلوس السمك:** پوولەکەی ماسی.
- **بويضات السمك:** گەرای ماسی، ولتە.
- **الأسماك الرئوية:** ماسییە سیدارەکان.
- **الأسماك الغضروفية:** ماسییە کرکرکەدارەکان.

**سمل:** کوێرکردنی کەسێکی، پاک کردنەوەی حەوز، لە نێوانی خەڵکیدا ئاشتی کردن.

**أسمال ممزقة:** ڕیندۆڵ.

**سمن:** قەڵەوی.

**سِمن:** ڕۆن، ڕۆنی زەنگ، تەواش، ڕوون، تاوتی، بۆ، دۆن.

**سمنت:** چیمەنتۆ.

**سمنجوني:** سەماگونی، ئاسمانی ڕەنگ، ئاسمانی.

**السمندر:** سەمەندەر.

**سمو:** پایەبەرز، نێودار، ناودار، سەروەدەر، نێو دەرکەوتوو، بالا.

**سموح:** چاوپۆش، بەخشندە.

**سمور:** سمۆر، سمبۆرە، سەڤۆریی، سڤووریی.

**السمور الأبيض:** قاقوم.

**سمور:** ڕووژە (ئەلماس).

**سموم:** بای گەرم و کوژندە، سەبوون، شەرا، ورە، بای گەرم و ژەهراوی، ڕەشەبا، هورە، ئاوپەز.

**سموم الحر:** گرە، گرەبا.

**السموم الحارة:** گرە، گرەبا.

**سمي:** نێوبردن، ناوبردن، ناڤبرن.

**سميّ:** هاوناو.

**سمير:** ئەفسانەبێژ لە شەوێدا.

**سميراء:** ئافرەتێکی گچکەی ڕەنگ گەنمییە.

**سميرة:** دێغ، خەت، نووسراو، خەتێکە لەسەر زەوی یا قاقەز بکێشرێ.

**سميط:** بریانی، نیوە برژاو.

**سميع:** گوێگیر، بیستەر، گوێ ڕاگر، شنەوا، ئەو کەسەیە کە دەبیسێ، ژنەوا، ئەژنەوا، بیستەر، بیسەر.

**سميق النير:** کەڵەمە.

**سميك:** ئەستوور، ستوور، قەوی، تیر، قانج، هەقەتی، کانە، کە، ج، کوڵوفت.

**سمين:** (۱) قەڵەو، چەور، تێر دۆن، سێروونی، چاخ، گلوول، بەزدار، تێر بەز، پڕ خەز و بەز، دێمگر. (۲) گۆشتن، پاسۆتی، گیپش، خیپشنە.

- **قصير السمين:** پانۆڵە.

**سن سنأ:** سوونەوە، تیژ کردن، لە چەرخ دان، سوون، سووتن، ساودان، سامرین، ماڵشتدان.

**سن (ج) أسنان:** ددان، دران، دگان، دان، دیان.

**سن العقل:** ددانی حەوتساڵی.

**سن قاطع:** برۆک، بڕەک، شیلە.

**الأسنان الأمامية للدوات الحافر:** ناوێژە.

**الأسنان الدائمية:** ددانی هەمیشەیی.

**الأسنان المؤقتة:** ددانی شیری، ددانی زووکەوت.

**سن مسوّس:** ددانی کرمی.

- **تضارب الأسنان من البرد أو الغيظ:** دانەڕسکێ، ددانەچیرە.
- **وجع الأسنان:** ددان ئێشە.
- **طبيب الأسنان:** پزیشکی ددانان.
- **مركب الأسنان:** ددانساز.
- **عدم إنتظام الأسنان:** ددان سرک، نەخۆشییەکی مالاتانە.

**سن:** سن، سوون، یەکێکە لە زیندەوارە زیاخرۆکانی دەغڵودان.

**سِن:** تەمەن، ژیی، سیرە، ڕست.

**سن نظامي:** تەمەنی دەستووری، تەمەنی یاسایی.

**سنة واحدة في سن الكلب:** مەرازە.

**سناء:** سینامەکی.

**سَناء:** ڕووناکی، ڕۆشنایی.

**سناج:** دوودەی چرا و ئاگر و ئیستر، هیس، تەن، تەنی، ڕەژەن، زفیر، سەفیر، قورم، دووکەڵژەن، فیر، دوورنج.

**سناد الكرم:** قایەی مێوێ، ماهشەل.

**سنام (ج) أسنمة:** دووگی پشتی وشترانە، کۆپانە، کۆپارە، پیمنەک.

**سنامك:** سینامەکی.

**سنان (ج) أسنة:** سەری نێزە و ڕمب و تیر و هەموو چتێکییە کە تیژ بێ.

**سنان الرمح:** چز.

**سنباذج:** سماتە، هەسان، سەوتان، هەستان، ئەسان.

**سنبك (ج) سنابك:** کەناری سمی ئێستران، سەرەتای چتی، زەویی سەخت و کەم سوود.

**سنبل:** سمڵ، سۆتکە.

**سنبلة (ج) سنابل:** (۱) گوڵە گەنم و ئیستر، وەشی، هووشە، هۆشە، وشی دەخڵ و دان و ئیسترە، ئووشی. (۲) مانگی شەشەمە بە پێی ژمارپاریی بورجان.

**سنبلة القمح:** گوڵە گەنم.
**- أهداب السنابل:** قـەڵاس، قـەڵچخ، قـەڵداس، قـەڵداسـوو، قڵچغ.
**- لاقط السنابل:** وشی چن، وشی کار، هێشوو کار، گوڵچن.
**سنبوسة:** کەلانە، کێلانە.
**سُنَّة (ج) سنن:** ڕێگا، ڕەوش، خوو، شێوە، سرشت، سیرەت.
**- أهل السنة:** ئەو دەستە موسوانانەیە کە بەخەلافەتی ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان قایل بوون.
**سنة (ج) سنوات، سنين:** ساڵ، وەرز، وەند، خرت.
**سنة بسيطة:** ساڵی سادە.
**سنة التوجيه:** ساڵی ئاراستەکردن، ساڵی ئاراستەیی.
**سنة جدبة:** ساڵێکی وشک.
**سنة خصبة:** ساڵی خۆش و پڕ پیت.
**- دوران السنة:** ساڵ گەڕانەوە.
**السنة القابلة:** ساڵێکی تر، ساڵی دوایی، ساڵی داهاتوو.
**السنة القادمة:** ساڵێکی تر، ساڵی دوایی، ساڵی داهاتوو.
**سنة كبيسة:** ڕۆژێک خستنە سەر مانگی شوباتییە لە چوار ساڵاندا جارێکی، ساڵی پڕ.
**السنة الماضية:** پار.
**السنة الميلادية:** ساڵی بوونی.
**السنة الهجرية:** ساڵی کۆچی.
**- نصف السنة:** نیوساڵ، نیڤ ساڵ.
**- دوران السنة:** ساڵ سووڕانەوە.
**- رأس السنة:** سەر ساڵ، سەری ساڵ.
**- إتمام السنة:** ساڵ بردنە سەر.
**سنتين:** دوو ساڵ.
**- قبل سنتين:** لە پێش دوو ساڵاندا.
**- قبل ثلاث سنوات:** بەسەر پێـرار، بەتر پێـرار، لە پێش سێ ساڵاندا.
**سِنَة:** وەنەوزە.
**سَنج:** چەنگ، وازی شایلۆغان و بەزمێیە.
**سنجاب:** مشکی دارە خورمایە.
**سنجابيّ اللون:** بۆر.
**سنجر:** سەنگەر، سنگر، سیپە، حەشارگە، شاردنگە، مەتەرێز، تابیە، پارێزگا، وەشارگە، خەندەک، خەندەق، دژ، قەڵا، قوللە
**سنجق (ج) سناجق:** ئاڵا، بەیداخ.
**السنخ (ج) سنوخ:** ڕیشە، تەوە، ڕەگ و ڕیشە
**سند (ج) أسناد، مستند:** قـۆچان، کـۆدە، قـەواڵە، قـاقـانی، دەستاوێژ، چاخ، چاک، چەک، قەباڵە، سەرجەلە، نووسراوێکە قەرز و یا کێشە و بڕیارێکی تێدا بەئاگاداریی چەند کەسان تۆمار کرابێت.
**سند سنوداً:** پاڵ وێدان، پشت پێ بەستن، پشت پێ قایم بوون.
**سندان الحداد (ج) سنادين:** سندانی ئاسنگەران، مـێخ سندان، زنان، زندان.
**سندروس:** کانێکە وە کارەبای دەچێ.
**سندس:** ئاوریشم، جـۆرە پارچەیێکی ئاوریشـمـییـە و ئاسکە لەمەوپێش لە (سندوس)ێ دروستکراوە، ئاوریشمی سەوزە.
**سندويج:** بابۆڵە، باڵۆڵە.
**سنديان:** بەڕوو، بەری دارەبەڕووییە.
**سنطور:** سەمتوور، مرازێکی ئاهەنگ و بەزمێیە.
**سنف:** (١) دەستـە، گەل، کۆ، کەلوو، کەلی، تێکوڵی پۆڵکە و بەری هەموو گیایەکییە. (٢) پۆڵکە، کەلی، شۆڤل، قەلۆکە، ولێرە.
**سنقر:** شمقار (باڵندەیە).
**سنوت:** زیرە.
**سنوح الفرصة:** پەرژان، پەرژیان، هەڵکەوتن، هەڵدەسکەوتن.
**سنور (ج) سنانير:** گوریە، کتک، پشیلەی نێرە.
**سنوط:** کۆسە یا کەسێکە تەنها چەنەگەی مووی لێ هاتبێ.
**سنون الكلب والخنزير وغيرهما:** کەڵب.
**سنونو:** کـاردەپەلە، باڵـتی سـوورە، چەورۆکـە، باڵندەیێکە وە پەرەسلێرکەی دەچێ.
**سنويّ، سنوية:** ساڵی، ساڵانە، ساڵیانە، ساڵبڕ.
**- الإنتاج السنويّ:** بەرهەمی ساڵانە.
**- الطاقة السنوية:** ساڵە وزە.
**سَنِيّ، سَنيّة:** بەرز، پایە بڵند.
**سُنّي:** سوننی.
**سنيع:** شل و مل.
**سنيف:** کەنار، لاکێش (ڕایێخە).
**سُها:** ئەستێرەیەکە.
**سهاد:** کەمخەوی.
**سَهام:** گەرمای سەخت.
**سهب (ج) سهوب:** دەشت.
**سُهد:** بێ خەو، کەمخەو.
**السهر:** بێداری، خەوزڕان، شەونخوونی.
**السهر الى الصباح:** سبەینەکردنەوە.
**سهران:** شەو بێدار، شەڤناتووروان، وریا، بەئاگا.
**سهرة:** شەوارە، شەو بێداری، شەوبێری، هەزارە، شەونشینی، شووارە.
**سـهـر الليل:** شـەوارە، شـەو بێـداری، شـەوبێـری، هەزارە، شەونشینی، شووارە.
**سهك:** کەڵیشە.

**سهل سهلاً:** سانابوون، ئاسان و سووک بوون.

**السهل (ج) سهول:** (١) ئاسان، سانا، سووک، شیتان، هەدار، هاسـان، گـەڵگاز، گـانگاز، خـۆشی بێ ئەرک. (٢) دەشت، پیدەشت، پادەشت، نەرمان، تەختان.

**سهل العبور:** ئاسانڕۆ.

**السهل الممتنع:** هەڵبەستێکە بیستنی ئاسان و دەربڕینی دژوار بێت.

**سهل الوصول:** ئاسانگەییو.

**السهل المنبسط:** کرک.

**– أرض سهل:** دەشتانی، دەشتایی.

**سـهم (ج) أسـهم، سـهـام:** (١) تیـر، بەشت، تەخش، پش، پەیکان، تیـراسـا (لە فـیـزیکدا). (٢) بەش، پش، جـوون، بەرە، قەت، پشک، قسن، ملە، بیەش، بەهرە، بژە.

**سهم السقف:** داری دارەڕایە.

**سَهَم:** بەرخی ساوا.

**السـهـو:** (١) بەهەڵەچوون، هەڵەکـردن، لەبیـرچوولیـان، بەسەرچوون، لەبیرکردن، فەرامۆشکردن، هەڵبواردن، پەشۆکان، لەسەرچوون، بواردن، سەرداچوون، لە دەم دەربەڕین، جووریان. (٢) هەڵە، خوێژنگ، چەوتی.

**سهواً:** هەلون.

**سهولة:** ئاسانی.

**سهولة:** ئاسانی، سانایی، هێسـاهی، گانگاری، سانیلکۆلکە، ئاسان بوون، ساناهی، هەداری، نێسایی، هێساهی.

**سهيل:** سیوەیل: ئەستێرەیەکە لە مانگی تەمووزێدا هەڵدێ

**سهيل اليماني:** گەلاوێژ

**سهيم:** بەشبەر، بەشدار، هاوبەهرە، هاوبەش

**سوء (ج) أسـواء:** گـەندی، خـراپی، خـراوی، بەدی، خـراپە، نەبانی، گەندەژەیی، پیسی، چەپەڵی.

**سوء السمعة:** بەدناوی، ڤنۆیی.

**سوء التغذية:** بەد خۆراکی.

**سوء العاقبة:** دوارۆژ ڕەش.

**سوء الحال:** ناخۆشی.

**سوء القلب:** بەدنیـهادی، دڵ و دەروون گەندی.

**سوء الحظ:** بەدبەختی، چارەڕەشێتی، بێ هێری.

**سوء الظن:** بەدگومانی، تارینێری.

**سوء اللسان:** بەدوێژی. بەدگۆیی.

**سوء الهاضمة:** تەبعی، لێمان.

**سوء الهضم:** دەوا، تورخە، گەندی، هەپروون، تەبعی.

**سوء الهاضمة:** دڵ پێکاهاتن، تێکچوونی چیکڵدانە.

**اقتراف السوء:** بەدی کردن.

**سَواء:** ڕاست، نێوەڕاست، دروست.

**سِواء:** جگە، بێجگە، بێ لە، بێژگە.

**سَواد:** ١ ڕەش، ڕەشانگ، تارمایی، ڕەشایی، سیایی، ڕەشانگ. ٢ ماڵ و سامانی زۆر، دەوڵەتی زۆر.

**سواد العسكر:** ڕەشائی و ڕەشایی لەشکر.

**مسودة:** ڕەشەک، ڕوونووسی.

**سواد العين:** ڕەشکێنەی چاو، ڕەشێنەی چاو.

**سؤر:** پاشاو، پاشماوەی ئاو لەناو قاپ وەیا پاشماوەی خۆراک

**سؤر الدابة:** پاش ئاخوڕ.

**سِوار (ج) أساور:** بازنە، بازبازک، بازبەند، لانگیر.

**سِوار القدم:** خرخاڵ، خلخاڵ.

**سواف:** گاڤر، گاڤران، مشە، نەخۆشی ولاخانە.

**سواك:** سیواوک، ددان پاکەرەوە.

**سؤال:** ١ پرس، پرسیار، پرسین. ٢ دەرۆزە، سوواڵ، گەدایی.

**– حل السؤال:** لێکدانەوەی پرسیار، شێکردنەوەی پرسیار.

**السوانية:** دارەسمە، دارە تەقێنە (باڵندە).

**سـوداء (المرض السـوداء):** ١ سـەودا، والامـەن، والامـەنی، نەخۆشی، خولیایی. ٢ ڕەش (بۆ مێینیە).

**سور(ج) سوار:** شوورە، سـوور، شوورەی دەوری شـاری و نیـڤ، پەرژین، شووری گۆڕستان.

**سور من سلك:** تێل بەند، تەل بەند.

**سورة (ج) سور:** هونەر، پایە، پارچەیەکە لە پەرتووکان.

**سورنجان:** سۆرنجان (گوڵ).

**سوس:** مێکووک، بەلێ، حێزم، بەلەک، بەڵک، شیرشیرنۆک.

**سوس وسوسة:** مـۆرانەی خوری و ئەسـپـێی گـەنمیـیـە، مۆرکـە، مۆریانە.

**سوس الزرع:** ژەنگ، سن، پشی.

**سوسن:** سۆسن، سوێسنە، گوڵسووس، گوڵە سوێسنە.

**– عرق السوس:** بنەبەلەک.

**سوط (ج) سياط وأسواط:** قاچی، تاژانک، شـەلاخ، قەمچی، شوللاق.

**سوغان:** غـاردانی ئەسپ یا وشـتـر لە دووی یەکـتری، غـاردان و وەرزش پێکردنی ئەسپ بۆ پێشبڕکەی.

**سوف:** لەممەودوا، لەمەولا، لەپاشان، لەدوایە، پاش.

**سوفان:** ولای.

**سوق (ج) أسواق:** بازاڕ، باژێڕ.

**سوق مشتركة:** بازاڕی هاوبەش.

**سـوق:** ئاژۆتن، هاژۆتن، ژەنین، شـوا، کـووداندن، ژەنن، لێخوڕین، ژەندن، ڕانان، ڕاناندن، ئاخاوتن، قش لێ کرن، ڕانین، ئاخێوتن، ڕانن.

**سوق الجيش:** سپارانی، لەشکرکێش.
**سوق الغنم:** رادان، قش لێ کردن.
**سوك:** لێ خستن، ئاژنینەوە.
**سولع:** گووژاڵک، شەویار.
**سوم:** سەودا، مامەڵەکردن.
**سوم المواشي:** چریان، لەوەڕین.
**السونة:** سن.
**سوى:** جگە، بێجگە، بێ لە، بێژ، بەدەر، ژبل، بەرلەوە، بێ ئەوە
**- ماسوى الله:** هەموو گیانلەبەر و چتێک جگە لە خوا.
**سوى م سوية:** بەرامبەر، وەکوو یەک.
**سوى سوىً:** بەرامبەر بوون.
**مساوٍ:** هاوسەنگ، هەمبەر.
**سويداء:** دانە، نوختەی رەشی دڵ، دانە و نوختەی سپڵە. ٢- سەودا، ماخولیایی.
**سوية (ج) سوايا:** بەرامبەری، زانەوێر، ڤێک، ڤێکرا، کەمێچک، بهەڤ، پەڤ، پێکەوە، بەیەکەوە، پێکرا، دگەل هەڤ دوو بە دوو، دەگەل یەک، دەگەڵ یەکتری.
**سوية علمية:** زانەوێری زانیاری.
**سويق:** قاووت.
**السويق:** کاویت، لاسک.
**السويق تحت الورق:** ژێر پەلکە، لاسکۆڵە.
**سيء (م) سيئة:** گەن، گەند، دش، خرا، نەباش، نەچێ، گەندۆ، خراو، خراپ، دژ، دشت، زار، بەد، زرب.
**سيء السمعة:** بەدناو، قنۆ.
**سيء الحظ:** چارە رەش، پۆڕ کوور.
**سيء العاقبة:** دوارۆژ رەش.
**سيء الخلق:** پلمەڕوو، نەما چل، بلچ، بەدخوو.
**سيء الطبع:** بەدخوو.
**سيء الظن:** بەدگومان، دڵپیس، دڵچەپەڵ.
**سيء السلوك:** بەدخوو، بەدڕەوشت.
**سيء اللسان:** بەدگۆ، بەدوێژ.
**سيء النسب:** بەدڕەسەن، بەدڕەچەڵەک.
**سيء الهاضمة:** تەبع.
**سيء القلب:** بەد نیهاد، دڵ و دەروون گەند، دڵپیس، دڵچەپەڵ، بەدگومان، دڵکرمۆڵ.
**سيئان:** ڕشک، گەرای ئەسپێ و ڕشکان.
**سيئة (ج) سيئات:** کاری خراپ، کردەوەی گەند و وێنەچوو، نەباش.
**- عادة سيئة:** خووی خراپ.
**سياج:** پەرژین، تەیان، پەرچان، تان، تانۆک، چیلە، پەرژان.
**سياج الحدائق:** تانۆک، پەرژین، هەتان، هۆلک.
**سياج الدار:** شوورەی ماڵ، شوورەی خانوویەرە.
**سياج المقابر:** غەڵ.
**سيّاح:** گرۆک، گەڕیدە، گەڕانۆ، ڕاتوول، لەگام، ڕیتاڵ، بگەڕ، گەڕندە، پێگەرمۆک، چەرخەچی، فرەگەڕ، جیهانگەڕ، سەگسەگە، شارانگەڕ، گەڕانۆ، ڕێوینک، ڕیتاڵ، زۆر گەڕ، کێفگە.
**سياحة:** گەڕان، چەرخین، گەڕهان، گەریان، گەشگە، گەشت، شەلخین، سەیران، پێ گەرمۆکی، چەرخین، ڕاتوولی، ڕێوینگی، ڕیتاڵی، سەگسەگێتی، سەیر، سەیران، گەردش، گێل، لا گەشت، سەری خووەگەڕاندن، سەیرانکردن، پێ گەرمۆک، گەشت، گێلی.
**سيادة:** گەورەیی، سەرداری، سەروەری، ئاغایی، کەلانتەری، سالاری، مەزنی، ئاغایەتی، پایەبەرزی، مەزناهی، یەکمانی، خاوەند گەورەیی.
**سيار:** گەڕیدە، گەڕۆک، سوورخۆر، زۆرگەڕ.
**سيارة (الكواكب السيارة) (ج) سيارات:** ئەستێرە گەڕۆکەکان، ئەستێرە ١- گەڕیدەکان، سیارات السبع: بچم، ڕەوان. ٢- خشۆک، پێفرک، خۆڕۆ، گەڕۆک، کارامە، بەزۆک، خۆشبەز، خۆشبەزۆک، خۆشڕۆ (ئۆتۆمۆبیل).
**- إطار السيارة:** تایەی ئۆتۆمۆبیل.
**سيارة مدرعة:** خۆڕۆی زرێدار.
**- سائق السيارة:** ئاژوەر، لێخوڕ، بروانە (سائق السيارة).
**سيّاس:** بروانە (سياسي).
**سياسة:** ١ رامیاری، پلان، کەمێیی، پیلان، هووردە، بە هووردەیی، دۆلاب، خەڵک، بەند، زرنگکاری، ڕێکخستن خەڵک (سياسة) بەنیشاندانی ڕێگای رزگاری و سوودی گەل و وڵات. ٢ تەگبیر.
**السياسة الدولية:** پلانی دەوڵەتی، پیلانی میری.
**سياسة مدنية:** تەگبیری زیندەگانی لە تەک هەموو لایەکیدا لە ڕێگای داد و ڕاستیدا.
**سياسي:** رامیار، زرنگکار، کەمێ، بەرگر، بەهووردە، پلانزان، بەدۆلاب، خەڵکمەند، دووهووردە.
**- توازن السياسي:** لەنگەری کەمێیی.
**- طين السياع:** کاپۆل، قوری قوڕکاری.
**سيّاف:** شیروەشێن، شیرلێدەر، شیرگەر.
**سياقة:** ئاژووتن، لێخوڕین، دانەبەر (پیشەوکردەوەی ئاژۆتن) وەبەردان.
**سياقة السيارة:** خۆشڕۆ ئاژۆتن.
**سياقة السفينة:** کەشتیوانی.

**سياقة الفدان:** جووتياری، جووتێری.
**سيّال:** زۆررەوان، ئاو و شلەمەنی ڕەوان.
**سيب (ج) سيبي:** داموسكی.
**سيجارة (ج) سجاير:** سيغار، جغارە، جگەرە، جگارە، سيگار.
**- نفاضة السجاير:** ژێر جغارە.
**- علبة السجاير:** قوتووی جگەرە.
**سيح، سيحية:** بەراو.
**- زراعة سيحية:** كشتوكاڵی بەراو، بەراوەكێڵ.
**سيد (ج) سادة واسياد:** ئاغا، گەورە، سەردار، سەرۆک، مەزن، سالار، خان، سەرەک، سەربیان، یەکمان، سەراکت، سان، باخوی، کاک.
**سيد (اولاد النبي):** باوەڵێ.
**سيد (ج) سيدان:** گور، گورگ بروانە (ذئب).
**سيدة (ج) سيدات:** سەلارە، سەلارێ، یایێ، خات، خانم، ئاغاژن، کەیبانوو.
**- كالسيدات:** یایانە.
**سيدة البيت:** کابان، کەیبانوو.
**سير:** بەڕێگایە ڕۆیشتن، گەڕان، سووڕان، سەڵخین، گێلان، ڕەوت، گەردش، گەردوخول، گەرهان، گێل، ڕێگەبڕین، بەڕێگایەدا ڕۆیشتن.
**- سرعة السير:** گژە، تیژ تێپەڕین، تیژڕەوت.
**- سر:** برۆ، بچۆ.
**- عادةً سر:** لەسەرخۆ برۆ.
**سيرة (ج) سير:** ڕێڕەو، ڕەوشت، خوو، هیم، کردار، تویزم، کرشە، ڕەفتار، ژینامە، بەسەرهات، سەربردە.
**السير ليلاً:** شەوڕەوی، شەوڕۆیی.

**سيرة حسنة:** خۆشخوویی.
**سيرة الرجل:** ڕەوشتی مرۆ، ڕووپەڕەی کرداری پیاو.
**- متساوي السير:** هاوپا.
**سيساء:** موورەغەی پشتی، بڕبڕەی پشتی، مازی
**سيسبان:** تەروو، کفر (دارە).
**- شجرة السيسبان:** کفرجاڕ.
**سيطرة:** دەستەلات، ڕاسەر، کەلیژ، دەسەلات، زاڵی، دەست بەسەرداڕۆیشتن، زاڵبوون، زەبروزەنگ، ڕکێف، دەست بەسەرداگرتن.
**- ذو سيطرة:** بەدەستەلات، زۆردەست.
**سيف (ج) سيوف:** شیر، شوور، شمشیر (چەک).
**سيقان الحشيش:** لاسک، قاسک، هوورە، ساپ.
**سيقان زاحفة:** توولە، لاسکی خشۆک، قەدی خشۆک.
**سيقان القرع:** تەرز، کوولەکە، توولە بڕکەی کوولەکە.
**سيقان النباتات الجوفاء:** قالۆر.
**سيل (ج) سيول:** سێلاو، لافاو، تیژاڤ، لەهی، پووکن، لێمشت، شەس، تیژاو، لاخێر، لێشاو، لاسان، لاشاو، لێزماو
**سيل بشري:** لێشاو (جوغرافيه).
**سيل الالكترون:** لێشاوی ئەلەکترۆن.
**السيلان:** سووزەنەک، ڕەوانبوون.
**سيّما:** نەخوازەلا.
**سيماء:** ئادگار، سەروسەکوت، سەکوت، شێوەی مرۆڤان، دیمەن، شکڵ.
**السينما:** سینەما.
**سيولة:** شلێتی، شلی.

# ش

**ش:** پیتی سێزدەمینی ئابێی عەرەبییە .

**شأ:** کسە، کسسە، کسس.

**شأشأ:** وەشەوەش، وششە، بۆ گێڕانەوەی گوێدرێژان بەکاردەبرێت

**شائب (ج) شوائب:** پیر، کەهل، زاڵ، سەرسپی، پۆرسپی، ڕیش سپی، سەر، کاڵ.

**- شوائب:** خلتە، گرک.

**- الرجل الشائب:** پیرەمێرد، کەڤنەدار.

**- الشائبة الصفراء في العين:** زەردەپەڵە.

**شائع:** ئاشکرا، بڵاو.

**شائق:** ئارەزوومەند، بەهەوەش، بەشەوق، مرێکار، خوێن کەڵ.

**شائكة:** دڕکاوی، نووکن، چقڵاوی، دڕواوی، گرز، دڕکینە، نووکدار.

**شاب (ج) شباب و شبان:** لاو، جحێڵ، گەنج، خۆرت، کاڵ، کاڵ، نەوهال، لاڤ، نۆچ، هەرزە، هەرزەکار.

**شاب المريخ:** لۆتی.

**شابة:** گەورە کچ.

**شاة:** سپیان، لەڕ چە نێر بێ و چە مێ، مەڕ و بزن.

**شاجر مشاجرة:** بەربەرەکانی، ڕقەبەری، دەمەتەقێ، پیلەگرتن، دەمەقرێ، دووگورزە، ڤەپژلاندن، پیلەبازی، داروگیر، ڕاهشتی، هەڤ، شەڕ بەرپاکردن.

**شاحب:** کاڵ (ڕەنگ).

**شاحب اللون:** پووت، ڕەنگ پەڕیو، نزار، ڤەمرتی، کاڵ.

**شاخ شيخاً:** پیربوون، بوونە مەلا، بوونە سەرۆک.

**شاخص:** زاق، چاوزەق، واق، چاوکراوە، کەسێکە چاونەقوچێنێ، قیت، قندر، گت، زەق، قووچ، ئامرازێکە لەپێش ڕۆژێ دادەمەزرێ بۆ دیاریکردنی کاتی نیوەڕۆیە، هەڵبژێراو، هەڵاوێردراو.

**شاد شيداً البناء:** بڵند کردن، لێ هەڵخستن.

**شاد شيداً الحائط:** سواخدان.

**شادن:** کارمامز، بێچووە ئاسک، شەمکۆ.

**شاذ (ج) شواذ:** تاک، تەنیا، ناوێزە، ناوێژە، هەڵکەوتوو، نەبیستوو، نەبهیستی، کەم هەڵکەوتوو، هەڵکەوت، هەڵکەفت.

**شاذ غير اعتيادي:** ناوێزەی نائاسایی.

**شار (ج) شراة:** کڕیار، بکڕ، سەنیار، داخواز.

**شارب الماء:** خۆرە، ئاو خۆرەوە.

**شوارب:** سمێڵ، سووێڵ، سمبیل.

**شارح:** ڕاڤەر، لەسەرڕۆ، ئاشکراکار، ڕاڤەکار.

**الشارحة:** دووخاڵ، جووتخاڵ، تەقەڵ.

**شارد:** ڕەمکار، قاچاخ.

**شارع (ج) شوارع:** شەقام، ڕاڕەوی گشتی، شەقاو.

**شارع الرئيسي:** شەقام، شەقامی گشتی.

**شارع المقدس:** پێغەمبەری ئیسلام و ئیتر.

**شارع فرعي:** کۆڵان.

**شارق:** تروسکەدەر، هەڵاتوو، خۆر.

**شارك مشاركة:** هاوکاری، بوونە هاوکاری یەکتر.

**شاسع:** فراوان، بێ ئەندازە.

**شاطر (ج) شواطر:** شاز، زیرەک، زرنگ، توندوتۆڵ و بلیمەت، شۆخ، بێ باک، پەیت و پۆڕ، زرینگ، دەست بڕێو، چالاک، چوست.

**شاطيء (ج) شواطيء من النهر:** دەراو، هێلە، کەنار، قەراخ، ئاد، ئال، لێوار، ڤاچ، ڕۆخ.

**شاع شيعاً:** ئاشکراکردن، دەرخستن، دەنگەدەنگ بڵاوکردنەوە.

**الشاعر بالخجل:** چاوشۆڕ.

**شاعر (ج) شواعر وشعراء:** هەڵبەستەر، بوێژ، هۆنەر، هەستیار، هەڵبەست بێژ، هۆزانڤان، هەستدار، خاوەن هەست.

**شاعر الامي:** شایەر.

**شاعر شعبي:** شایەر.

**عزل:** لێ خستن، دانیشاندن، لەکارکردن، تێخستن، لابردن، لەسەر کار لابردن، خستنەلاوە، جوێ کردنەوە، ڕاکرن، خانەنشین کردن.

**عزلة:** گۆشەگیری، گۆشەنشینی.

**عزم:** ١- پایەداری لە کارێکیدا، ئارەزوو، دڵ کەوتنە سەر چتێکی، ئاهەنگ، قرم، لێ بران، کرتاخ. ٢- زەبر (لە فیزیادا).

**- جزم العزم:** قرم قایم بوون، قرم لێ خۆشکردن.

**عزم المقاومة:** زەبری بەرگر (لە فیزیادا).

**عزم القوة:** زەبری سەرکر (لە فیزیادا).

**عزوبة:** ڕەبەنی، تەنهایی، بێ ژنی.

**العزى:** ناوی بوتێکی قورەیشیان بووە لە پێش ئیسلامێدا.

**عزیز (ج) اعزاء:** خۆشەویست، لەبەر دڵان، بەڕێز، هێژا، گەورە، هەڵکەوتوو، ژیکەڵە، بەردڵ، گێژگوڵ، نرخدار، ئوفلاز، ژیرلۆ

**عزیف:** زرووکە، جرووکە، زەمزەمەی شادمانی.

**عزیمة (ج) عزائم:** نیازی قایم و پتەو، ویستی بڕیار لەسەر دراو، ورە، هوێرە، دڵ بۆ کار و یا چتێکی چوون، ڕا، ڕای، بیروڕا.

**عُس (ج) عساس:** کۆتک، کاسە و قابی پێچکدار و گەورەیە و لە داری دروستکراوە.

**عس عساً:** کێشکچییەتی کردن، لە شەودا نۆبەتچییەتی کردن.

**عسال:** هەنگووین فرۆش.

**عسالة:** خلێف، هەنگخانە، کەوار، کووریک، کوزە هەنگ، کەندووی مێش هەنگوین.

**عسجد:** زێری بێ خەوش، زێڕ و گەوهەر وەکوو دوڕ و یاقووت، تەلا.

**عُسر:** تەنگانە، ناخۆشی، گرانباری، دەست تەنگی.

**عسر البول:** میزگران.

**عسر الهضم:** دەو، تەبعی، دەوا.

**عسرة:** دژواری، دوخشاری، سەختی، تەنگانە، تەنگدەستی، دەستکورتی، دژواری، تووشی، تەنگانە، پچرپچر، پێسیر.

**العسرة الدائمیة:** ناسازی هەمیشەیی.

**العسرة المؤقتة:** ناسازی جارەکی، دەمەکی، کاتە ناساز.

**عسس:** کێشکچی، نۆبەتچی شەوی، پاسەوان، چۆکدار، ناتۆر، ناتۆرڤان، ناتۆرە، شەوگەڕ.

**- رئیس العسس:** سەرنۆکە.

**عسکر (ج) عساکر:** پێشمەرگە، سەرواز، سەرباز.

**عسکري:** سوپایی، لەشکری.

**- احتلال عسکري:** سوپاگیری.

**- تعلیم العسکري:** مەشقی سەربازی.

**- ثکنة عسکریة:** سوپاگا.

**- الخدمة العسكرية:** سەربازگەری، سەربازکاری.

**- قائد العسكري:** هۆڵمان.

**عسل:** هەنگووین، هەنگڤین، هنگڤی، کاریت، کۆتەفر، هنگڤ.

**العسل المصفى:** دۆبە، ڕاوی، ڕەواق.

**- ثفل العسل ومثالته:** کرێژی هەنگووینی.

**عسلوج:** گەشەی مێوی.

**عسلي:** وەکوو هەنگووینی شیرین، لەسەر ڕەنگی هەنگوینی.

**عسود:** کەومار.

**عسى:** ١- ڕەنگە، ویدەچێ، دەشێ، نیزیکە وا بێ، قەمی، بەشکوو، بەشقم، بەشکە، بەشکم، بەڵکە، بەڵکم، بەڵکوو، بەڵکی، گاهەس، هەیهایە. ٢- کاشکی، خۆزگە، خۆزی.

**عسیر:** سەخت، دژوار.

**عش:** بژی، هەربژی.

**عش حراً:** بژی بە ئازادی.

**عش سعیداً:** بژی بە بەختیاری.

**عُش (ج) اعشاش:** هێلانە، هێلین، لانە، هێلینک، کولانەی مریشکێ.

**- تأسیس العش:** گوزووز.

**- مهدوم العش:** هێلانەوازە، شێوان.

**عشاء (ج) اعشیة:** سەرشیو، بەرشیو، تاریکایی سەرەتای شەوێیە.

**- أذان العشاء:** بانگی خەوتنان.

**- صلاة العشاء:** نوێژی خەوتنان.

**- اكل العشاء:** نانی شەوێ.

**عشّاب:** گیافرۆش.

**عشّار:** دەو دوو وەرگر، دەیەک بەر، باج ئەستێن، ڕێگر، باجگر، ڕادار.

**عشاوة:** شەو کوێری.

**عشب (ج) اعشاب:** گیای تەڕ.

**- آكلة الاعشاب:** گیاخۆر.

**عشر:** وشترێکە بە دە ڕۆژان جارێکی ئاو بدرێت.

**عشر:** دامان، دەیەک، دەهیەک، دەهەک، یەکێکە لە دە پارچان، سزا.

**عشرات:** لە راوێژی ئەژمارێدا لە ١ تا ٩ آحاد و لە ١٠ تا ٩٠ عشرات: دەیان، دەهان و لە ١٠٠ تا ٩٠٠ مئات و لە ١٠٠٠ بەرەو ژوور الوفی پێ دەڵێن.

**عشرة:** دە، دەهـ ١٠.

**عُشرة:** بەخۆش ژیان و ڕابواردن، تێکەڵاوی، خۆش ژیان، بەزم، کەیف، ئاهەنگ، بەزم و ڕەزم.

**عشرة طیبة:** بەخۆشی ڕابواردن.

**عشرون وعشرين:** بيست ٢٠ بيس، ڤيس.
**العشرون:** بيستەم، بيستەمين.
**عشري:** دەيەكان.
**عشق:** دڵ لێچوون، حەسپەن بوون، زامەت، دڵداريتى، سەودا، گـراوى، شـەيدايى، شـێ، گـز، حـەز لێكەرى، ئەوداڵى، حەبداڵى، دڵبازى، دڵدارى، سەوا، سەوداسەرى، سوور، شەوق، ئەڤینى، كەڵكەڵە، هەوا، هەوەس.
**عشقة:** لاولاوە.
**العشو الليلي:** شەوكوێرى.
**عشوة:** شەوچرا.
**العشوة:** شەوكوێرى، شەوكوێرى، لێلاوى، لێلايى، كارى پۆشراو و ناديار.
**عشوق:** ئارەزوومەند، سەوداسەركردن.
**عشي:** بڕوانە (**عشاء**).
**عشية:** كاتى ئێوارێ، سەر لە ئێوارە.
**عشيرة (ج) عشائر:** خێڵ، ئێل، ڕەم، هۆز، دوودەمان.
**عشيق:** دڵدار، ئەڤیندار (بۆنێرینانە).
**عشيقة:** دڵدار، ئەڤیندار (ئافرەت).
**عصاء (ج) اعصاء:** داردەست، چەمك، شـڤـتـانى، شـێڤ، ڕۆمك. دەستەدار، گاران، سڤك، سەربەست، شەريات، تێلا، خۆترە، شاكۆڵ، گۆچان، دارك.
**عصاب:** شاتەرە (گيا).
**عصابة:** ١- دەستـەمرۆ يا چەند ولاخێكە. ٢- چەتە، جەردە. ٣- مەنديل.
**عصّار:** ١- ڕێك كوش، كووش، بكوش. ٢- كەسێكە لە كونجى و گەرچەك و ئيتر ڕۆنى بگرێ.
**عَصّارة:** تلـتـەى چتى كوشراو، ملت، سلپەك، تلپـاس، تلپ، تلف، سەرپاتە، خشتوخاڵ، چرك، ئاووگ.
**عصارات الغدية:** ئاوگى گلاندەكان.
**عصارات هضمية:** لينجاوى ڕەوانكار، ئاوگى هەرس.
**عصارة النباتات:** چەقە، شيرە، شيلە.
**عصام:** كل، زارەوانەى مەشكە و خيگە، دەسكى ديزە و گۆزان
**عَصَب (ج) اعصاب:** ١- شـادەمـار، شـارەگ، كـە جومگە و ئەندامان پێكەوە دەبەستێتەوە، ڕشتەى سپى و درێژە كە لە مێشكەوە دێتە دەرەوە و بەناو ماسولكەكاندا پەخش دەبێت. ٢- سەرۆكى هۆز و تيرەيە. ٣- لاولاوە، لاڤلاڤك، سيانە، لەبلابك.
**- الاعصاب الحركية:** بزوێنە دەمارەكان، دەمارەكانى جووڵانێ
**العصب الحسي:** دەمارى هەست.
**- الاعصاب الدماغية:** مێشكە دەمار.
**العصب الغليظ في باطن الركبة:** ڕەفيسكە.
**- الاعصاب المختلطة:** دەمارە تێكەڵاوەكان، تێكەڵە دەمارەكان.
**- الاعصاب المركزية:** ناوەندە دەمارەكان.
**- الاعمال العصبية:** دەمارە كراوەكان.
**- الافعال العصبية:** دەمارە كراوەكان.
**- الالياف العصبية:** دەمارە ريشاڵەكان.
**- الخلايا العصبية:** دەمارە خانەكان.
**- النسج العصبي:** دەمارەشانە.
**- عقدة عصبية:** دەمارەگرێ.
**- الموجة العصبية:** دەمارە شەپۆل، شەپۆلى دەماران.
**- الايعازات العصبية:** دەمارە ڕاگەياندن.
**- الجهاز العصبي المركزي:** ناوەندى كۆ ئەندامى دەمار.
**- وجع الاعصاب:** نەكەس، دەمار ئێش.
**العصبات:** باوان.
**عصباني:** بڕوانە (**عصبي**).
**عصبة:** كۆمەڵە، دەستە، پالوتە، جوون، كۆمەگ، سلسات، هوومين، جڤات، جڤين، زێوە، ئەلالەت، بتۆم.
**عصبة الامم:** كۆمەڵەى نەتەوەكان.
**عصبي:** مرز، مەڕس، مووگرژ، تووڕە، توندوتيژ، تەنگەگرتوو، سەرگەرم، ڕەبەلى، ئەنگر، قيسكەتەنگ، ڕق ئەستوور، قەلس، ڕابەل، برك، پلم، ترۆ، دەهرى، توومير، شێتگير، شێلگير، دەيرى، سەرشێت، دێوانە.
**عصبي المزاج:** سەرشێت، سەرگەرم.
**عصبية:** تووڕەيى، قەلسى، ڕابەلى، ملچى، تاڵى، سەرگەرمى
**عصر (ج) عصور:** ١- ژووم، چاخ، سەردەم، سەدە، چەرخ، ڕۆژگار، ڕۆچيار، سوور، كات، دەم، گاڤ، ڕۆژگار، چەرخ، حەل. ٢- ئێوارە، ئێوارێ، شێم، شيم، وێرەگا، هێوارە، هەنگۆر، ئێڤار، خووەرزەرد، لاى ئێوارێ.
**العصر المزدهر:** پازێر، پازر.
**عصر النهضة:** سەردەمى وريا بوونەوە و ڕاپەڕين.
**معاصر:** هاوچاخ، هاوكات، هاودەم، هەڤدەم، هاوچەرخ.
**العصر:** كوشين، ڕێك كوشين، دەوساندن، دوشان، ڕاكوشين، گـڤـاشـتن، نقووچ، گوشاندن، گوشين، وشاردەى، وشين، هەڵكوشين، هەڵگوشين.
**عُصعص:** باقل، قەمچك، قليچەك، كلنجك، كلێنچە، كلێنچك، كلێجە، كلێزە، نەرگس.
**عصف:** كا، سەمەرى، كپى، كۆ.
**عصفور (ج) عصافير:** پاسارى، بارانە، سوانكێ، سواندۆكە، سوانديلكە، پتيك، بەيتاك، جووجكە، چۆلەكە، مەلووچك، مەليچك.

**عصفیر:** هەمیشە بەهار (گول).
**عصمة:** ١- نێوی ئافرەتانە. ٢- ئابڕوو، ئاوڕوو، شەرم، فەهێ، نامووس، فەهێت، بێ تاوانی، نامووس پارازتن، پارێزگاری لە گوناه، خۆ لە تاوان و کاروباری سووک پارازتن.
**العصي:** چەمک، چۆگان، رۆتک، هوێزی، چەوگان، سەربەست، داردەست، گۆچان.
**عصیان:** دانەشاخ، یاخی بوون، خستنە پشتگوێ، نەکێشان، گوێ نەدان، مل نەدان، سەرکێشی، سەرپێچی، سەربزێوی، یاغێتی، لێ هەڵگەڕانەوە، بەلەسە، پەت پساندن، بارنەبردن، پەت برین، تاوانباری، لامۆفەک، ختمین، لاساری، هلگافێن، بارنەبەری، بارنەوەری، بێ گوێیی، پۆیساندن، پۆشکاندن، ڕێگری، شەموزی، هلگافتن، نافەرمانی، ملهوڕی، سەربزاوتن، ئازادی خوازتن، بەزاج، لام و فەک، بێ گوێیی کردن.
**عصیب:** موودار، چێشتێکیشە لە ریخۆلەی پڕ لە دڵ و سیپەلاک ئاخنراو.
**عصیة:** چیلکە.
**عصیة الکوخ:** جیلکەی زنج.
**عصیدة:** میوانی (چێشت ئاردوڕۆن)
**عصیر وعصیرة:** ١- ڕاوی، رب، ڕوب، سلپک، شیرە، شیلە، کوشراو، کوشیاگ، شیرەی کوشراو و تکاوی تری و میوە. ٢- خشتوخاڵ.
**عصیر النباتات:** شیلەی ڕووەکان، شیلی.
**عُضّ:** جەورستەم.
**عض:** گاز، قەپاڵ، قەپ، وەندە.
**العضّ:** گەزتن، گاز لێ گرتن، قەپاڵ لێدان، پێدانووسان، گەزکرن، دەڤ لێ کرن، قەپاڵ لێ گرتن، قەپ گرتن، گازگرتن، گەزین.
**عضب:** شیر (چەک).
**عضد (ج) اعضاد:** ١- قۆڵ، پیل، زەندەک، باڵ، هێچک، باهۆ. ٢- پشتیوان. ٣- لاشیپانە، لاوانە، پشتەک.
**عضد الذکري:** چوو، نێرەندام.
**عضرفوت:** مارمێلکە.
**عضل الساعد:** پووت.
**عضلة (ج) عضلات:** ماسولە، ماسولکە، گردک، کولە، ماهیچە، مایچە، وەرسە، بەهەموو پارچە دەمارێکی دەڵێن بەو گۆشتەشەوە کە گرتوویەتی.
**العضلة الاحشائیة:** هەناوە ماسولکە.
**العضلة الملساء:** لووسە ماسولکە.
**العضلة الهیکلیة:** پەیکەرە ماسولکە.

- **الالیاف العضلیة:** ماسولکە ریشاڵ.
- **تشنج العضلي:** دەمار وەرگەڕان.
- **عضلات المخطط:** ماسولکە دەزوولەدارەکان.

**عضو (ج) اعضاء:** ١- ئەندام، پەل، پیچک (ئورگان) (لەش). ٢- ئەندام لە نێو بەرە و دەستە و کۆمەڵەدا.
**عضو شرف:** ئەندامی بەرز و ئابڕوومەند.
- **اعضاء الاستجابة:** ئەندامەکانی وەڵامدانەوە.

**العضو الذکري:** چوو، نێرەندام.
**العضو العامل:** ئەندامی کارا، ئەندامی کارگەر.
**العضو المؤازر:** ئەندامی یاریدەدەر.
- **المصادر العضویة:** زیندە سەرچاوەکان، سەرچاوە ئۆرگانییەکان.
- **غذاء عضوي:** زیندە خۆراک، خۆراکی ئۆرگانی.
- **مواد عضویة:** زیندە مادە، ماددەی ئۆرگان.

**عضوض:** گر.
**عضوي:** ئەندامی، ئۆرگانی، ئۆرگانێک.
**عطاء (ج) عطایا:** بەخشینەوە، دەس و دەهنە، بەخشش، شاباش، دان، دەسەنە، بەخشین
**عطار:** وردەواڵەفرۆش، خوردەفرۆش، بۆنی خۆشفرۆش، وردەفرۆش.
- **مواد العطاریة:** وردە، وردەواڵە.
- **مهنة العطار:** وردەواڵە فرۆشی، خوردەفرۆش.

**عطارد:** سیوەیل، زاوە، تیر، ئەستێرەی زانست، نزیکترین ئەستێرەیە لە ڕۆژ و لە هەموو ئەستێرە گەڕۆکەکان گچکەترە، لە ٨٨ ڕۆژاندا جارێکی بەدەورەی خۆی و خورشیدیدا دەگەڕێ.
**عطاس:** پشمین، پژمین، پشکان، بێهنژین، پشکین، پێ گژین، پیرکژین، هەپشکرن، پرماندن، پژمە، پژمان، پشمە.
- **دواء العطاس:** کۆنۆش.
- **العطاس مرتین:** جەخت هێنان.

**عطالة:** بێ فەرمانی، دەستەوستانی، چرۆتی، بێ کاری، بێ ئیشی، داماوی، داماگی، دەستە پارچەیی، پەک کەوتن.
**عطب:** شکستی، سەقەتی، زەدەیی.
**عطر (ج) عطور:** بۆنی خۆش، بۆی وەش، گولاو، گولاڤ.
**عطس:** بروانە (عطاس).
**العطسة:** جارە پشمینێکە، پشمین، پژمین، هەپش کرین.
**عطش:** تینوێتی، توونێتی، تهنی، تهینیتی.
- **شدة العطش:** شەرار.

**عطشان:** تینوو، تینوی، تمژنی، تژنە، تمژنە، تهن، تینی.

**عطف:** ئاورلێدانەوە، خوداربوونەوە، گەڕانەوە سەر، میهرەبانی، دلسۆزی، میهر، هاوڕ، مووچاندن، مووچاندنەوە، هەلچەرخاندن.

**عطف الوجه:** لاوەکردن، ئاوڕ لێدانەوە.

**- أداة العطف:** ئامرازی بەستنەوە، پێوەند، ئامرازی هۆدانەوە.

**عطل عطلاً:** پەک کەوتن، بێکاربوون.

**عطلة:** ١- بێکاری، بێ ئیش و فەرمانی. ٢- وچان، بێن، ئاسوودەیی، فەرک، پرذژ، پشوو.

**عطلة رأس السنة:** پشووی سەری ساڵێ.

**العطلة الصيفية:** وچانی هاوینێ.

**العطلة الربيعية:** وچانی بەهارێ.

**عطلة نصف السنة:** وچانی نیوەی ساڵی.

**عَطَن:** وشتر خان، ئاغەڵی مەڕان.

**عطوف:** دلسۆز، میهرەبان، دڵدار، دلگر، دڵنەرم، میهرەبان، بەزەییدار، میرەوان.

**عطية (ج) عطايا:** بەخشش، خەلات.

**عظاءة، عظاية:** دایکە مارانە، داکەمارانە، دالکەمارانە، داکەمار، مارمێلکە، شینشینک، مارمەزوولکە، مارمیلوک.

**عظام:** گەورە، مەزن، پایەبەرز.

**عظة:** بڕوانە (عبرة).

**عظم:** گەورەیی، پایە بلندی.

**عظم (ج) عظام:** ئێسک، ئێستک، هێسک، هێستک، سووقان، هەستی، پێشە، هێستی، ئێسقان، سۆقان.

**عظم الشأن:** پایەبەرز، کورد، ئاری

**العظم اللامي:** لامە ئێسک، مەلاشوو

**- تجبير العظام:** هێسک گرتنەوە.

**- مجبر العظام:** هێسک گرەوە، شکست هەلبەستەوە.

**- الهيكل العظمي:** قەلافەتی ئێسکی.

**عظم الترقوة:** ئێسکی چۆلە مێشکێنە، چۆلەمە.

**عظم الجداري:** ئێسکی لاجانگی سەرییە.

**عظم الرميم:** ئێسکی ڕزیو.

**عظم القص:** کۆلەکەی سینگ.

**عظمي القوام:** بالای ئیسکی، ئێسک ئاسا.

**عظمة:** شان و شکۆ، هینگ و دەنک، گەورەیی، شکۆ، بێ پڤانی، ئەو ڕەنگ، دەبدەبە، فەڕ، کەشم، کەشم و نەشم، فیز، دلامەت، شان و شکۆ.

**عظمى:** گەورەتر.

**عظيم (ج) عظماء:** گەورە، مەزن، پڕشکۆ، بەدەبدەبە، پایەبەرز، کەلان، کەڵەزل، باگر.

**عظيم الجثة:** زەبەللاح، لەندەهۆر، زڕەدێو، زڕەمێر، زڕتە، زڕتەبۆز، فیلەتەن، زەهار، زەها، زەولەک.

**عظيم الشأن:** ئاری، کورد.

**عظماء الرجال:** بۆکەبۆک، گەورە پیاوان.

**أعظم:** گەورەتر.

**الاعظم:** هەرە گەورە، گەورەترین.

**عفاء:** هۆڵی کەر، کەرخان، تەویلەی کەران.

**عفاف:** بڕوانە (عفة).

**عفاوة:** بەرکۆڵ، وەرکوڵ، سەرکوڵ.

**عفّة:** داوێن پاکی، پاکداوێنی، ڕووسووری، پارێزگاری.

**العَفر:** یەکانە، بەلخە.

**عفريت (ج) عفاريت:** دێو، درنج، ئەرژەنگ، شەیتان، دەئێڤە، خێو، دهۆ، دڤ، دهۆ.

**عفص:** مازوو، مازی، مازگ.

**عفط:** زڕت.

**عفعف:** هەڕەهەڕە.

**عفن:** بۆنی خراو، بۆگەنیو، کەڕوو.

**عفن عفناً وعفونة:** بۆگەن بوون، خراپ بوون، کەڕوو هەلێنان.

**عفو:** بەخشین، چاولێ پۆشین، بووردن، نۆبەخش، وەش، چاو لە تاوان پۆشین، بووردن، وەشکردن، بەخشان، لێ بووردن، لێ بوورین، لێ خۆشبوون، دلی خوەڤەکرن، لێ بەسەرچوون، بووراندن، بوورین، جەبە، چش لێ کرن، خۆشبوون.

**عفوة:** خوێنبایی.

**عفونة:** بۆگەن، کف، کەڕوو، گەن، بۆپیسی، گەنیان، بۆنی پیس، گەندەژە، کەڕەکیف، بۆنی ناخۆش، کەڕواڵ، کەڕۆڵ، کۆڤنک، گنخی، تێکچوونی تام و بۆنی چتێکی.

**العفونة تعلو الخبز:** کەڕوو، کەڵەکیف.

**عفونة الخبز:** کەڕوو، کەڵەکیف.

**العفونة التي تعلو الاطعمة كنسيج العنكبوت:** کەڕەووڵ.

**عفونة الدم النزفية:** خوێن میزکە (ولاخ).

**- آكل المتعقنات:** گەندەخۆر.

**عفيف:** پارێزگار، خۆپارێز، پاکداوێن، داوێن پاک، پارێزدار.

**عفيفة:** پەردەنشین، ڕووسوور، ڕووسپی (بۆ ئافرەت).

**عقاب:** هەلۆ، کۆلارەمار، ئەلۆ، ئەیلۆ، کولالەمار، ئەلهۆ، باوەش.

**عقاب:** شکەنجە، چەرمەسەری، ئازار، تۆلە، سزا، تۆلەی خراپە، ئازارکردن، چەوساندنەوە، ڕەنج پێگەیاندن.

**عُقابين:** فەلاقە، لە پێشدا چوارپایەیێکی ئاسن بووە گوناهکاریان لێ دەبەست و بەقامچیان لێیان دەدا.

**عَقّاد:** گەردن بەند هۆنەوە.

**عقار (ج) عقاقير:** دەرمان، داوو دەرمان.

**- عقاقير طبية:** دەرمان، داوودەرمان

**عِقال:** ١- پەتی دەست بەندی وشترێیە. ٢- حەگاڵ، ئاگاڵ، ڕشتە.

**عقام:** دەردی بێ دەرمان، دەردی کاری، دەردی کوژندە.
**عقب:** بڕوانە (**خلف**).
**عقب:** نەوسا.
**عقب (ج) اعقاب:** ١- قونپینی، پانیە، پاژنە، پانی، قونپانیە، قوومپانیە، قوونپاژنە، پشت پەهنی، نالچە، پشتی سەر. ٢- نەتەوە، دوندانەکوڕەزا، کچەزا، منداڵ، پشتی سەر.
**- غیر معقب:** وارکوێر، وەجاخ کوێر.
**عقب:** نەتەوە، دوندان.
**عقب عقباً:** وەشوێن کەوتن، وەدووکەوتن، شوێن هەڵگرتن.
**العقبات والتلاع في رؤوس الجبال:** یاڵ.
**العقبة:** شەوچەلە، شەوچەرە.
**عقبة (ج) عقبات:** هەوراز، نەڤراز، گەردەنە، نەهێژ، ناستەنگ، گیروگرفت، لانت، کەندۆگێژم.
**عقبة:** باریکە ڕێ، ڕچە.
**عقبی:** تۆڵەی کار، ڕۆژی دوایی، دوارۆژ، پاشەڵ.
**عقج:** گرنج، گنج.
**مُعقج:** گنجاوی، گنج گنج.
**عقد:** مارەبڕین.
**عقد:** گرێ.
**عقد:** ١- پەیوەندی بەستن، گرێدان، پێچان، بێندن، نژاندن، گرساندن. ٢- کووچە، کۆڵان
**عقد الصفقة (للبیع):** دەست لەناو دەست نان.
**عقد العمل:** پەیوەندی کار.
**عقد (ج) عقود:** ١- تۆق، قەلادە، گەردن بەند، ملوانە، خوناوکە، خەناوکە، گردانە، بەرموور. ٢- قەلێتە، رستە، رشتە.
**عقدة (ج) عقد:** گرێ، خەربۆک، سوو، قۆیک، قەرقەف، قۆرت، گرە، دلۆ، خەش، خەوش گرێ (بۆ پێوان) = (انج) زاک.
**عقدة لاتحل:** گری پووچکە، گرێفووتک، گرێ کوێرە.
**عقد التقصیر:** گرێ کورت کردنەوە.
**عقد الحطاب:** گرێی دارکار (دارکەر).
**العقد الشراعیة:** گرێی رزگاری.
**عقد الصفقة للبیع:** دەست لەناو دەست نان بۆ فرۆشتن.
**عقد الصیاد:** گرێی ڕاوکار.
**عقدة عصبیة:** دەمارەگرێ.
**العقد الکشفیة:** گرێیەکانی دۆزینەوە، گرێیەکانی هەڵدان.
**عقد لمفاویة:** گرێی لیمف، لیمفەگرێ.
**العقد المربعیة:** گرێیەکانی چوارگۆشەیی.
**عقد النکاح:** مارەبڕی.
**العقد الوتریة:** گرێیەکانی سینگی.

**عَقَر:** بەتیغێکی تیژ پەی کردن، دەست و پێی وشتر بڕین.
**عقرب (ج) عقارب:** ١- دووپشک، دومارە کۆڵ، کولاژدوم، چزەپیلە، دووڤپشک، کەلاژووم، مارەکۆڵ، کولاژم، دووپشت. ٢- مانگی هەشتەمینە بەپێی ژماریاری بورج و کۆنگران.
**عقرب الساعة:** میلی کەژمێری.
**عقربة:** مرازەکانی سەر رووکاری کاتژمێران کە کات نیشان دەدەن.
**عقرة:** نەزۆکی، بەیچەڵی.
**عقص:** تاودانی مووی سەر، بەدخوویی و لەچەری.
**عقعق:** قشقەڵە، قەلەباشکە، قەلەبەڵەکە، قژقەڵە، قشقەرە، قشقرە، قەلەبازەڵە، قەجەلە، کەشکەڵە، قەلەباچکە، قاژەک، قشقیژە، قیژقەڵە، زاخێ، قاژک، قشقەڵە.
**عقف:** بڕوانە (**حنی**).
**عقفة المحجن:** کەمە، قەفی گۆچانی.
**العقل (ج) عقول:** هۆش، فر، ژیری، منە، ئاریش، هیری، هش، ئاوەر، هێزی تێگەیشتن، ژیللی، سەودا، سەوران.
**- ناقص العقل:** هۆدەر، کەمهۆش، کەم ئاریش، کەم ئاوەر، هەڕی، ڕێژگاو.
**عقل عقلاً:** هۆشیارکردن.
**- القدرات العقلیة:** بیرە توانا، هۆشە توانا.
**عقلة:** توولە، تووڵ.
**عقم (للمرأة):** بەیچەڵی، نەزۆکی، لەزگ، وەستانەوە، دەردی بێ دەرمان.
**عقوبة:** بڕوانە (**عقاب**).
**العقوبة بالجلد:** داڕکاری.
**عقوة:** وەڕینی سەگ، سەگوەڕ.
**عقور (کلب):** گەزندە، سەگی هار، نیانگر، نیمگیر، گر، گەزۆک، گر، لاگیر، پانی گر، نیهانگیر، نهێنگیر، پانی گر.
**عقوق:** نافەرمانی کردن، ئازاردانی دایک و باوک.
**العقیب:** مژگرە، مشک گرە (باڵندە).
**عقیبة:** هۆزەبانە (للعروس): نانی هەفتەیی بووکێیە.
**عقید:** سەرهەنگ.
**عقیدة (ج) عقائد:** بڕوایی، باوەڕی، بڕوا، بەقا، گوور، ڕاوێژ، ڕا، بیر و باوەڕی، بیروڕا.
**عقیر:** پیاوی بێ منداڵ، نەخۆش و بریندار.
**عقیق:** ئاقیق، بەردێکی نرخداری ئاڵە، حەفتم، حەقیق، حەوتم، هەفتم.
**عقیقة:** مەڕێکە یا ئاژاڵ و یان ماڵاتێکە لە ڕۆژی حەوتەمی منداڵ بوونێدا دەکرێتە قوربانی.
**عقیل:** مرۆی پڕهۆش.

**عقيلة (ج) عقائل:** ئافرەتی ئابڕوومەند و بەڕێزە، گەورەی خێڵ
**عقيم:** ١- نەزۆک، بەیچەڵ، بێ وار، نەزاو. ٢- بێ سوود، بێ کەلک، بێ بەرهەم.
**عقيمة:** قسر، نەزۆک، بەیچەڵ.
**عكاز (ج) عكاكيز:** وەکاز، قۆنداخ، شاکۆڵ، قەیسک، وەلەک، گۆپاڵ.
**عكاس:** لەوچە، لەواش.
**عكاظ:** بازاڕێک بووە لە نزیک (مەکە) لە پێش ئیسلامدا عارەبان لەوێ کۆدەبوونەوە سەودایان دەکرد یا هەڵبەستیان دەخوێندەوە و شانازیان بەسەر یەکتریدا دەکرد.
**العكام:** بوخچە.
**عكة:** بڕوانە (عقعق).
**عكر:** شلوێ، شێلوو، لێخن، لێڵ، لێلاو، لیخن، تاریک.
**عكر:** دووک، دۆکە، نەخۆشێکە شیناوەردی و پەلکەکانی سپی هەڵدەگەڕێ و وشکی دەکات.
**عكس:** بەرواژی، ئاوەژوو، بەراوەژوو، قەلەوازی، هەڵەوگەڕ، پێچەوانە، چەواشە، وەرگێڕاو، وەرگێلاو.
**عكس الشيئ:** بەراوژی کردن.
**عكس الصدى:** دەنگدانەوە، ڕازەر، دەردەنگ.
**العكس:** ئاوەژووکردنەوە، بەرواژی کردن، وەرگێران، نخوون، نخووین، واژی کردن، بەپێچەوانە ڕەفتارکردن.
**العكس بالعكس:** پێچەوانەش بە پێچەوانە.
**بالعكس:** بەپێچەوانەی ئەوە، بە بەرواژی.
**عكس:** بەپێچەوانەیی.
**العكوب:** کەنگر، قنگر
**عكوس:** ئانیشکەکان.
**علاء:** بڵندی، بەرزی، گەورەیی، ئەفرا، بڵنداهی، بڵندایی، ئابڕوو.
**علاة:** کولیخ، مێخ سندان.
**علاج ومعالجة:** دەرمانکردن، تیمارکردن، چارەکردن، باشارکردن، چارەکاری، فڕ، چارەسازی، چارەسەری، باشار.
**علاج المرضى:** دەوەرەی دەرد، چارەی نەخۆشی.
**- لم يبق له علاج:** فری براوە، چارەی نەماوە.
**علاف:** تەڕاح، کافرۆش، دەخڵ فرۆش.
**علافة:** قەلانکی جلکان، قولاپی جلکان.
**علاقة (ج) علائق و علاقات:** سەروکار، پەیوەندی، بەندیواری، نێوان، دۆستایەتی، پەیوەستی، پێناس، پێوەندی، فڕ، سەروساخت.
**دائرة العلاقات:** شۆفارخانە، شۆفاریانە.
**علاقات تأريخية:** پەیوەندیانی مێژوویی، پەیوەندێت مێژوویی.
**العلاقات الثقافية:** پەیوەندیانی زانیاری.
**العلاقات الخارجية:** پەیوەندیانی دەرەوە.
**علاقة الجوارب:** گۆرەبەند، بەندی گۆرەوی.
**علاقة طردية:** پەیوەندی ڕاستەوخۆ.
**علاقة عكسية:** پەیوەندیانی پێچەوانە.
**علاقة العنقود:** ساقەتە ترێ.
**علامة (ج) علامات:** نیشانە، بالەتە، خەت، نوونگ، کۆلک، شەقڵە، مشتە، پافت، ناوونیشان، چزخ، داخ، داغ، شانی، نیشان، شەقڵ، شۆن، قەرە، مشتە.
**- بدون علامة:** بێ نیشانە، بێ خاڵ.
**علامة الاستفهام:** پرسەگ، ئامرازی پرسیاری.
**علامة التطبيق:** شەقڵی جووتاو.
**علامة العجيب:** سەیرەک.
**علامة جيدة:** نیشانەی باش.
**علامة فارقة:** نێوونیشان.
**العلامة المزدوجة:** جووت نیشانەکان.
**- نصب العلامة:** جزخ کێشان.
**علامة:** زۆرزان، جوومە، دووهوورده، سۆ، فرەزان، فرەزانا، کلک نیشان، کۆلک، نیشان، هۆزان.
**علانية:** دیاری، ئاشکرایی، شتیاری، ئافتاوی، ئاشکرا.
**علاوة:** ڕووکەش، ڕووکێش، خستنەسەر، بەدەمەوەدان، سەربار، سەربارە، دەرف، ژوویێڤە، سەرمووچە، سەرڕا.
**علاوة (راتب):** سەرمووچە.
**علاوة على ذلك:** ژووی و پێڤە، سەرڕای ئەوەش.
**علبة (ج) علب:** قوتوو، قۆدی، گەروانک، دخمەر، گەروانکە.
**علبة السكاير:** قوتووی جغارە، قوتوو جگەرە.
**علبة:** مێگەل، ڕان، گەلەمەڕ.
**علبة الاثقال:** قوتووی سەنگینان.
**علة (ج) علل:** ١- نەخۆش، دەرد، ئازار، ئاهۆ، ژەهری، ژەهرک، دەغەز، شەوەن. ٢- هۆ، بۆنە، ناوەندی، سەبارەت. ٣- ورک، پەڵپ، بەهانە. ٤- هەوێ، هەوە.
**علة اللسان:** لۆخەلۆخ
**العلج:** ١- کەر، گوێدرێژ. ٢- خوانەناس. ٣- نانی نەستوور.
**علف (ج) علوفة واعلاف (للدواب فقط):** ئالیک، ئالک، دێزی، ئێم، ئیم، گزرە، ئالف، زرکوو.
**علف (للدواجن):** دان.
**- بائع العلف:** ئالیک فرۆش، کا و جۆ فرۆش.
**علق:** بڕوانە (تعليق).
**علق (م) علقة:** ١- زەروو، زێروو، مارڤر، زالوو، زەلوو، زیلوو، زاروو. ٢- خوێن، پارچە خوێنێکی مەیبو.

**علق:** گۆشتپاره.
**علقـة:** ١- (صـدريه الطبـاخ والاطفـال وغـيـرها): بەروانكە، وەروانكە، پیشگیره. ٢- پارچه خوێنی مەییو.
**العلقة:** بەرقەلیان، ناشتا، بەردڵ.
**العلقم:** کاڵەکە مارانە، گووژاڵک.
**علك:** بنێشت، بەنووشت، جاچک، ژاژک، وێژەن، ژاژلە، ژاژکە، جاجکە.
**علك مر:** بنێشتە تاڵ، جاچکە تاڵ.
**العلك:** ژاوین، جوون، جوویین، جاکاندن، جاوین، جووتن، جایین (بۆ بنێشت و خواردەمەنی).
**عَلَم:** ١- ئاڵا، بەیداخ، درەووش، بەندیر، بەیرەق. ٢- کـێـو، چیا، شاخ.
**- رفع العلم:** ئاڵاهەڵکردن.
**علم (ج) علوم:** زانسـتی، شـارەزایی، ئاشنایی، زانست، زانیاری، ئاخوەوەندی، ئاگایی، زانایی، زانین.
**علم الآثار:** شوێنەوار ناسی، ئەرکیۆلۆجی.
**علم البیان:** ڕەوانوێژی، ڕەوان بێژی.
**علم الاحیاء:** زیندەوەرزانی، زیندەوارناسی.
**علم الادب:** زانیاری وێژە.
**علم الارواح:** ڕەوانگۆیی، ڕەوانوێژی، ڕەوان ناسی، زانیـاری ڕەوان و گیان.
**علم الانساب:** پاڵاژ، لۆکاریتم، لۆغاریتم.
**علم التشریع:** زانستی یاساگەری.
**علم الجنس:** زانستی ڕەگەزناسی، زانستی ڕەگەزدۆزی.
**علم حفظ الصحة:** زانیاری لەش ساختێتی.
**علم الحیوان:** گیانەوەرزانی (زوولۆجی).
**علم الطب:** زانیاری پزشکی، زانست پزشکی.
**علم الطبیعیات:** زانیاری خۆڕسکی، زانینی خۆڕسکی.
**علم الغیب:** نهێن بینی، نهێن زانی.
**علم الفلسفة:** زانیاری پیتۆڵی.
**علم الفلك:** ئەستێرەناسی.
**علم الکیمیاء:** زانیاری کیمیا.
**علم النباتات:** ڕووەکزانی، ڕووەکناسی.
**علم النفس:** خۆناسی، زانستی خۆناسی، مگێزناسی، هۆڵمان ناسی.
**علم الوراثة:** زگماکی زانی.
**علم الهندسة:** زانستی ئەندازیاری.
**طالب العلم:** فەقێ، خوێندکاری زانیاری.
**علمي:** زانستی، زانیاری، زانینی.
**- مرکز علمي:** ناوچەی زانیاری.
**علمیاً:** زانستانە، لە ڕووی زانستیەوە.
**- دراسة علمیة:** لێکۆڵینەوەی زانیاری.
**- المجمع العلمي الکردي:** کۆڕی زانیـاری کـوردی، ئەنجـومەنی زانیاری کوردی.
**عَلَمَ علماً:** فـێـربوون، هیـربوون، چەشـبـوون، زانین، ڕاهاتن، هەوسین.
**عَلَّمَ تعلیماً:** بڕوانە تعلیم.
**علمي:** زانستی، زانیاریانە.
**عَلَن:** ئاشکرابوون.
**علن:** ئاشکرا، پەیدا، دیار، دەرکـەوتـوو، بێ پێچ و پەنا، ئافتـاوی، شـتیـار، بەردەر، ئاشکار، ئەشکەر، خوانی، خویا، بارەبار، سەوڵی.
**علهب:** کەڵ.
**علو:** بەرزی، بڵندی، گڤاند، درۆک، بڵندایی، بڵنداهی، دهار، هەڵ، ژۆرینی، کەمباز، بەرزایی.
**- سقوط من العلو:** کووڕبوونەوە، کەوتنە خوار، بەربوونەوە.
**- علو الهمّة:** سەرخاسکەفتن.
**- علو الرأس:** سەربڵندی، سەربەرزی، سەربڵنداهی.
**علوان:** کڵپە، کڵپەکڵپ.
**علوة:** کۆگا، ئەنبار.
**م عَلَوة:** دڵەدەرد، دەردی دڵ، زگئێشە.
**علوزة المخضرات:** سەوزەوات خانە.
**علوق:** بەڵاو و سەختی، مەرگ، ئەوەی کە بەمرۆڤداکرێت.
**علوي:** سەربڵندی، سەربڵنداهی، ژووروویی، چێتێکە بەندیواری بەبڵندی ئەستێرانەوە هەبێ.
**عُلي:** بڵندی، بەرزی، بڵندایی، بڵنداهی.
**عليّ:** بڵند، پایەبەرز، ناوی ئیمامی یەکەمینی شیعانە.
**عَلي:** بڕوانە (عُلاء).
**عَلَيَّ:** لەسەر منە، لەسەر من.
**على:** لەسەر، لەبان، سەر، بان.
**على الاقل:** هەرنەبێ، بالۆ.
**على الاکثر:** بەزۆری.
**على أي حال:** لە هەر دەقێکی دابێ، بە هەر چۆنێکی بێ.
**علیا:** لای ژووروو، بەرزتر، بڵندتر.
**- الجهة العلیا:** ژووروو، لای سەرەوە.
**على حدة:** بەلاوە، تەرخان، کلا، جوێ، جووتی، لاوە.
**على الخصوص:** بەتایبەتی.
**على الدوام:** هەمیشە.
**على الرأس:** سەر سەران، لەسەر سەران.
**على الرأس والعین:** بەسەر سەر و چاوان.

**علی رغم:** بەپێچەوانە.
**علی رغمي:** بەپێچەوانەی من، بەبەربەرەکانێتی من.
**علی الظاهر:** لە ڕوو، لە ڕووکار.
**علی العمی، علی العمیا:** کوێر کوێرانە.
**علی العین:** سەرچاوان، سەرچاڤان.
**علی الغفلة:** لە ناکاو.
**علی الفور:** بڕوانە (**فوراً**).
**علی قدر الامکان:** هێندەی کە بتوانرێ، بەپێی توانا.
**علی کل حال:** بەهەرچۆنێکی بێ، هەتری و مەترێ.
**علی مهل:** لەسەرەخۆ، بەکاوەخۆ.
**علی هذا:** لەو ڕوەوە.
**علی وشك:** نزیکە، وەختە، هاکا.
**علیق وعلیقة:** ئالک، دێزی.
**علیق الکلب:** دلیق.
**العلیق:** ١- شیلان. ٢- تووترک، تووڕک، تووردڕەی، کروونار، تووددڕک.
**علیقة:** توورەکە.
**علیل (م) علیلة:** بڕوانە (مریض)، دەردەدار، زەدەدار، ناساز.
**- الهواء العلیل:** سازاخ، هەوای ناساز.
**علِم:** بڕوانە (عالم).
**علّیون، علیین:** بەرزترین پایەی بەهەشت.
**عم (ج) اعمام:** مام، ئاپ، ئاپۆ، هاپۆ، مامک، مامۆ، تاتک.
**- اولاد العم:** ئامۆزا، مامۆزا، هاپۆزا.
**- زوجة العم:** ئامۆژن، ژن مام، ئاپۆژن.
**عمّ عموماً:** داگرتنی گشتی.
**عمّا:** لەچی، لەمەی، لەوەی.
**عماء:** کوێری.
**عماد:** ١- دالدە، پەنا، پەناگا، پشتیوان، پشتەک، پالەوپشت. ٢- کۆڵەکە، ئەستوندە، هەستوون، دووگوێ، پاژەر، ئەستوون، دنگ، دنگە، گوز، ستوون، هوستوون، تێلا، پایە.
**عمادة کلیة الطبیة:** سەرۆکایەتی زانستگای پزشکی، سەرۆکێتی زانکۆی پزشکی.
**- الخلایا العمادیة:** شاوڵەخانە.
**عمار:** ئاوەدان بوونەوە.
**عِمارة:** خانوو، خانووبەرە، خانی، پانە، خینیک، دەزگاوبەرە.
**عمارة:** خانووبەرە دروستکردن، ئاوەدانکردن.
**عَماري:** کەژاوە، تابووتی مردووان.
**عما قلیل:** لە پاش کەمێکی، لە پاش چەندێ.
**عُمّال:** کارگەر، ڕەنجبەر، کرێکار، پالە، کرێچ، کەدکەر.
**عمالقة:** یەکێکە لە خێڵەکانی پێش ئیسلامی ئارەوان.

**عَمامة (ج) عمائم:** مەندیل، مێزەر، شاش، شاشک، شووسە، سەرپێچ، ئەردی، بەلامک، پۆرتک، پوورتک، پیچ، سەروپوتڕاک، سەروپۆڕک، جامانە، جامەدانی، کم، سەروپێچ، کۆفی، سەروپۆڕتک، سەروکۆفی.
**- ذنب العمامة:** لێچەک، لێچک، لفکە.
**- عمامة النساء:** کۆفی، کۆڤیک.
**- عمامة مبهرجة:** چەفیە، چەفتە.
**عمّة (ج) عمّات:** پوور، پلک، تیتک، میمک، ئامک، شەوارە، ملک، میم، میمی (خوشکی بابە).
**- اولاد العمة:** پوورزا، پلک زا، تیتک زا.
**عمد عمداً:** ئەنجامدانی کارێکی بەقەستی.
**عمداً:** بەقەست، دەسەنقەس، ڕەس، دانستە، دەسنەقەس.
**عُمَدة (ج) عمد:** بایەخدار، پشتیوان، جێگای باوەڕی، دەستەڵقەس.
**عمر عمراً:** ئاڤاکرن، ئاوەدانکردنەوە.
**عمر عموراً وعمارة وعمراً:** خانووبەرە دروستکردن.
**عمر (ج) اعمار:** تەمەن، ژیی، ڕست، ژیوار، ژیان.
**- زمیل العمر:** هاوتەمەن.
**عمران:** ئاوەدانی.
**عمرة:** حەجی گچکە.
**عمرة النحل:** خەڵف، کوندەی هەنگوین.
**عَمَش:** بێ هێزی بینایی و هەڵوەراندنی فرمێسک.
**عمق (ج) اعماق:** قووڵی، بەرناف، بنانی، قووڵایی، کووڕاهی، بنەڕەت، ناخ.
**عمق عمقاً:** قووڵکردن، قەوارتن.
**العمل:** کارکردن، کردن، کرن، چێکرن، کردەی.
**عمل (ج) اعمال:** کار، کردەوە، کڕوکاش، فەرمان، ئیش، کر، کردار، کردە، کردوکار، هەرمان.
**عمل اجباري:** بێگار، سوخرە، سۆژ.
**العمل الاعتیادي:** کاری ڕەمەکی، کاری ئاسایی.
**العمل بالاجرة:** کرێکاری.
**العمل بالجص:** گێچکاری.
**العمل سراً:** کنەکردن، کاری نهێنی.
**عمل شعبي:** زبارەی گەل، هەرەوەزی، نەتەوایەتی، گەلکاری، زبارە، هەرەوەز.
**عمل صناعي:** دەسکر، دەسکرد، دەسوکار، دەستچێکری، دەسکار.
**عمل طیني:** قوڕەکاری.
**عمل مثمر:** کاری پڕ بەرهەم، پڕ سوود.
**عمل المعروف والخیر:** چاکەکردن.

**العمل المنجز:** کاری پێکهاتوو.
- **اعمال الید:** کاری دەستی.
- **بالعمل:** بەکردەوە، بەکردە.
- **إتجاه العمل:** رووکار، ئاستی کار.
- **اتقن عمل:** شاکار، شاکردار.
- **اجرة العمل:** کارانە، کرێی کار.
- **ارتکاب العمل:** هەڵکوتانە سەرکار.
- **ارقی عمل:** شاکار، شاکردار، بەرزترین کار.
- **انهاء العمل:** دەست لە کار بەردان، دەست لە کار هەڵگرتن.
- **جودة العمل:** پوختەیی کار.
- **توقف عن العمل:** کنانەوە، پەک کەوتن.
- **دفتر الاعمال:** کارنامە، پەڕاوی کار.
- **رئاسة العمل:** سەرکارێتی.
- **رئیس العمل:** سەرکار، سەرۆکی کار.
- **قلیل العمل:** بێ دەستاو، دەستەوستان.
- **الماهر في العمل:** کارەما، کارامە، کارزان، کاراشنا.
- **مباشرة العمل:** دەست بەکارکردن.
- **ناظر العمل:** سەرکار.
- **نوادر العمل:** شاکار، شاکردار.
- **نتیجة العمل:** ئەنجامی کار.

**عملاق:** چەتەووڵ، زرەدێو، کەتە.
**عملة:** ١- پارە، پووڵ، دراو، دراف، دەراف، مز، پارەی کان. ٢- کرێی کار.
- **ضرب العملة:** سکە لێدان.
- **دار ضرب العملة:** سکەخانە.

**عملي:** بەکردار، کردەیی، کردەنی.
**عملیة:** کردەوە، کردار.
**عملیة البناء:** کردەوەی بنیات.
**عملیة الطرح:** لێ دەرکردن.
**العملیات الجراحیة:** نژداری.
**عملیة الترمیت:** تەرمیتێن.
**عمود (ج) اعمدة:** کۆڵەکە، هەستوون، لەووگوێ، ئەستوندە، پاژەر، ئەستوون، دنگ، دنگە، گورز، ستوون، هوستوون، تێلا.
**عمود جاف:** پیل.
**عمود ذو رأسین:** دووگوێ، دووگێ.
**عمود (العارضة):** سەرەڕا.
**عمود الفقري:** بڕبڕەی پشتی، تیرەقەی پشتی، کاریتەی پشتی، تیغەی پشتی، گارگارە، پشتمازە، بڕبڕاگەی پشت، تیرەغەی پشتی، کۆڵەکەی پشتی، سنسل، بڕبڕە.

**عمود کهربائي:** پیل.
**عمود المیزان:** میلی تەرازوو.
- **اقامة عمود:** هەڵستاندنی ستوونێک، راستکردنەوە و دامەزراندنی کۆڵەکە.
- **تاج العمود:** کیسەڵە، سەرکۆڵ، کۆتەرە، تاتاڵە، کوترە.

**عمودیاً (کالعامود):** کۆڵەکانە، ستوونانە.
**عمودي:** ڕاست، ستوونی، قیت، قندر، ئەستوونی، شاوڵی جغزێکە سەرێکی بگاتە نێوەڕاستی خەتێکی ئەوتۆ کە دوو گۆشان نیشان بدات.
**عمولة:** پارەی نەغد، پارەی وشک، کرێی کار.
**عمولة الطحن من الحبوب:** باراشانە.
**عموم:** گشت، هەموو، تێکڕا، پاک، سەرپاک، هەمی، خڕ.
**عموماً:** گشتی، هەمووی، سەرپاکی، سەرانسەر، دەهڤ.
**عمومي:** گشتی، تێکڕایی، گیانی، گراگر.
**العمی:** کوێربوون.
**مثل الاعمی:** کوێرانە.
**عمي:** کوێرایی، کۆرایی، کۆری، کوێری.
**عمیاء:** کۆر، کوێر، (بۆ مێیینانە).
**عمیان:** کوێران، نابینایان.
**عمید (ج) عمداء:** ١- ڕابەری هۆز، پشتیوان، ڕاگر، رابەر، ڕێبەر. ٢- سووتاوی سەودا یا نەخۆشی گراوی.
**عمید الکلیة:** ڕابەری زانکۆ، ڕێبەری زانستگا.
**عمیق:** قووڵ، ساکوول، سووتال، فش، سووتار، چاڵ، کوور.
- **غیر عمیق:** تەنک.

**عمیل:** ١- کرێگرتە، بەکرێ گیراو. ٢- خۆ فرۆشتوو، خۆفرۆش.
**عمیل للاجنبي:** خۆفرۆش.
**عمیم:** تەواو، گشت، هەموو.
**عن:** لە، ج، ژ، نە، کۆ، ئەج، ئەژ، بل.
**عن بُعد:** لە دوورەوە، دووراودوور.
**عناء:** ڕەنج، ئازار، دەردەسەری.
**عنّاب:** سنجە، سنجەی، سنجوو، سرینچک، ژاگە، ژووژەسوورە، شیلان، لاس، بەرەک و نار، دەلیق، دارێکی درواوییە تا شەش باڵ بڵند دەبێ بەرەکەی وە زەیتوونی دەچێ بەڵان ڕەنگی سوورە و شیرینە. پەلکەکانی هێلکەیێن و ددانەدارن گوڵەکانی زەردن دارەکەی سوور و رەقە.
**عناد و معاندة:** ڕقەبەری، بەرانبەری، جەبری، ڕکەبەری، بەربەرەکانی، هەڤڕاکی، منجری، جەنەگرتن، لاساری، سەرسەختی، ڕق ئەستووری، ناکۆکی، ڕکە، جنە، بێ باوەڕی، کەللە ڕەقی، سەر ڕەقی، سەر هشکی.
**عناد للاطفال:** درناگە، دەرندگە، گروو.

**عتاق:** هووشک، کوڕه بەشە.
**عناق:** دەست لە ملی یەکتری کردن، یەکتری لە باوەشکردن.
**عَناق (من المعز):** بزنە قسر، چووێشتیر، چتیر، کارژۆڵە، پشتیر، تشتر، خرت، ساوەر، ساورین، کارژۆڵە.
**عناق الارض:** گوڕهەڵکەنە، سیاگۆش، پشیلەکێوی، گوڕەویلک، گوڕکەنک، سێولۆ.
**عناقة:** دووشاخە، وەناق، وەناخ.
**عنان:** جڵەو، دەستەوسار، دەستە جڵەو، دەسکە جڵەو، لڤان، پاڵەهەنگ.
**- ارخاء العنان:** جڵەو شلکردن، لە دوودان، جڵەو شۆڕکردن.
**عناية:** چاوەدێری، خەمخۆری، لێ خەفتان، سەرنج لە چتێکی دان، خەمخورای، ئارەزووکردن.
**- بعناية:** بەلێ خەفتان، بەچاوەدێری.
**عنب (ج) اعناب:** ترێ، هەنگور، لوورتە.
**- عنب أخضر:** هارسم، ترێی سەوز.
**- عنب الثعلب:** ترێ مارانە، ڕێزەڵە، ڕەزەڵە، ڕەزڵە، تووڵەزەرە.
**- عنب الجنّ وعنب الحيّة:** زەزڵەپێچ.
**- عنب الدب:** تەروو کوێستانی، تێروو (دارێکە).
**- العنب المخمر للدبس:** مووزە.
**- حبة العنب:** گڵوەترێ، بۆڵەترێ، گلار، گلە، گلوو.
**- شجرة العنب:** مێو، بنەمێو.
**عن بعد:** لە دوورەوە، دووراودوور.
**عنة العريس في ليلة العرس:** بەسترانی زاوا.
**عنبر:** ناسۆر، ناسوور، تێراوی.
**عنبر:** ١- نەهەنگی ناوێ کە (١٠) مەتر درێژ دەبێ ماکێکی بۆنخۆشی لەناو زگی دایە. ٢- چتێکی بۆنخۆشە، دەرمانێکی بۆنخۆشە، گیایەکی بۆنخۆشی دەریاییە.
**- العنت:** ڕووث، بەری مرۆڤان.
**عنتر:** مێشی گەورە و شینە.
**عنجد:** کشمیش.
**عند:** کن، لا، لەلای، نک، جەم، ڕوخ، بال، با، تەک، قەد، لال، ئال، لایەن، گشک، قەرە، لای، لایەن، لەبا، لبا، مەز، وێ، ل، مەز، وێ، هند.
**- عند الاقتضاء:** لە کاتی پێداویستدا.
**- عند الحاجة:** کاتی پێداویستی، کاتی پێویستی.
**- عند ذاك:** ئەودەمی، ئەوسا.
**- عند الذهاب:** لە کاتی ڕۆیشتنیدا.
**- عند الرؤية:** لە کاتی دیتندا.
**- عند الضرورة:** لەکاتی پێداویست و ناچاریدا.
**- عندك:** لە کن تۆ، لەلای تۆ، لبا تە.
**عندليب (ج) عنادل:** بولبول.
**عندما:** بڕوانە (**حينما**).
**عَنْدَم:** خوێنی سیاوەشان (جیوەیێکی ڕەشە).
**عندنا:** لەلای مە، لەکن ئێمە، بەمە، لبا مە.
**عنده:** لەلای وی، لەنک وی، وێی هەیە.
**عندي:** لەکن من، لەلای من، لبا من.
**عند عنوداً:** بەربەرەکانی کردن، ڕقەبەری کردن.
**عنزة (ج) عنوز:** بز، بزن، بزە، سیاوون، بوزە، گوێی.
**عنزة احمر الاذن:** کەرگ.
**عزروت:** گووژە، حەنزەڕووت.
**عنصر (ج) عناصر:** ڕیچەڵۆک، هەلەکارین، ڕەچەڵەک، نەژاد، دەووڵ، ڕەسەن، بناخە، مەحنەک، ڕەگەز، توخم، گەوهەر، مەحسنەک، لەلای پێشوونیان چوار ڕەچەڵەکەکانی بنچینەییەکانە وەکوو: ئاو، ئاور، هەوا و گڵە.
**عناصر متعددة:** بنگەردە فرە.
**عناصر الاربعة:** با، خاک، ئاو، ئاگر.
**العنصر السائد:** ڕەگەزی یەکەم.
**عنصر (في الكيمياء):** توخم.
**عنصري:** ڕەگەز پەرست.
**عنصل:** پیوازەخووگانە، پیازەکێویلە.
**عنعنة (ج) عنعنات:** یاسا، یاسە، شێوە، ڕەفتار، شوێنی، باب و باپیران، گێڕانەوەی ئاخۆتن یا چیرۆک لە زمانی چەند کەسێکییەوە بەڕێکی، ڕاڤە و هەڵڕشتنی هۆمانی شانازی باب و باپیران.
**عُنف:** سەخت، مۆنی، زووری، بەدڕەفتاری، دڵڕەقی.
**عنفقة:** چاڵی ژێر لێوی خوارەوە.
**عنفوان:** تاف، هەڕەت، تافتاف، جەنگە، بافت، گۆنەر، گۆنەڵ، تانگ، سەرەتا، زاج.
**عنفوان الشباب:** هەڕەتی جحێڵی، جەنگەی لاوی.
**عنق (ج) اعناق:** ئەستۆ، ستۆ، سکورد، مل، خەن، سکوور، گەردەن، هەوک.
**- ثخين العنق:** ملهوڕ.
**- جوزة العنق:** کەڵەبابەی گەردنێ.
**- قفاء العنق:** پژمل، پشت مل.
**عنقاء:** ١- ژنی گەردن بڵند. ٢- سیمرخ، سیمەرخ، سیمرغ.
**عن قريب:** بەو زووانە.
**عنقود (ج) عناقيد:** هێشوو، هۆشە، تلۆتەک، کووشی، وشی، ئووشی، ئێشوو، وەشی، پۆڵ، هووشە، جەڕدار.
**عنقود العنب:** وشی ترێ، لیسک.
**- فرع العنقود:** زەنگەتە.

**عنكبوت (ج) عنكبوتات وعناكب:** جاڵجاڵوكە، داپیرۆشكە، داپیرۆچک، پلۆ، ماڵ، ماماڵە، ماماڵی، پەسپەسەكوڵێ، داپیر، پند، پندە پیر، داپیرۆكە، پیرک، كارتێنە، كارتێنک.

**عنكبوت الكبیر:** چنگنە.

**عَنَم:** دارە ئالووباڵوو.

**عنوان (ج) عناوین:** سەرنامە، پێ شوێن، ناوونیشان، نیشانی، سەرەتا، پێناس، سەرباس، سەرنویشتە.

**عنوان الشركة:** ناوونیشانی هاوبەشێتی.

**عنوة:** وڵات بەپشم و ڕكەبەری گرتن.

**عنود (ج) عند:** سەرڕەق، مانگرتوو، كەللەڕەق، سەرسەخت، لاسار، براندۆخ، هەرووک، بەربەرەكانی كار، لامل، چەپخوون، ڕقن، ڕكن، سەهەنە، سەهەندە، سەركێش، منجڕ، دەغەڵ، سەرهشک، بێ گوێ، نەژنەوا، بێ گوێچكە.

**عني عنیاً:** واتا لێدانەوە.

**عنید:** بڕوانە (عنود)، ڕقدار.

**العنید في الكفاح:** شازدە هەناسە.

**عنیف:** قسەڕەق، بەدكردار، مۆن، گرژ.

**عنین:** ١- شلەپەتە، خوتڕی، بێكارە، كەسێكە كاری پێ نەكرێ. ٢- پیاوێكە پیاوەتی لە دەست نەیەت و بەسترابێ.

**عنینة:** ئافرەتێكە ژنێتی لە دەست نەیەت.

**عهد (ج) عهود:** ١- ڕۆژگار، سەردەم، كات، چەرخ، چاخ، دەم، حەل، ڕۆچیار، ڕۆژیار، سەقامات، گاو، دەور، دەوران. ٢- بەڵێن، پەیمان، هەرێنی، هەرێ، ژوان، خولەسێ، گفت، برِیە، لە خۆگرتن. ٣- ئەمەگ، ئامۆژگاری، سەقامات ٤- سوێند، سووند.

**- خیانة العهود:** سپڵەیی، بەدئەمەكی.

**- نقض العهد:** پەیمان شكاندن.

**عهدة:** ١- لەسەر، سەرشان، سەرمل، سەرەستۆ، لەسەرگەردن. ٢- گەڕانەوەسەر، بادانەوەسەر.

**- علی عهدتي:** لە ملی من.

**في عهدتي:** لەسەر شانە، لەسەرمە، لەسەر ئەستۆمە.

**عهد:** خوری.

**عهید:** هاوپەیمان.

**عواء:** عەوعەو، كەوتەكەوت، گەف، گەفەگەف، گەفین، گف، گفەگف، لوورە، لوورەلوور، لیراندن، نووزە، نووزاندن، نووزەنووز، هەوت، مزەمز، لووراندن، زوورین، حەپاندن، ئورین، ڕێلین، قۆڕین، وەڕین، وەڕەوەڕ، ڕەوین، وەڕین و لووراندنی سەگ و گورگ و چەقەڵ.

**عواء الكلب:** عەوعەو، حەپەحەپ، لووراندن.

**عواء الكلب حین التوجّع والتّوسّل:** نووسكە، نووسكەنووسک.

**عوّاء:** سەگی زۆروەڕ، ناوی ئۆناخێكی ئۆناخەكانی مانگ.

**عواد:** تارلێدەر، تارژەن.

**عوامة:** كەڵەک.

**ملّاح العوامة:** كەڵەكەوان.

**عوّة:** سەگوەڕ.

**عوج:** بڕوانە (اعوجاج).

**عود (ج) أعواد:** ١- دارێكی بەناوبانگ و كەبسووتێ لە دووكەڵەكەی بۆنخۆشی بڵاو دەبێتەوە. ٢- چیلكە، چێو، چۆ. ٣- پارچەیێكە لە ئامرازی مۆسیقا، جوورە سازێكە.

**عود الثقاب:** دەنكەشخارتە.

**- عیدان لاصقة بالزبیب:** قڵچخ، قونچكی مێوژێ.

**عَودة:** كشانەدواوە، گەڕانەوە، گل خواردن، چەرخانەوە، ڤەزوورین، ڤەزڤرین، گێڵان، بادانەوە، گێڵانەوە، پاشی كرن، هەو، زڤران، زڤرین، دوودانەوە، ئامانەوە، ڕۆیینەوە، ڕۆیشتنەوە، ڤەگەڕین، گەڕیانەوە، وەرچەرخان، هاتنەوە.

**عَودة المطر:** دادانەوەی بارانە.

**عودة المرض:** هەڵدانەوەی نەخۆشی.

**عوذ عوذاً:** پەنابردن.

**- نعوذ بالله:** پەنا بۆ خوا دەبەین.

**عوذة (ج) عوذ:** نشتوو، نوشتی، نڤشتی، حەتۆتە، بازی بەند، نوشتە، نویشتە، چاوبەست، ئەفسوون.

**عوذة ضد العفاریت وغیرها:** دێوبەند.

**- كاتب العوذ:** كۆلێنانی، نشتوونووس.

**عَور:** ڕووت، ڕووس.

**عور:** شەوارە.

**عور عوراً:** بوو بەیەک چاو، بینایێكی لە دەست چوو.

**عورة (ج) عورات:** گەڵ، نێوگەڵ، ئەندامی شەرمی مرۆیانە، بانەگا، داوێن، شەرمگا، شەرمگە و بۆ هەموو چتێكی واش بەكاردەبرێ كە لە دیتنی وی شەرم بكرێ.

**عورة الانسان (بین الرفضین):** گەڵ، ناوگەڵ، ناولنگ.

**عوسج:** ١- تووترک، توودڕک، كووفار. ٢- چاڵووک، زیی.

**عوض (ج) أعواض:** بات، جیات، بری، زانەوێر، برێتی، وەجەڵ، خستنەوەجێ، ئیزا، باپیڤان، بر، لە بات، واشۆر، وەج، تۆڵە، ئالوگۆڕ، وەجوەجە.

**بدون عوض، بلا عوض:** خۆڕا، خۆڕایی، خۆڕاوبۆڕا، هەروا، ڕایگان.

**عوضاً:** لە برێتی، لە جیاتی، لەباتی.

**عوضا عن (أو من):** لەجیاتی، لەباتی، لەبری، باپیڤانی.

**عَوعَو:** (ە) بڕوانە (عواء).

**عَوف:** بار، كاروكۆشەوە، بەخت، ڕۆزی، كەلەباب، شێری جەنگەڵ.

**عوق:** ڕەهت.

**عوّق:** بڕوانە (تعويق).

**عَول وعولة:** کابۆڕ، دەنگ هەڵبڕین لە گریان و هاوارێدا.

**العوم تحت الماء:** بینەکێشان.

**عون (ج) اعوان:** ١- یارمەتی دەر، پشتیوان. ٢- دەست و پێوەند، نۆکەر.

**- بعون الله:** ناوخوا، بەیارمەتی خودا.

**عوي:** وەڕینی سەگ.

**عويجة:** هەرزن.

**عويل:** زایلە، دەنگەدەنگی منداڵان، زووق، بانگ هەڵدان، دەنگ، شیوەن، زایەڵە، زریک و هۆڕ.

**عويل الاطفال:** زاق و زووق، واق و ویق، زیقەزیق، زاک و زووک، زاق و زیق.

**عوينات:** چاویلکە، چاڤک، چاڤ بەرک، چاڤۆک.

**العوينة:** چاویلکە.

**عي:** ماندوێتی، شەکەتی.

**العيّ:** گیراوی زمان.

**عياب:** بەدگۆ، وردەگیر، ڕەخنەگیر، بەدوێژ.

**عيادة المريض:** دیدەنی نەخۆشان کردن، لە نەخۆشان پرسین، هەواڵپرسی.

**عياذ:** پەنابردنە بەر.

**العياذ بالله:** لەو بەروبۆیە بەدوور بێ، دووروا، دووربێ، خوای نەخوازتە.

**العياذ بالله منك:** پەنا بەخولا لە دەست تۆ.

**عيار (ج) عيارات:** پێوانە، ئەیار، سەنگ، ئەندازەی چتێ.

**عيّار:** فروفێڵباز، تەڕ دەست، زرنگ، زۆرهاتوچۆکار، گەڕیدەی بێکارە.

**عيارات نارية:** تەقەی چەکان.

**عيّاش:** خۆشڕابوێر.

**عياط:** قیژە، گوڕڕە، چریکە.

**عيّاط:** بەقیژە، هاوارکار، قیژەکار.

**عيال:** خێزان، کەیوان، کەیوانوو، ژن و منداڵ، کابانی ماڵێ، خێزان.

**- محكوم العيال:** ژنانی.

**عيان:** ئاشکراو دیار، دیتن بەچاو.

**عيب (ج) عيوب:** شەرم، شوورەیی، تەنگ، نێوونرتک، بەندوباو، چێک، خەوش، دڵۆ، کەترە، فهێت، کەم و کووری، کورتی.

**عَيبَة:** زەنبیل، باوڵێ.

**عيد (ج) اعياد:** جەژنە، جێژنە، جێژن.

**- عيد الاضحى:** جێژنی قوربانێ.

**- عيد الحرية والاستقلال:** جەژنەی ئازادی و سەربەخۆیی.

**- عيد رأس السنة:** جەژنەی سەری ساڵێ.

**- عيد الفطر:** جەژنەی ڕۆژووشکاندنی.

**- عيد المظلة (لليهود):** جەژنەی کەپرەشینە.

**- عيد الميلاد:** جەژنەی بوونی عیسا.

**- عيد النيروز:** جەژنەی نەورۆزێ.

**العيدية:** جەژنانە.

**عيدكم مبارك:** جەژنەتان لێ پیرۆزبێ.

**عَير:** کاروان.

**عير (ج) اعيار:** کەرەکێوی، کەرکوولان.

**عيش:** ژیان، زیندەگانی، قوویت، ژیوار.

**- صعب العيش:** مەمرە مەژی.

**عيشة:** بژیو، گوزەران، ژیان، ژیوار، زینگی، زیندەگانی.

**عيشة الكفاف:** ژیانی کوڵەمەرگی.

**- فليعش:** هەربژی، بژی.

**عَيَّط تعيطاً:** هاوارکردن، قیژاندن، چڕین، چریکاندن، قیژاندن

**عيطة:** بڕوانە (**صرخة**).

**عيل:** عووروجور.

**عيلامي:** عەینەمەل، کوللەخۆرە (باڵندە).

**عَيَّن:** بڕوانە (**تعيين**).

**عين (ج) اعين وعيون:** چاو، چەم، چەو، چەهڤ، چاڤ، دیدە.

**عين الحياة:** سەرچاوەی زیندەگانی.

**عين ماء:** کانی، سەرچاوە، چاوە، کانیاو، چاوگە.

**عين ربيعي:** بەهارەکانی، وهارە کێنی، هانەدرۆزنە، بوارە کانی.

**عين المراحيل:** چەشمە.

**العين المجلق:** چاو زەق.

**- اعوج العين:** قجر، چاولار، خێل.

**- أمام العيون:** لە پێش چاوان.

**- بشرة في العين (بثورة في العين):** باپشکێو، چنچکە، دیقلۆک، سیچکەسلاوە، سیتکەسلاوە، سینچکەسلاوە، سینچکە مزدووک.

**- حملقة العينين في دهشة أو ألم العينين:** چاو بەمۆڵەق وەستان.

**- الشائبة الصفراء في العين:** زەردەپەڵە.

**- شعرة العين:** مووی چاو.

**- طرف العين:** سیلەی چاو.

**- فتحة العين:** سۆما.

**- كرة العين:** گلێنەی چاو، گلارەی چاو.

**- كفة العين:** کاسەی چاو.

- **ماء في العين:** ئاوی چاو، ئاوی مرواری.
- **محجر العين:** پێچاڤک، پێشچاو، دەوروبەری چاو.
- **العين والحسد:** چاوێنی، چاوانی، چاووزار، چاڤنی.
- **كان ينظره بأم عينيه:** بەسوورە سووری چاوی تەماشای دەکرد.
- **على العين:** بەسەرچاو.
- **على العين والرأس:** بەسەرچاووسەر.

**عَين (ج) اعيان:** دەراست، براگەورە، گەورەی ئاوایی، گەورە پیاو.

- **مجلس الاعيان:** کۆمەڵگەی پیران، ئەنجوومەنی براگەوران

**عين:** دەق، هەمان، تەق، کوتومت، دەق و دەق، کوت، پێستەنە، کت و مت، دەمنی.

**عيناً:** دەڵێی، وەکوو، تەف، دەمنی، دەبنی، دەقاودەق.

**عيناء:** ئافرەتی سپی و جوان.

**عين اليقين:** بەچاو دیتنی کاروبار و ئاکاران.

**عيني:** ماڵیتە.

**عيوق:** ئەستێرەیەکی رەنگ سوور و رووناکە دوای (کۆ)یە لەلای راستی کاکەشان هەڵدێ.

**عيون:** چاوی پیس.

**عيون الاعمال:** کاروباری گەورە.

# غ

**غ:** پیتی نۆزدەمینی ئابێتی عەرەبییە.
**غـائب (ج) غـائبـون:** ون، بزر، ونبـیـار، نادیار، نەدیو، وندا، پێوار، نەبانۆک، نەدیار، ناپەیدا، قـەپەنی، نێدیار، نەپەنی، نەپەندی
**غائر:** نغرۆ، ڕۆچوۆ.
**غائر السقف:** داتەپیو، ڕۆچوو.
**غائط:** ١- زەوی نزم. ٢- پیسی مرۆڤان، گوو.
**غائلة (ج) غوائل:** سەختی و زیان، خراپە، شەڕ، بەدڵداهاتن.
**غائم:** هەوردار، بەهەور.
**- یوم غائم:** ڕۆژی بەهەور و هۆڵ.
**غاب:** گۆشتی ڕزیو و بۆگەنیو.
**غـاب غـیـبـاً:** دوورکـەوتنەوە، ونبـوون، بزربوون، ئاوابوون، هویلیان.
**غـابة (ج) غـابات:** دارسـتـان، لێرو لێرەوار، جەنگەڵ، بێشـە، مێشە، بێشـەڵان، جەنگەڵـسـتان، ڕێل، دار و دەوەن، جنێک، چەم، دارسان، وێشە.
**غابر:** تێپەڕ، ڕۆیندە.
**غابن:** فێڵباز (لە کڕین و فرۆشتندا).
**غادر:** زۆردار، ستەمکار، بێ ئەمەگ، بەدئەمەک، ناپاک.
**غادر مغادرة:** بەجێ هێشتن، پشت تێ کردن، بواردن، ماوزۆ.
**غادي:** شێری جەنگەڵ.
**غاذي:** خۆراکدەر.
**غـار:** دارێکی زلی گـەڵا گـەورە و ئەسـتـوورە، لە شـامێ و لە چەندین شوێنێکاندا هەیە تا هەزار ساڵان دەژی گەڵایەکانی تاڵ و بۆنخـۆش و بەریشی وەکـو فندقی وایە تیکوڵ و گـەڵا و بەرەکەشی لە پزشکێتیدا بەکاردەبرێن
**غار (ج) اغوار:** ١- کاسەی چاو. ٢- غار، ئەشکەوت.
**غارب:** ئاوابوو، دوورکەوتوو.
**غارة (ج) غارات:** بەسەرداداان، تاڵان، هورووژم.
**غارات متقابلة:** پێکدادان.
**غاز:** گاز.
**غاز الاستصباح:** گازی سووتاندن.
**غاز طبیعي:** گازی سروشتی، سروشتە گاز.
**- المیاة الغازیة:** ئاوە گازاویەکان.
**- اقنعة الغازات السامة:** کلاوی ژەهراوی، کلاوی ژەهرەگاز.
**- الحالة الغازیة:** باری گازێتی، دۆخی گازێتی.
**- الوقود الغازیة:** گازە سووتەمەنی (کیمیا).
**غازي (ج) غزاة:** شەڕکەر و تالانگر، کەسێکە لە ڕێگای خودایدا لەگەڵ دوژمنانی ئایینی شەڕی بکات.
**غـاسق:** ١- تاریک و تنووک، شـەوەزەنگ. ٢- مـاری ڕەش، ڕەشمار.
**غاسول:** ئەسپۆن، پێشۆر (سابوون).
**غاش:** کەسێکە بێ ئەندازە یەکێکی تری خۆشبوێ.
**غاشّ:** ساختەکار، فێڵباز.
**غـاص:** جـێگای پڕ خـەڵـک و جـەنجـاڵ، کـەسـێکە پارووی لە گەرووی بگیرێ و نەتوانێ پشوو بکێشێ.
**غاصب:** دابڕ، داگیرکار، دەست بەسەرداگر.
**غاطة:** دەریاچە، زرێ، زرێبار، زرێوار.
**غاطس:** بناوەر.
**غاطي:** پۆشێنەر، لەبەرکار، تاریک.
**غاطی:** پڕ، تژی، زۆر، تێکەڵاو.
**غاغة:** پنگ، پونگ.
**غافر:** بەخشندەی گوناح.
**غافل (ج) غافلون:** بێ ئاگا، نابەڵەد، بێ هۆش، فەرامۆشکار.
**الغاق:** بروانە (باشق).
**غاقة:** کەرسەرە، کەرسەر، باڵندەیێکی ئاوییە.
**غال:** غار، هۆڵی مەڕان.

**غـالب (ج) غـالبـون:** خـورت، زۆربا، بەمل، زاڵ، چیـرە، سـەرکـەوتوو، ژووردەست، زۆردار، قـانـدڕ، سـووار، شـێـر، دەستدار، دەستەلاتدار، شێلگیر، زەبەردەست.

**غالباً:** فرەجار، زۆرجاران، گەلێک جاران، پەریجار.

**غالي:** گران، نرخدار، هێژا، بەهادار، پڕبەها، گرانمایە، ناگۆرە، گرانبەها، بەنرخ، هۆگ.

**غالیة (ج) غوالي:** دەرمانێکی پزشکی کۆنە بۆنی زۆر خۆشە بۆ بەهێزکردنی مێشک و دڵ و بۆ ئارامکردنی ژانەزگ بەکاردێ.

**غامر:** ١- چۆڵ، بەتاڵ. ٢- زەوی بەیار و بێ سوود.

**غامر مغامرة:** بێ بیر لێ کردنەوە چوونە ناو کارەوە.

**غـامض (ج) غـوامض:** وتەی پۆشـراو و دوور لە تێگەیشـتـی، وتەی ژێر لێوان، نادیار، ئاڵۆز، لێڵ.

**غامق:** ١- تێر، تەسەل. ٢- تیر، پڕڕەنگ، تۆخ.

**- احمر غامق:** سووری تۆخ.

**غامري:** گومڕا، ئاوارە.

**الغایة:** مـەبەس، هەویا، مـەبەست، دڵخواز، ئامـانج، ئارمـانج، نیشانە، مراز، نچک، گـائین، سەردڵ، خەلەسکوو، سەرک، بنەبانی چتی، ئەو پەڕی چت، دوا ئەنجام، ئاوات.

**غبٌّ:** پایان، ئەنجامی هەرچتێکی، دوایە.

**غبّ غباً:** جارجارە، جارە ناجارێ، نیونیوە، تاوێ، تاوتاوە، بێن بێنە، هاوڕ هاوڕ.

**غباً:** جـارجـارە، جـارە ناجـارێ، نیـونیـوە، تاوێ، تاوتـاوە، بێن بێنە، هاوڕ هاوڕ.

**غبار:** تۆز، گەرد، ڕتام.

**غبار الفحم:** خاکەی ڕەژوو، گەرودە.

**- ذرات الغبار:** ڕێزە، ئاستەمی تۆز.

**غباوة:** دەبەنگی، گێلی، حۆلی، سەرکوێری.

**غبّب:** گۆشتەکەی ژێر گەرووی کەڵەبابی. گۆشتی ژێر چەنەگە.

**غبَر:** تۆز، گەرد، ڕتام.

**غبراء:** بڕوانە (ارض).

**غبشة صباحاً:** تاریکەوڕ، تاریک و روونی بەیانی.

**غبطة:** کـەیفخـۆشی، دڵخـۆشی، ئاسـوودەیی، شـادمـانی، شـایی شایی.

**غبغبة:** بەرخەبەبە، بەبەغە، چۆڵەمە، خرخرە، زنخدان.

**غبن (في الوظائف او المعاملات):** تێشکان، زیان، زەرەر، فرت و فێڵ لە کڕین و فرۆشتندا، بەشخوران.

**غبي:** کەودەن، نازیرەک، گەلۆر، گەوج، گەمشۆ، گەمژەڵ، گەلحۆ، باڵە، بۆدل، حۆل، دەبەنگ، گێـل، هوڕ، بێ دەمـاخ، ڕەوتەڵە، ڕێژگـاید، زرەزیپ، سـەرکـوێر، کـەرکـە، بێ فـام، کـەرکـەرە، کەرکوتین، کێسل، لازوان، لاژک.

**غبي في القراءة:** کەپەر.

**الغبیراء:** سنجوو، سرینچک.

**غبین:** گێل، حۆل، کۆڵەوار.

**غث:** لەڕ، لاواز، سووک، بێ کەلک، وشەی سست و ناڕاست.

**غثاء:** ئاوماڵ، ئاومالک، پووش و پەڵاش، قافوو.

**غثیان:** دڵبیـاوان بوون، دڵهاتنەیەک، دڵهەلشێوان، بێتهۆشبوون، دڵچوون، هێـڵنج دان، هێـڵنج هاتنەوە، دڵهـەڵاتن، گـەشکە، بووردنەوە، لە خۆچوون، خێـسـانەوە، دڵ تێکەوە هەڵاتن، دڵ پێکدا هاتن، دڵ لە خێڵەوە هاتن، دڵەکزێ، دڵ بەیەکاهاتن.

**الغثیث:** زووخ، چڵک، زووخاو.

**غداً:** سبـۆزی، سبـەینێ، سەوی، سبـەی، سارا، سـارە، بەیانی، سبە، سبیانێ، سبزوو، سۆزی، سەبەی، سەوای، سەوەی، سۆ، شەوسۆ، سبێ، سوا.

**الغد المبکر:** سبەینێ زوو.

**- بعد غد:** دووسبەی، دووسۆزی، سبەتر.

**- مساء الغد:** سبەی شەوێ.

**- مساء بعد الغد:** دووسبەی شەوێ.

**غداء (ج) اغدیة:** نیوڕۆژ، نەهار، فراوین، فراڤین، قاوەڵتوون.

**غـداء الضـحی:** قـاوەڵتـوون، قـاوەڵت، بەرچا، بەرقـەننە، بەرقەلیان.

**غدار:** زۆردار، جەرگبڕ، جەرگمژ، زۆردار.

**غدارة:** نێزە و قەمەی سەر تفەنگانە.

**غُداف (ج) غـدفان:** خەرتەل، داڵاش، لاشەخۆرە، کەپەنەک داڵ، داڵ، داڵە کەرخۆرە، مردارخۆر.

**غُدان:** سێ پایە، سێ کوچکە، سێپا.

**غدة (ج) غـدد:** لوو، تشپـۆک، تشپـۆ، سۆ، لویی، برزک، لڤک، لوویی.

**- غـدة تظهر تحت جلد الرقـبة:** گەروە خرە، ملەخرە، گاوەناس، گلانە.

**- الغدد الصماء:** کوێرە گلاندەکان.

**- الغدة عرقیة:** نارەقە گلاند.

**- الغدد اللعابیة:** لیکە گلاندەکان.

**- الغدد الملحقة:** پاشکۆ گلاندەکان.

**- غدة نخاعیة:** پتیوتەری، ژێر مێشکە گلاند.

**- التهاب الغدد اللمفاویة:** برنگ، ئاورنگ، ئاورینگ.

**غدر:** هەڵەت، کەندوکۆسپە.

**غدر (ج) غدور:** ناپاکی، بێ دادی، ستەمگەری.

**غدوة:** سبەی، سۆزی، شەوسۆ، سبەینێ، سەر لە بەیانی.

**غـدیر:** گـۆل، گـۆم، گـۆمـاو، گـۆلاو، هەسـێل، هەوراو، ڕفکە، بەنداو، مەهسەر، ئەستێر، پەنگاو، پەنگاڤ، قوری، هۆراو.

**غدير المطر وغيرها:** جەردام، باراناو، گۆلی بارانە.
**غديرة (ج) غدائر:** گێسوو، گیس، پرچی هۆنراوەوە.
**غديرة وراء القفاء:** کاکۆڵ، فکلە.
**– صاحب الغدائر:** کاکۆڵدار.
**– منتصب الغدائر:** کاکۆڵ قیت.
**غذاء (ج) اغذية:** خۆراک، خواردەمەنی، تێشوو، تۆشە، واردەمەنی.
**– مادّة غذائية:** ئازووقە، مادده خۆراکیەکان، خۆراکە مادده.
**غَر:** جندە، ئافرەتی بەدکردار و حیز.
**غَرّ:** بایی بوون، بەخۆفشین.
**غرَ:** وشتر.
**غُرّ:** مرۆڤ یا ولاخ و مالاتێکە ناوچاوانی سپی بێ.
**غرّاء:** جووان و بەرز.
**غراء:** جەوی، جیوەی دارێ، سرێشم، چریش.
**غَراء (ج) اغراء:** هێلم، سریش، چریش.
**الغَراء فوق الغصون:** هەڤدال.
**غُراب (ج) غرابين:** قەل، قالاو، بۆرینە، بولینە، قالاوە.
**غراب اسود:** قەلەڕەشە، قاژوو، قەلاوڕەشە.
**غراب الزرع:** قاژوو، قاژێ، قاقیژە، قاقیشک.
**غَرابة:** چاقزتلی، ئاوارەیی، دەربەدەری.
**غرارة (ج) غرائر:** جوانی، لەیاد چوون.
**غرارة:** (ه) خەرار.
**غراس:** شەتڵ.
**غَرام:** ١- دڵداری، گراوی. ٢- لەناوچوون، ئازار.
**– مبادیء الغرام:** مۆزەمۆز، سەرەتای دڵدارێتی.
**غرام:** گرام.
**غرامة:** تۆڵەی تاوان و زیان بۆ ئەژماردن، لەباتی دان، تاوانە.
**غرامي:** دڵدارانە.
**غَرب (شجرة):** پەڵکە، سپی دار، دارەپەڵک.
**الغرب:** ڕۆژاوا، خۆراوا.
**غربال (ج) غرابيل:** بێژنگ، وەیژنگ، وێژنگ، وێچنە، سەرد، سەرەند، کەوگیر، سەرەند.
**غـــربة:** دەربەدەری، ئاوارەیی، وێڵی، ئەوارەیی، دووری، دوورەوکەفتن.
**غربد:** بروانە (غريد).
**غربل غربلة الحنطة وغيرها:** دابێژتن، گێژەوکردن، لە بێژنگ دان، گێژەکردن، وێژان، وێژداندن.
**غربيب:** شەودێز.
**غُرّة:** ١- بەرایی و سەرەتای مانگێیە. ٢- سپیایی نێوچاوانی ولاخی بەرزەیە.

**غرّة:** باڵندەیێکی ڕەشی ئاوییە بەمراوی دەچێ، گەنجی بێ ئاگا، ناشارەزا.
**غُرة:** زولف.
**غرد يغرد:** خوێندن و چریکاندنی بولبول و باڵندانە.
**الغرز:** تێراکردن، چەقاندن، ڕاچوواندن.
**غرس:** بروانە (هرط)، زەڕنەقووتە، زەڕنە قووتەڵە، ساقەتەسۆرە، جووچکەی باڵندانە کە بەتازەیی لە هێلکە دەرهاتبێ و هێشتا سەرو باڵی دەرنەکردبێ، تووکنە.
**غرس الشتل:** شەتڵ چەقاندن، ناژتن، دەرخکردن.
**غرس الفسائل:** دارچەقاندن، دارناشتن.
**غرش (ج) غروش:** جوورە پووڵیکی چل پارەییە، شایی، پلس، فلس.
**غـــرض (ج) اغـــراض:** ١- ویست، مەبەست، مەبەس، پێداویستی. ٢- نیشانەی تفەنگییە.
**غرض:** مەشکمژەنە، مەشکمژەنێ.
**غرضوف:** کەسمە، کەرسمە.
**الغرغر وغرغرة:** مریشکە شامی، مرەڕەشتی، مریشکە چینی، مامرە چینی، چین و ماچین.
**غرغرة:** گارەگارکردن.
**غرغرة:** ئاو یا دەرمان و چتی شلەمەنی لە زار و گەروو وەروودان، تێوەردان، چەنەوەردای، فلقە، مر.
**غَرف:** هەنگوین.
**غَرفة:** یەکچاو، یەکەلەچاو.
**غُـرفـة (ج) غـرف وغـرفـات:** دیو، ژوور، بەرکە، چاوە، دوویر، هۆدە.
**– غُرفة الارزاق أو المؤنة:** کونگە، ژووری دانەوێڵە.
**– غُرفة الاستقبال:** ژووری میوانان، دیوەخانە، قۆچکی.
**– غُرفة التجارة:** ژووری بازرگانی، ئەنجوومەنی بازرگانی.
**– غُرفة التحتانيّة:** ژێرخان، زاخۆن.
**– غُرفة الجلوس:** ژووری دانیشتن، دیوەخانە.
**– غُرفة الخطار:** دیوی میوانان، قۆچکی.
**– غُرفة السكنى:** ژووری دانیشتنێ.
**– غرفة صغيرة:** ژوورۆچکە.
**– غرفة صغيرة داخل غرفة كبيرة:** شانەشین، شانوشین.
**– غرفة الطعام:** ژووری خواردەمەنی، ژووری نانخواردنێ.
**– غرفة الفوقانية:** باڵەخانە، بانهەڵبان، سەرتاق، سەرخان.
**– غرفة المطالعة:** ژووری خوێندنەوە و لێ وردبوونەوە.
**– غرفة النوم:** ژووری نوستنێ، خاوگە، نقینۆک، خەوخانە.
**– غرفة الوقود:** ژووری ئاوردوو، دیوی ئاگردوو.
**– الغرف الهوائية:** ژوورۆچکەی هەوایی.

**- الغرفة التي تبنى فوق الهاب:** سەرتاق.
**- ارض الغرفة:** ناوماڵ، زەوی ژووران.
**غرق:** خنکان، قوم، نقووم بوون، فەتسان، فەتسین، تاسان، خنکیای، خەندکین، ڕا، نقووم، نقم، نوقم، نووقم کردن، لە ناو بردنە خوار، قوم کردن.
**عرناس:** کوێخا، خاوەند دێ.
**غروب:** ناوابوون، ئاڤابوون، پەڕین، پەناگرتن، نیشتنی خۆر و مانگ و ئەستێران و، وێرگا، هووێلیان.
**غروب الشمس:** خۆراوابوون، ڕۆژئاوابوون.
**غرور:** هەواداری، خووەبینی، فیزداری، خۆپەسندی، هەوا، فیز، باری هەوایی، شۆگایی، بستەهی، خرایی، برووغی، باسەری، فیس، بەرخواری، بەهەوایی، خۆپەسندی، دەماداری، ڕێڤناهی، ژوورڤەچوون، قاپانی، کەللەبایی، هاشە، لووت بڵندی، دەمار.
**غري:** بڕوانە **(غَراء)**.
**غريب (ج) غرباء:** ١- ناوارە، دەربەدەر، هەڵوەدا، ناپۆرە، چەرخچی، تووێل، چەرخەچی، هەڵەتە، ناوەکی، کەرسەلە، ئەوارە، بێ لانە، پەرەوازە، پێخاس، تار، گاڤ قەلێش، لاپۆرە، هەڵەتە، هەڵوەدە، هەڵوەدا، ناوارە، کەڵتەوەن، ناشنا، سۆزرەت. ٢- نەبیستراو، نەبهیستی. ٣- نابەڵەد، ناشنا، بێگانە، هاڤی، بیانی، جەرگهەلین، تاچیک ٤- سەیر، ناوێزە، ئەنتیکە، سەیران، ڕمووزن، فێخۆرجۆ، زۆر سەیر، سڤن.
**غريبة (ج) غرائب:** چتی ناوێزە و سەیر.
**- غير غريب:** خۆمانە.
**غريد:** بووکێکە لە شەوی بووکێنیدا ناشکرابێ کە بێ بنە، بێ بن، بێ کچێنی.
**غرير:** چالەکە، گەنجی سادە و کەم تاقی کەرەوە، بەهەواو بەفیز
**غريزة (ج) غرائز:** نهاد، سرشت، خوو.
**الغريزة الجنسية:** سروشتی تێکەڵاوێتی.
**غريزي:** سروشتی، بنچینەیی.
**غريسة:** نەمام.
**غريفة:** کاڵە، پاپۆش.
**غريق:** خنکاو، قوم بوو، نقووم بوو.
**غريم:** قەرزدارێکە نەتوانێ بیداتەوە.
**غرين:** لیتە.
**غزا:** لە ڕێگای ئایینیدا شەڕکردن، لەگەڵ دوژمنان بەشەڕهاتن.
**غزاه غرواً:** بڕوانە **(طلب)**.
**غزّال:** ڕێسەر، مووفرۆش.
**غزال:** ئاسک، مامز، بانیز، وەرەماس.
**غزال المسك:** ئاسکی مسکی، ئاسکی مشکی.
**غزر غزارة وغزراً:** زۆربوون، فرەبوون.
**غزل الصوف:** ریس، بەن.
**غزل غزلاً:** ڕێسین، ڕستن، ڕێسان، پلدان، بادان.
**الغزل:** ١- لەگەڵ ژنان ئاخەفتن و بەگەپ و گاڵتە ڕابواردن. ٢- جۆورە هەڵبەستێکی دڵدارییە لە (٧) تاکان کەمتر و لە (١٥)ئیش پتر نەبێ زۆرترین لە بابەت دڵدارێتییەوەیە.
**غزو (ج) غزوات:** لە ڕێگای ئایینیدا شەڕکردن، چوونە شەڕکردن، پەلامار کردنەسەر، هەڵکوتانەسەر، داڕسان، هێرش، تاڵانکردن.
**غزير:** زۆر و زەبەند، فرە.
**غزيرة (ج) غزار:** وشتری پرشیر، کانی پڕ ئاو، چاوی پڕ فرمێسک.
**غساة:** قۆرەی خور، خورمای نەگەیشتوو.
**غسال:** شۆرەر، جل شۆر، کۆڵکار، شوشتڤان.
**غسال الميت:** مردووشۆر، مریشۆ.
**غسالة:** ئافرەتی جلک شۆر، بالاڤی ئاوێکە چتمەکی پێ شۆرابێ، ئاوی چۆڕاوەوە.
**غسالة الرأس:** سەرشۆر.
**غسالة الصابون:** ئاراو، ئاراڤ، چڵکاوی جلکان.
**غسّان:** جەنگەی لاوی و جوانی، ناوی خێلێکی عەرەبانە.
**غسّاني:** زۆرجوان، ڕووخۆش.
**غَسق:** تاریکی، تاریکی سەرەتای شەوێ.
**غسق العين:** چاو تاریک کردن.
**غسق الليل:** شەو تاریک و تنووک بوو.
**غُسل:** خۆشوشتن، مەلەکردن.
**غَسل:** شوشتن، شتن، شۆرین، داشۆراندن، شۆ، شۆردن.
**- غَسل الرأس:** سەرشوشتن، سەرشۆرین.
**- غَسل الملابس:** جل شوشتن، کۆڵ، بالاڤ.
**- الغسل بالماء سبع مرات:** حەفتاو.
**غسول:** ئاووسابوون و هی وەکو وان کە سەر و لەش و جل و کەلوپەلی پێ بشۆن.
**غسيل:** شۆراو، شوشتراو.
**غش:** فەن، فەند، خەوش، فریودان، ناپاکی، ساختە، گزی.
**غشاء (ج) اغشية:** ڕووپۆش، سەرپۆش، سڤی، پەردە، کیف، سیلاهی، تووت، توێژاڵ، بەڵغ، بار، لۆخ، مردک.
**- غشاء الجداري:** دیوارەبەرد، ناوپۆشی سینگ.
**- غشاء الجنب:** پەردەی سی.
**- غشاء الداخلي:** سیی پۆش، پەردەی سی.
**- غشاء الرئوي:** سییە پەردە، دیوارەپەردە.

**غشاء على الشفة:** باری لێوان، بەڵغی سەر لێوان.
**غشاء المخاطي:** پەردەی لینج.
**الغشاء الناضح:** توێکی دادەر (لە فیزیک).
**الغشاء نصف الناضح:** توێکی نیودادەر (لە فیزیک).
**غشاء يحدث فوق العيون:** تارمایی چاوان.
**غشّاش:** ناپاک، ساختەچی، نادروست، دەغەڵ.
**غشاوة:** بەڵغی سەماوەر، گەرەکوویر، پۆشش، پەردە، رووپۆش.
**غشوة:** بەڵغی سەماوەر، گەرەکوویر، پۆشش، پەردە، رووپۆش.
**غشي:** بێهۆش.
**غشيم:** ناشی، نابەڵەد، تازەقەڵا، کوڵ، نەفام، دەستوپێ سپی، سادە لەوخ، ناشارەزا، لاجوور، نەزان.
**غص، غصي:** بێهۆشی، تەنگانە، خەم.
**غصب غصباً:** دەست بەسەرداگرتن، زەوتکردن، زەفتکردن، دەست بەسەرداڤەگرتن، لەهاندن، خەسم، دابڕین، داگیرکردن، داگرتن، سەندن، سەنت.
**غصة:** خەم، پەرۆش، خوێنی جێگەر.
**الغصة بالبكاء:** هناری.
**غصن (ج) اغصان (الاشجار وغيرها):** لق، لک، کەل، لەق، شاخ، چرپی، فلێقان، لیست، لیسک.
**اغصان:** پەلۆپۆ، لق و پۆپ.
**اغصان الشجرة المقطوعة:** چرۆ، چروچۆ، چرپی.
**- اعلى الغصن:** سەرچڵ.
**غض:** بروانە (**غمض**).
**غض النظر:** چاوپۆشی، چش لێکردن.
**الغضا:** تاووک.
**غضاب:** ریپۆقی چاو.
**غضارة (ج) غضائر:** خوان، خۆش و زیندەگانی، مووررووێ شین کە بۆ چاوی پیس هەڵدەگیرێ.
**غَضب:** رق، قین، رک، کین، پشم، کەرب، خورین، فرید، کووڤان، کینە، تووڕەیی، توندوتیژی، پشماندن، هێچ، زارچاو، ژەهرچاو، بەسەرداهاتن، تووڕەبوون.
**غَضَب الله:** خوداگیری.
**غضب غضباً على الشيء:** قین لێ هەستان، رک هەلانین.
**غضبان:** تووڕە، توندوتیژ، مەرس، مەرز، رق ئەستوور، ناڵۆز، قوشقی، رق هەستاو، برک.
**غضروف:** کرکراڕۆک، کرکراگە، کرکرگ، کرکرتە، کرکرۆچکە، خرێنچکە، رەقێنە، قرقرتۆک، کرێنچک.
**غضروف الاذن:** کرکرۆچکەی گووێ.
**غضن:** بروانە غضون.
**غضنفر:** شێری دڕندە.

**غضوب:** بروانە (**غضبان**).
**غضون:** چرچی روو، لۆچ، چینی روو.
**غطّ غطاً:** بەسەختی کوشی.
**غطّ النائم:** نوستوو پرخە پرخی کرد.
**غطاء (ج) اغطية:** پەردە، سەرپۆش، سەرقاپ، رووپۆش
**- غطاء الحشية:** سەردۆشەگ.
**- غطاء السرير:** کوللە، مەچەکدان.
**- غطاء الصحون وغيرها:** سەرقاپ، گۆژنەو.
**- غطاء القنينة:** سەرەشووشە، زارەوانە.
**- غطاء المائدة:** سەرمێز.
**- غطاء المواعين:** دەرخۆنە، سەرپۆش، سەرقاپ، گۆژنە، گۆشنەو.
**- غطاء وجه النساء:** رووبەند، پێچە، سەرروو، سەررووک.
**- غطاء الوعاء:** سەرپۆش.
**غطريس (ج) غطاريس:** خۆپەرست، بەهەوا، نقم کردن، نۆق کردن، مچکردن.
**الغطس:** لە ئاوێدا قوم کردن، لە ئاوێ هەڵکێشان، نقووم کردن، مەژەند، جوومکرن، ژەنن بە ئاوا، شلپە شلپ کردن.
**غطس:** شلپەکردن، مچ کردن.
**غطس اليد أو شيئ آخر:** تێهەڵێنان.
**غطسة في الماء:** قیب، لەناو ئاوێ هەڵکێشا، ژەنن بە ئاوا.
**غطى غطأ الليل:** ١- تاریک بوون. ٢- داپۆشین، سەرنانەوە، شخافتن، راپاندن.
**غفار:** بەخشندە، بوورەر، گوناحپۆش، لێ بوورەر، وەشکار.
**غفر غفراً:** پۆشین، پەنهانکردن، بەخشین، وەشکردن، بوورین، لێ خۆشبوون، بووراندن.
**الغفر:** بێچووە بزنەکێوی.
**غفران:** بەخشین، لێ خۆشبوون، لێ بووردن.
**غفرة:** رووپۆش، سەرپۆش.
**غفل غفلاً:** لەبیرکردن، بەجێ هێشتن، هێشتنەوە.
**غفلة:** بێ ئاگایی، فەرامۆش، لەبیرچوون.
**غفلةً:** لەپڕ، لەنەکاو، نشکۆ، فەرامۆش، کوتوپڕ، کوت و مت، لەناکاو، لە پڕا، نیشکڤە، لە هێکرا، یەکەندەردوو، ژنشکاڤە، کتوپڕ، هێکرا، ناکاو، ناکام، ناگەهان.
**غفوة:** سەرخەو.
**غفور:** بەخشەر، بەخشندە، داپۆشەر، لێ بوورەر.
**غفير:** زۆر، فرە، گەلێک، مووی گەردن و روخسار، مووی نەرم و ورد.
**غل:** ناپاکی (خەیانەت) رق، کین، ساختە، دوژمنایەتی.
**غُل (ج) اغلال:** تەوق، تۆق، قەڵادە، زنجیری مل، کەلەپچە.

**مغلول بالحبل:** پەتیار، بەگوریس بەستراو.

**غَلاء:** گرانی، قاتی، نیز، وشکەساڵ، قاتی و قڕی، قەپ و قڕ، نەهاتی، نەبوونی.

**غَلاء المعیشة:** سەرمووچەی گوزەران.

**غلا غلاءً:** گرانبوون.

**غلاّب:** زۆرچیرە.

**غلایة الشاي:** چادان، چایدان، قۆری، قۆریە.

**غلاصم:** کەوانەی ڕیشەدار.

**غـلاف:** ١- کـالان، کـیـلان، قـەلک. ٢- بەرگ کـیـف، پۆشتەمەنی، پەردە.

**غلاف البلوط:** قەپووچکە، قووڵکە جەوت.

**غـلام (ج) غلمـان:** ١- نۆکـەر، بەندە، بەنی، بەنە، بەردەست، ژێردەست، کـەدی، کـەڤـانۆ، پێشـکار، کـۆل، زێر کـرید، زەرخرید، بەردە. ٢- کوڕ، بەچە، نگڵ، لووسکە.

**غلایة:** کەتری.

**غلب غلباً:** بەزاندن، شکاندن، گاردان، بەسەردازاڵ بوون، کـۆڵ پێـدان، ڕاونان، بردنەوە، چیـرەبوون، بەزاندن، سـەرکـەوتن، سەرکەفتن.

**الغلبة علی:** خیرنای، چیرەیی، پیرۆزی.

**غلباء:** باغی پڕدار و درەخت و تێکچڕژاو.

**غلّة (ج) غلات (ە):** خەلە، دەخڵ، دان، دەخڵ و دان، دەغڵ.

**- بائع الغلّة:** دەخڵ فرۆش، دەخل و دان فرۆش.

**غلط (ج) اغـلاط:** هەڵە، چەوتی، قـەسـیـسـە، خـوێژنگ، کەموکووڕی، سووچ، کێماهی، پەرتی، بەسەرچوون، کێمایی، لە دەم دەرپەڕین، نەڕاست، نادروست.

**غلط:** گێپەرە.

**غِلظة:** ئەستووری، سەختی، دوژمنایەتی، ڕق، کین.

**غَلق:** بەسـتن، پێـوەنان، پێـوەدان، دایـپـۆ، پووەدای، دادان، وێخـسـتن، داخـسـتن، پێکەوەنان، دانەیەک، ژەنن، ژنیـای، داران، سـەرکـلـۆم کـردن، لێکنان، وێکـنان، وزەشـەڕە، کـلـۆم دان، قفڵدان.

**غلق الباب:** دەرکە داخستن، دەرکە کلیلدان.

**غلق (للزهرة):** سیس بوون.

**غلو:** لە سنوور تێپەڕین، پتر ڕۆیشتن، پتر پێوەنان (افراط).

**غلول:** ناپاکی، نادروستی، ناڕاستی.

**غلونة:** ڕوو پۆشین.

**الغلي:** کولاندن، کەلاندن، کەلهاندن، بلـقاندن، پڕاندن، پڕین، جۆشاندن.

**غلي الدهن:** قرژاندن، قرچاندن، هەڵقرچاندنی ڕۆن.

**غلیان:** کولان، وەکوڵهاتن، وەجۆشهاتن، کوڵین، گریای، کەلژین، پڕان، جۆش، جـۆشـان، قـوڵ، قـوڵـتدان، قـوڵـتەقوڵـت، کوڵین، کوڵیان.

**- غلیان القدر:** قوڵتە.

**- غلیان الدم:** مرۆجە مرۆج.

**- درجة الغلیان:** پلەی کولان.

**غلیظ (ج) غلاظ:** ١- توند، پەیت، خەست، چرکە، سۆڵ، قانج، قـەوی، ڕەنگدار، هەسـووهۆڵ، هەڤـەتی، تۆخ. ٢- ئەسـتـوور، ستوور، کەماج، کامە، مانج، کوڵوفت، هۆڵ، درشت.

**- غلیظ الرقبة:** مل ئەستوور، گنێخە.

**- غلیظ الشفة:** لچ قەوی، لچن، لێو ئەستوور.

**- غلیون التدخین:** قەلیـان، سەبیلە، قـەلوون، قەلیـوون، قـەنە، قەننە.

**- وساخة الغلیون:** خلتە، قیر، قیرقەننە.

**غم (ج) غموم (ە):** خەم، خەفەت، پەرۆش.

**غمّاز:** ١- چاو و برۆ هەڵتەکێن .٢- نازدار، نازەنین، نازکەر، نازێ.

**غمام وغمامة (ج) غمائم:** کەشەوور، هەوری سپی.

**غمامة بیضاء:** کەشەوور.

**غـمـامـة (ج) غـمـائم:** زاربێن، بزمـۆک، بزمک، بەلامک، زاربەست، بەرچاوکە، ڤەمتەر.

**غمد (ج) غمود:** کالان، کێلان.

**غَمَر:** ماڵی زۆر.

**غُمر:** بێهۆش، نەگبەتی.

**غمر:** تێهەڵکێشان.

**غَمرة:** تەندوورەزەنە، گەرداو، گێژەنی ئاوێ، گێژ، گێژینە، گێژاو، گێژنگە، شوێنی کۆبوونەوەی چتێکی.

**غمز، غمزة:** چاو و برۆ هەڵتەکاندن.

**الغمز بالعین:** چاو هەڵتەکاندن، چاو داگرتن.

**غمزة:** ١- چاو و برۆ هەڵتەکاندن. ٢- ناز، گریشمە.

**غمس غمساً:** شلپە شلپ کردن، مچ کرن، لە ئاوێدا قوم کردن، لە ئاوێ هەڵکێشان، ژەنن بەناوا.

**غمص:** ڕچقاوە، ڕیپۆقی چاو، چلکی ناو لووت و چاو، ڕیپو.

**غـمض غـمـاضـاً:** چاوترووکـاندن، چاولێکنان، چاونقـاندن، پرکاندن، چاوقووچاندن، چاوپۆشی، بەخشین.

**غـمض العین:** چاوترووکـاندن، برکـاندن، نوکڕاندن، چاولێکنان، چاوپۆشی، بەخشین.

**غمغمة:** مرەمڕی سەگ و پشیلانە.

**غمی:** بێهۆش.

**غَناء:** بێ نیازی، دەوڵەمەندی، هەبوون، هەبێن، بۆچک، دارایی، سوود، قازانج.

**غِناء واغنيـة (ج) أُغـاني:** گـۆرانی، قـام، مـەقـام، دیلان، نەوا، دیلۆک، ستراک، تەرانە، چرین، سۆز، ئاواز.

**غِناء الربیع:** شمژ.

**- غِناء العرائس:** هەڤالی.

**- اغْنية خاصة لتنويم الاطفال:** لایی لایێ، گورگانە شموێ.

**- الترنم بالغناء:** کاسکە.

**- جماعة يتناوبون في الغناء:** گەڕەلاووژە.

**غنّ غناءً:** گۆرانی گوتن.

**مغاني:** هاوچرە.

**- معيد الغناء:** واخوێن.

**غناج:** دوودە.

**غنّام:** شوان، شڤان، چەمچی.

**غنة:** منگە، منە، منجە، دەنگێکە لە لووتەوە بێ، گنە، گنەگن، منجە، منجەمنج، منگەمنگ.

**غنج:** ناز، لارولەنجـە، وەیم، چڤ، عـیـشـوە، کـەشم، کـەشم و نەشم، گریشـمە، لار، لارە، نازونووز، نازونیوناز.

**الغندوب:** گژشەک.

**غنص:** بڕوانە (حزین).

**غَنم (ج) اغنام:** ١- مـەڕ، پەز، مەھ، میـهی، گۆسـپەند، مـەھ، کەترە، مەی. ٢- مێگەل، گەلەڕان

**اغنام:** دەوڵەت، وردەماڵات.

**- الغنم الاطرش:** کەڕە.

**- غنم قصير الاذن:** کەڕێ.

**- الغنم المجزور:** ساپاچ.

**غني:** بڕوانە (غناء).

**غني (ج) اغنیـاء:** دەوڵەمـەند، مـاڵدار، دەوڵەتمەند، هەبوو، ساماندار، کۆک، پارەدار، دارا، بێ نیـاز.

**غني بالمواد الحياتية:** بژوێن، بژوێنی.

**غنغنة:** گـاڵ، گـروگـاڵی منداڵان، منەمن، منگە، منگـەمنگ، منگاندن.

**غنم وغنیـمـة (ج) غنائم:** تاڵان، تاراج، چەپاو، مـاڵی تاڵان، فەرهوود، پەلیسە، مفت، مفتە، مفتێ، وەلیڤەت، ئەوەیە کە لە شەڕێدا لە دوژمنان دەستکەوێ، سوود، قازانج.

**غنين:** گاڵ، گروگاڵ، منەمن، منگەمنگ، منگاندن.

**غواص:** زریەوان، مەلەوان، قلێوی، بینەکێش، ئاووان، مەلەوانی ژێر ئاو، کـەسـێکە بچـێـتـە ژێر ئاوەوە سـا لە رووبار یا لە دەریایاندا.

**غواصة:** ژێر زەریەیی، قوڵتەخۆرە، ژێر دەریایی، ژێراوی، جوورە گەمییەکی شەڕییە بە بن دەریایەشدا دەڕوات.

**غواية:** گومرایی.

**غوث:** بەهاوارای کەسێکەوە گەیشتن، فریاکەوتن، یاریدەدان.

**غور:** قووڵی، قووڵایی، چاڵ.

**الغور في:** بەزەویدا چوونە خوارەوە.

**غور السقف:** داتەپین، داڵمان.

**غـوص:** قـوم بوون، چەقین، مـەلەکـردن، نقـووم بوون، نوقـووم، مەلەکردن.

**غوط:** بڕوانە (انغماس).

**غوطة:** چوونە ناو ئاوەوە، خۆ لە ئاوێدا قومکردن.

**غوغاء:** کوتەکوت، هەللا هەللا، کێشە کێش، خەڵێکی زۆر کە تێکهەڵباوێ.

**غول (ج) اغـوال:** دێو، درنج، دەئێـڤـە، دیوەزمـۆکـە، دێوەڵووکـە، مێردەزمە، ئەرژەنگ، داعب، جانەوەرێکە تەنها ناوی هەیە.

**غَوي:** گومرا، کەسێکە خەریکی هەوا و هەوەسی خۆی بێ.

**غَيّ:** گومراهی، ناهومێدی.

**غَيّاب:** ١- پاشبێژ، پاشدوو. ٢- پاشملە.

**غياب:** بزری، گومی، ونی، پەنام، بزربوون، نەدیوی، هۆیلیان.

**غِيابي:** بەربوورە.

**غِياث:** دادڕەسی، فەریاد ڕەسی، هاوار، هاوارهاوار، هاواروداد، هاوار و بانگ، زارەزار، هاوارکـردن، داوای یارمـەتی کـردن، دەستگرتن، زارزار، زاربێن.

**الغياث:** ئەی هاوار.

**غيب (ج) غياب وغيوب:** بزر، نەدیو، ون، پەنهان.

**- صانع الغيب:** نهێنکار.

**- عالم الغيب:** نهێنبین.

**- علم الغيب:** نهێنبین.

**غـيـبة:** ١- خـوسپ، خوسـپـە، بەدوێژی، پاشـملە، پشـتی سـەر، پشتملە، نەکامی، خوسپە، پاشگۆتین، پاشبێژی، پاشدوویی، پژملە، پشتەسەر، پشتی سەر، پیوار، خراو وتن، خراوە وتن. ٢- نادیاری، نەدیوی، پەنهان بوون.

**غيبي:** نادیتە.

**غيث (ج) غيوث واغياث:** بارانە، گیایەکیشە کە بە ئاوی بارانە بڕوێ.

**غير:** ١- تر، نیـتـر، نیدی، ئیـدیکە، ون، ئانگۆ، پاشین، دیتر، مـەر، مـەگـەر، هێلە. ٢- بێ، بێـجگە، جگە، بەدەر، بەبێ، خەین، بژ، بل، بەرجا، بێلە، بێژگە، ژبل، بێژ، بێ ئەوە. ٣- نا، نەء، نەو، نەی، ناء.

**اغيار:** بێگانە.

**- غير اختياري، غير ارادي:** دڵ نەبردن، دڵهەڵنەگرتن.

**- غير اصيل:** ناڕەسەن.

**- غير اولي:** خۆگر (لە جەبر)دا.

- **غير رسمي:** کرەنا، پەتەری، کەرەکەر.
- **غير قابل الشرح:** چمانی.
- **غير متغيّر:** نەگۆڕاو.
- **غير مختلف:** یەکڕەنگ، تەبا، بەسەرویەر.
- **غير مؤدب:** لە (أدب)دا بیدۆزەوە.

**غيرة (ج) غير:** ١- زان، دەمار، ئازایی، پرکێش، هۆرە، زاخ، کەیفەرات، نامووس پەرست. ٢- ڕق، قین، ڕک.

**غيرة:** خۆێنبایی، هەوا، فیز.

**غيسان:** تووڕەیی جوانی و جحێڵی.

**غيضة:** نزار، نسرم، نسار، نەزار.

**غيط:** بێستان، دارستان.

**غيظ:** بڕوانە (بغض).

- **شدة الغيظ:** زگ پڕبوون.
- **كظم الغيظ:** هێوڵی، ڕق و کین خواردنەوە و دەرنەبڕین.

**غيلم:** جللە، سوێروو، جەلە، کیسەڵ و ڕەقەی زۆر گەورەیە.

**غيم (ج) غيوم:** بڕوانە (سحاب).

**غيور:** بڕوانە (شجيع).

**غيوم مظلمة:** هەورانی تاریک.

# ف

**ف:** پیتی بیستەمینی ئابێتی عەرەبییە.

**ف:** بۆ دواخستنێکی نێزیک بەسەر وشانەوە دەنووسێ وەکو **اقرأ هذه الجریدة فذلك.**
ئەم ڕۆژنامەیەی بخوێنەوە دوایە هۆوە (ئەوە). **قام زید فعمر:** زەید هەستا دوایە عمر.

**فؤاد (ج) افئدة:** بڕوانە (**قلب**).

**فأر (ج) فئران:** مشک.

**فأس (ج) فؤوس:** بیور، تەور، تەوەرداس.

**فأل:** گەشبینی.

**- تفاءل:** گەشبین بوو.

**فائدة (ج) فوائد:** کەلک، سوود، قازانج.

**فائز:** سەرکەوتوو، ڕزگاربوو، پیرۆز.

**فائض (ج) فیضان:** لێوڕێژ، لیپان، لیپاولیپ، لێشاو.

**فائض العمل:** لێشاوی کار.

**فائض القیمة في الاقتصاد:** لێشاوی نرخی ئابۆری، لێشاوی بایەخ.

**فائق:** ١- دەستەڵاتدار، چیرە، سوار، بەرزتر، زاڵ، زۆرتر، سەرکەوتوو. ٢- بێدار، بەئاگا، وشیار.

**فاتح (ج) فاتحون:** ١- ئاوەڵەکەرەوە، دەرگاکەرەوە. ٢- وڵاتگر.

**فاتح البخت، عرّاف:** فاڵچی، جادووگەر، جادووساز.

**فاتح الممالك:** وڵاتگر، کیشوەرگیر.

**فاتح الشهیة:** ئیشتیادەر، ئیشتیا خۆشکەر، ئیشتیاکەرەوە.

**اللون الفاتح:** کاڵ، ڕەنگی کاڵ کراوەوە.

**فاتحة (ج) فواتح:** سەرەتای کار، بەرایی چتێکی.

**فاتحة الکتاب:** سەرەتا، پێشدەستی.

**فاتر، ماء فاتر:** شیرە و گەرم، شیلە و گەرم، شرتێن، گەرم و سارد.

**فاتك:** سست، بێ تین، دلێر، بێ باک.

**فاجر (ج) فجار:** ١- داوێن پیس، حیز، بەدکار، پاشڵ پیس. ٢- جادووباز.

**فاتن:** پەشێوکار، گومڕاکار، لەگێچەڵ و هەرا ئاوێژتن.

**فاجرة:** لەوەن، جندە، سووزمانی، ئافرەتی سووک، داوێن پیس.

**فاجع:** ئەوەیە کە ببێتە هۆی خەم و خەفەت، کارەسات.

**فاجعة (ج) فواجع:** ڕووشە، هەنگامە، کۆست، جەرگبڕ، جگەربڕ، دڵسووتێن، شوورەت، دڵسووتاوی، کارەسات، هەنگامەی پشت شکێن.

**فاحش:** بڵح، زۆر گەند و خراپ، بێ ئەندازە خراو، ناحەز، ناشیرین.

**فاحشة (ج) فواحش:** سەڵیتە، سازندە، دەستما، فەلتۆبی، فەلهیتە، حەشەری، جندە، قاحپە، سووزمانی، ئافرەتی حیز، کەولی، کاولی، خووارۆ، تڕۆ.

**فاحص:** پشکێنەر، لێکۆڵەر، تاقیکار.

**فاحم:** ١- ڕەشێکی زۆر ڕەش. ٢- ناوی وەستاوی نەجووڵاو.

**فاختة (ج) فواخت** (ە) کۆترە باریکە، کۆترەکێویلە، تفتیلک، ترینکە، تویل، عانە.

**فاخر:** ١- گرانمایە، هێژا، نرخدار. ٢- بەرز، باش.

**فادح، فادحة (ج) فوادح:** کاری گران و سەخت.

**فادن (ج) فوادن:** مرازێکە بەننایان بۆ زانینی ڕاستێتی دیوارانی بەکاردەبەن کە لەسەرەوە شۆڕکرێتەوە خواری ڕاستی و چەوتی دیواران ئاشکرا دەبێت، شاوول.

**فارة (ج) فیران:** مشک، مووش.

**سم الفار:** مەرگەمووش.

**فارز:** دابڕدەر، جوێ کەرەوە، هەڵوێست.

**فارزة:** بۆر، دابڕ، بێنکە (ڤیرگول).

**فارس (ج) فرسان وفوارس:** ١- سوار، ئەسپ سوار، سووریار. ٢- خاکی پارس.

**الفارس الرشیق:** شۆڕە سوار.

**الفارس الماهر:** شاسوار، کەڵەسوار.

**فارسي:** لەمەڕ فارس، زمانی فارس.

**فارسية:** زمانی فارسی، زمانی پارسیی.

**فارع:** بەرز، بڵند.

**فارع القامة:** بالابەرز، کەڵەگەت.

**فارغ:** بەتاڵ، خاڵی، پووت، پووچ، چۆل، ڤالا، هوڵۆل، هێسا، وەتاڵ، باهر، پووتەل، پووت، پووچەڵ، هاڵیێ، هۆڵ.

**فارغ البال:** دڵنیا، سەرسووک، دڵ ئاسوودە، ئارام.

**فارق:** جوێ کەرەوە، دابڕەدەر، هەلاوێر.

**فارهة:** ئافرەتی جوان و شۆخ و شەنگ.

**فاروق:** بڕوانە (**فارق**).

**فاسد:** خراپ، گەند، بۆگەن، ئالۆس، خەلیتخە، دارزاو، گەن، گەندەژە، خراو، گەنی، گەنیک، گەنیو، ئابوو، هیمی، چرووک، تەوا.

**فاسد الاخلاق:** بەدخوو، بەدڕەفتار.

**فاسق (ج) فساق:** دڵکۆچەر، پاشڵ پیس، خوردە، خواردە، بێ ئایین، سۆتە، لۆتی، ئەو کەسەیە لە ڕێگای خودا لابدات، داوێن پیس.

**فاصل (ج) فواصل:** تیغە، دابڕ، ناوبڕە، دەپە، بەرچیت، تەبارە، تەلاش، چیت، جوێ کەرەوە.

**ذات فواصل:** شاش.

**فاصلة (ج) فواصل:** ١- میانە، جیایی، بەین، ماودا، دۆژ، ماخ، ناو، نێوان، ناوەند، ماوە، مەودا، ساڤبەر، ناڤبێن، باخوەر، دووری، دووریێتی، فەرک، ناڤبرک ٢- وچان، هەوا خووەر.

**فاصم:** فیوز.

**فاصولية:** فاسولیە.

**فاض:** بەتاڵ، وەتاڵ.

**فاض فيضاً:** زۆربوون، هەستان، ڕەوان بوونی سێلاو، لافاو هەستان.

**فاضل (م) فاضلة (ج) فضلاء:** کارزان، کارناس، زانا، هونەرمەند، ئاخوەوەند.

**غير فاضل:** بێ هونەر، ناشارەزا، بێ هەست، بووردووت.

**فاضي:** ١- فراوان، بەرز ٢- بەتاڵ، خاڵی، پووچ، پووچەڵ.

**فاطر:** ئافەرێنندە.

**فاطمة:** ژنێکە منداڵی لە مەمک کردبێتەوە.

**فاطن:** زیرەک، زرنگ.

**فاعل (ج) فاعلون:** بکەر، بکر، بکار، کارگەر، پیشکار.

- **اسم الفاعل:** ناوی بکەر.
- **فاعل المختار:** ناڤبر، نێڤچی.

**فاغية:** گوڵ و لکی خەنەی، هەر خونچێکی بۆنخۆش بێ.

**فأفاء:** کەسێکە لە ئاخۆتن و خوێندنەوەدا پیتی (ف) دووپات کاتەوە.

**فافعل:** دەیسا، دەیسادەی، دەیچا، دەجادەی، دەبکە.

**فاقة:** نەداری، دەستکورتی، هەژاری.

**فاقد:** ١- لە دەستچوو، گومکار ٢- ژنێکە مێرد یا منداڵی مردبێ.

**فاقد الطعم:** بێ تام، کەلە.

**فاقد الشعور:** بێ هۆش، هۆش لە دەست چوو.

**فاقد الوعي:** بێ هەست، بیابان.

**فاقع:** زەردێکی تۆخ، بەهەموو ڕەنگێکی بێ پەڵەش دەڵێن، گەش.

**فاكهة (ج) فواكه:** میوە، مێوە، هەسوو، باکۆفە، تەڕە، تەڕەکاری، فێقی.

- **فاكهة غير ناضجة:** زرک، کاڵ، نەگەیشتوو.
- **نضوج الفاكهة:** هرمژین، گەیشتنی میوە.
- **بائع الفواكه:** میوە فرۆش.
- **طلائع الفواكه:** نۆبەرە (میوە).
- **فواكه حمضية:** میوەی ترش.
- **فواكه نفضية:** میوەی وەریو.
- **مخزن الفواكه في الشتاء:** لیان.

**فال (ە):** فاڵ، نەخشەی چاک، نوقلانە.

**فالج:** گۆج، گێر، لە گۆکەوتوو، ڕەقێتە، گۆت، ڕێنجۆ.

**مرض الفالج:** شەپلە.

**مفلوج:** گۆج، شەپلە لێدراو.

**فالق:** قەڵشێنەوە، ئافەرێنندە.

**فالق الاصباح:** قەڵشێنەر، دەرخەری سپێدە.

**الفالوذ:** پاسووق.

**فالوذج** (ە) پالوودە.

**فانوس** (ە) فانووس، فەنەر، چرای دەستی.

**فانوس صغير:** فەنەرک.

**فانوس الصيد في الليل:** شووارە.

**فاني:** ناپایەدار، ناجەسە، نابووت، لەناوچوو.

**فانيذ:** نەبات، نەوات.

**فاوض مفاوضة:** لەکاردا بەرانبەرێتی یەکتری کردن، هاوکاری و هاوبەش کردن.

**فاهي:** بێ تام، کەلە، ڤرتۆنی.

**فايض:** ١- دارێژەر، لێورێژ ٢- بەهرەگەیێن.

**فبها:** ئیتر زۆرباشە، چەند باشە.

**فتاء:** جوانی، جوامێری، جحێڵی.

**فتائق:** بڕوانە قتب.

**فتاة (ج) فتيات:** گەورە کچ، گەورە کەنیشک، گەوگەمری، بەربەخت.

**حياة الفتاة:** کچێتی، ژیانی کچێتی.

**فتات وفتاتة:** وردە، هوورک، هوورک و پوورک، ورتکە، وردکە، رزیو، داوەشاو، رزیاگ.

**فتات الخبز:** ورتکەنان، هوورتکەنان، ریزەنان، کورتەڵ.

**فتات السكر:** خاکەقەند.

**فتاح:** دەرگای داد و ڕاستی کەرەوە، گرێی کاروبارکەرەوە.

**فتّاك:** کوژەر، کوژندە، لەناوبەر.

**مرض فتّاك:** سندان.

**فتّال:** بادەر.

**فتانّة (م) فتان:** ١- گێچەڵ هەڵایسێن، سەربەگێچەڵ ٢- جادووگەر، دڵڕفێن، نەشمیلە ٣- دز، ناپاک ٤- دێو، درنج.

**فتح:** کردنەوە، ئاوەڵە کردنەوە، ڤەکرن، ڤەدان، وازکردن، داچەکاندن، ڤالاکردن، بالان ٢- داچەقاندن، درین ٣- پیرۆزی لە کردەوە و شەڕێدا، ولاتگرتن.

- **تح الازهار:** پشکووتن، پشکواندنی گوڵان.
- **فتح الباب:** دەرگاکردنەوە، دانەلا.
- **فتح الجرح او الدمل:** ئاخڤاندن.
- **فتح الدمل:** ئاخڤاندن، زاری قوونێرکردنەوە.
- **فتح الطريق:** ڕێگاکردنەوە، ڕچەشکاندن.
- **فتح الممالك:** ولاتگرتن، ولاتگیری.
- **فتح الموضوع:** دەرگای سڤن کردنەوە، دەرگای دەستاوێژ.

**فتحة:** ١- سەر، بەر (َ) زەبەر ٢- کەلەبەر، دەرفەت، کەلێن.

- **فتحة الخروج:** بوودر.
- **فتحة العين:** سۆما.

**فتر:** قولانج.

**فترة (ج) فترات:** ماوە، وچان، ئارامییە لە نێوانی دووجارە نۆبەتێیاندا، ماودای نێوانی دوو پێغەمبەر و یا دوو دەوڵەتاندا.

**فتّش فتشاً:** لێپرسین، لێکۆڵینەوە، گەڕان، بەسەرکردنەوە، پشکنین، پشکناندن.

- **مفتّش:** لێپرس، پشکێنەر، پشکنر.

**فتق:** ١- هەڵتەکاندن، هەڵدرین، هەڵدرینەوە، هەڵچەڕاندن، هەڵپشکاوتن، ورگدڕاندن ٢- گونکی، دەبەیی، وەتەبا، دەردێکە کە بەهۆی دڕانی پەردەی ڕیخۆڵان و ڕژانی پیوی ناوزگ یا هەندێک ڕیخۆڵە پەیدا دەبێ و گونیشی پێ نەستوور دەبێ.

- **فتق بطن:** گەدە، ورگەپۆست.
- **فتق الملابس ونحوه:** هەڵپچەڕین، هەڵپچڕین.
- **مفتوق:** ١- قۆڕ، گونک، دەبەگون، ڕتڵۆ، گوندڕاو، دەبەگونک، گوندە، وەتەبا، ورگ دڕاو ٢- هەڵتەکاو، هەڵپچڕاو.

**فتك:** کوژتن. لەناکاو لەناوبردن.

**الفتل (الحبل):** بادان، ڤادان، وادان، هلچناندن، هۆنین، هۆنینەوە.

- **محكم الفتل و الابرام:** کرژ، کژ، کشت.
- **فتل الوجه:** ڕوو وەرگێڕان.

**فتّن فتنتاً وفتوناً:** دووزمانی کردن، تێچاندن، پۆلک کردن، پێکوڵچاندن، هەڤانی کرن، ناپتەری، گژکرن، هێلە.

- **اثارة الفتنة بين الاصدقاء والاقارب:** لێک کردن، شت هەڵاییساندن.
- **اثارة الفتنة:** گژکرن، گژگژاندن، گێچەڵ هەڵاییساندن.
- **احداث الفتنة:** گژکرن، گژگژاندن، گێچەڵ هەڵاییساندن.
- **احياء الفتنة:** گژکرن، گژگژاندن، گێچەڵ هەڵاییساندن.

**فتنة (ج) فتن:** ١- دووزمانی، هەڤانی، دۆخمانی، بەیی، جوداکاری، پۆلاو، پۆلای، کەپوورە، زڵە، هوورا، ئاژاوە، پشێوی ٢- جوانی.

**فتوة:** ١- لاوی، لاوێتی، گەنجی، لاوچاکی، لاوێتی، جحێڵی، جوانی، تۆلازی، خۆرتانی، خۆرتی، گەنجایەتی ٢- ڕەندی، جوامێری، مرۆیەتی، جامێری، دڵفراوانی.

**فتوح (ج) فتوحات:** ولاتگرتن، ولاتگری.

**فتور:** ١- بێ هێزی، بێ تینی، سستی ٢- دوای تووڕەیی، هێدی و ئارام بوون، دامرکانەوە، قەلەمنار.

**فتّورة:** بابەتی پێوان، پارچە (قماش).

**فتوى (ج) فتاوي:** تۆڵکێشان، ڕێدان.

- **فتوى دينية:** ڕێدانی ئایینی.
- **مفتي:** ڕێدەر، تۆڵکێش، زانایەکە بەپێی دەستوورانی ئایینی تۆڵ بۆ کاران بکێشێ.

**فتى (ج) فتيان:** لاو، گەنج، خۆرت، جحێڵ، نۆچە، جوان، تۆلاز، تازە پێگەیشتوو، گاڵ، هەرزەکار، ڕووڵ، لاوچاک، کوڕەلاو، کوڕوکاڵ، نەوهال.

**الفتيان:** شەووڕۆژ.

**فتيت:** وردکراو، ورتکەنان.

**الفتيتة:** ورتکەنان، ڕیزەنان، ڕیزەوڵ.

**فتيلة (ج) فتائل (ە):** فتیلە، پلیتە.

**فَجٌ:** ڕێ، ڕێگا، ڕا.

**فُج:** لچن، کەسێکە لێوی خوارەوەی شۆڕبێ.

**فجأة، مفاجأةً:** لە ناو، لە هیکرا، ناکام، لە نەکاو، ژ نشکاڤە، نشکۆ، ژ نشکڤە، کوتوپڕ.

**فجائع الحرب:** پەرژەنگ.
**فجائي:** لەپڕ، کوتوپڕ، کوتاومت، لە نەکاو.
**فجاج:** ڕێ، ڕێگا.
**فجاج:** فراوان، بەرین، پان.
**فجاجة:** چەقالە.
**فجر:** ١- سپیدەدەم، سپیدەی بەیانی، گوترا، ئەلند، تاریک و ڕوونی بەرەبەیانی، کازیوە، بەربانگ ٢- خۆهەلکێشان.
- **فجر الشباب:** سەرەتای گەنجێتی و جحێلی.
- **قبل الفجر:** بەرەبەیان.
- **مع الفجر:** بەیانەکی، بەیانیان.
- **فجر الصادق:** سپیدە، پەهنا، سپیدە پەهنا.
- **فجر الكاذب:** سپیدە بالا.
**فجر فجراً وفجوراً:** ١- درۆکردن ٢- داوێن پیسی کردن.
**فجع:** کۆست کەوتن، پشت شکان، زگ سووتان، تووشی کارەسات هاتن.
- **مفجوع:** کولافە، دلشەوتی، کۆست کەوتوو.
**فجل:** توور، ترپ، تڤر، ترەو، تلپ، تلپاس.
- **الفجل الملبد من البرد:** قانگ، قەم، تووری قانگ.
**فجوة:** جێگای گوشاد و فراوان.
**فجور:** داوێن پیسی، پاشل پیسی، گوناح کردن، بێ گوێیی، درۆکردن.
**فجيع:** بەدبەختی هێنەر، وە ئێش و ژان هێنەر.
**فجيعة (ج) فجائع:** بەدبەختی، چارەرەشی، ڕووشە، کارەسات.
**فحّاش:** بەدگۆ، بەدوێژ، زمان پیس.
**فحّام:** خەزوولفرۆش، خەلووزفرۆش، ڕەژی فرۆش.
**فحست:** فیکەی ماری.
**فحش:** ١- جنێو، جوون، کردەوەی خراپ، وتەی خراپ، بەدگۆیی، کاری بەد ٢- داوێن پیسی.
**فحشاء:** ژنبازی، جندەبازی، خراپە، ناپەسندی، داوێن پیسی، گوناهی گەورە، کاری ناشرین.
**فحص:** بەسەرکردنەوە، پشکنین، لە دووگەڕان، لێکۆلینەوە، پشکاندن، پشکانین، لێ گەڕان، مالپشکنین، تێ ڕوانین، دۆزین، نۆڕین.
- **فحص طبّي:** نۆڕینی پزشکی.
- **مفحوص:** پشکێنراو.
**فحفح:** پرخەپرخ کردن لەکاتی نوستنێدا.
**فحل (ج) فحول:** نێر، کەل، نێرە، نێرەوس، بۆ ئەسپ و وشتر و ئیتر بەکاردەبرێت.
- **الفحل الغير مخصي:** کەلەگا.
- **فحل البقرة والكبش:** کەل.
- **فحل الشجرة:** نێرە، کەلەدار.
**فحم:** ڕەژی، ڕەژوو، خەلووز، زووخال، سووخال.
- **فحم نباتي:** ڕووەکە خەلووز.
- **فحم حيواني:** ئاژەلە خەلووز، خەلووزی پاژەل لە (کیمیا)دا.
- **فحم الحجري:** بەردەخەلووز، قیرژە، نوورە، ڕەژووی بەرد، مەیانە.
- **فحم السكر:** خەلووزی شەکری.
- **دقيق الفحم:** گەردە، خاکەی ڕەژوو.
- **غبار الفحم:** گەردە، خاکەی ڕەژوو.
- **مفحمة:** خەزوولدان، سووخالدان، ڕەژوودان.
**فحواء (ج) فحاوٍ:** ١- وێر، واتا، واتای وتار، مانا ٢- پێشوێن (عنوان).
**فحول:** کەلەگەل، گەورە پیاو، پیاوی بژاردە.
**فحوى (ج) فحاوي:** وێر، واتا.
**فحيح الحية والسلحفاة:** گیف، گیفاندن، کیفەکیف.
**فخ (ج) فخاخ:** فاقە، خەپک، خەپکە، تەلە، داو، تۆڕ.
- **نصب الفخ:** تەلەدانانەوە، تەلەنانەوە.
**فخار:** نازکردن، شانازی کردن.
**فخار:** گلێنە، قاپ و دیزە و گۆزە و چتی تری لە گل دروستکراو
**الاناء (من) الفخار:** کاسە و قابی چینی.
- **قطع الفخار المكسورة ونحوه:** قاشیلە، قاشولە.
**فخاري:** چینی (قاپ و نامان).
**فخاري:** دیزە و گۆزەکار، دیزە و گۆزە فرۆش.
**فخامة:** ئەستووری، قەلەوی، پایە بەرزی، پایە بلندی.
**فخت:** مانگەشەو، کولانە و ڕۆچنەی سەربانی.
**فخذ:** ڕان، کاماخ، ئێت، هێت، ڕەهن.
- **اصل الفخذ:** قولتەی ڕانی.
- **مفصل الفخذ:** کلۆمک، نێک.
- **بين الفخذين:** بروانە **(عورة).**
- **انخلاع فخذ الدابة:** فیو تەرک.
**فخر:** شانازی، شۆگایی، ناز، سەربلندی، گەورەیی، قوونەت، گەنجە، پێ خوڕین، فوڕت، فیز، قوننەن، کۆلکە.
**فخر فخراً:** شانازی کردن، نازکردن، پێ خوڕین، خۆهەلکێشان.
**الفخفخة:** ١- شەقەشەقی قاقەزی، خشەی جلی تازە، خشەخشی پۆشاکی تازەیە ٢- لە خۆڕا شانازی کردن.
**فخم:** ١- جاجمێکە لە ژێر داری بەردار دەکرێتەوە تا لە کاتی تەکاندنێ دا بەرەکانی بکەوێتە ناوی ٢- پایەبەرز، گەورە ٣- وشەی زل و شەهتۆت بێ.
**فخور:** بەخۆفش، خاوەند فیز، شانازی کار، سەربەرز.
**فخم:** پایەبەرز، گەورە، زل، زەلام، مەزن.

**فداء**: ١- قوربان، گۆری، بالاگەردان، دەبەرمردن، سەردانان، سەرگەرد، لە خۆ بووردن ٢- ئەوەیە لە تۆڵەی گیراواندا بدرێ.

- **انا فداك**: ئەزگۆری، ئەمن بەقوربانت بم.
- **فداك أبي**: بابم بەقوربانت بێ.

**فدان (ج) فدن**: جووت، هیت، هیتە.

- **انتاج الفدان**: بەرەجووت.
- **مرجع الفدان في الحقل**: گاگێڕەوە، گاوەخان.

**فدائي**: لە خۆ خۆشبوو، لێ بووردوو، سەردەر، لە خۆبووردوو.

**فدر (ج) فدور**: بڕوانە (وعل).

**فدوة**: گۆر، قوربانی، گاووگەردوون.

**فدية**: ١- قوربانی، گاووگەردوون، پێناو، پێشیار، سەرانە ٢- چتێکە ئێخسیر و دیلی پێ دەکڕێتەوە.

**فر فراً وفراراً**: هەڵات.

**فر**: لەلە (هی داری).

**فرّاء**: کەوڵفروش، کەوڵێن.

**فرات**: زێیەکی گەورەیە دەرژێتە دەریای فارسیەوە.

**فرادى**: یەکیەکە، یەکەیەکە، یەکیەک، تاکو تەنیا، تاقتاق، تاک و لۆک، تاق و لۆق، بێ هاوتا.

**زوجاً وفرادى**: یەکیەک و دوو دوو.

**فرار**: فرەکردن، ڕەمکردن، هەڵاتن، ڕەوین، قاچاندن، پرتە، ڕاکردن، ڕەمین، ڕەوینەوە، سەردەرکردن، فرکە، وایێن، غاردان، بەزین، دەرچوون.

**فرّار**: زۆر غاردەر، زۆر ڕاکار.

**فرّارة**: تاوڵەمە.

**فراري**: قاچاخ، هەڵاتوو.

**فراسة**: تێگەیشتن، پەی پێبردن.

**فراش (م) فراشة**: پێشکار، بەردەست، پێشدەست، فەرش ڕاخەر، نوێن ڕاخەر، ڕایێخ ڕاخەر.

**فِراش**: نوێن، پێخەف، شەویس، نڤێن، داخەر، ڕاخەر، ڕایەخ، ڕایاخ، ڕایێخ.

**فِراش النوم**: نوێن، پێخوف.

**فَراش من انقى الصوف**: لۆپ.

**فَراش**: لالغاوە، لغاوەی زاری.

**فراشة**: پەپوولە، پەروانە، بەلاتینگ، پەریەریک، بەلیتانگ، پەریوولە، پلپلە، منمنیک، بەلبەلاسینگە، بەلبەلیتانگ، بەریتانگ.

**فراعنة**: بڕوانە (فرعون).

**فراغ**: بلاوە، گوشادی، ئاسوودەیی، لەکاربوونەوە، بۆشایی، چۆلی، بەتاڵی، ڤالاهی، هوڵۆڵی.

**فراغ الجرح**: قەوارەی برین.

**فراغة**: دەستپەرژ، دەرفەت، کەلێن، لەکاربوونەوە، بێکاری، پەردژ، پەرژان، سۆنگە، شێنە، شێنەیی، ئاسوودەیی، ئارامی.

**فراق**: دووری، جودایی، جیایی، جودێیی.

**فرث**: سیخوڕ، شیاکە، پیسایی شلە بە ورگ و پاشڵی ئاژاڵ و وڵاخانەوە دەنووسێ.

**فَرَجَ**: گوشادی، فراوانی، ئافاقە.

**فرج فرجاً**: کردنەوە، ئاوەڵەکردنەوە، گوشادکردن.

**فرج (ج) فروج**: ئەندامی شەرمی ئافرەتانە، شەرمگا، قوز، کوز، کوس.

**فرجار** (ه) پەرگار.

**فرجال** (ه) پەرگار.

**فرجة**: فلچە، فرچە، قاشاوی وڵاخداران.

**فرجة (ج) فُرَج**: نێوانی چتێکی، قەڵەشت، کەلێن، گوشادی.

- **الفرجة بين شفتين**: ڤروج.
- **الفرجة بين صنوين**: قاپانە.

**فرجون**: قەشاو، حەنک، تۆزەک، قاشاو، ڕنەکی وڵاخانە.

**فَرَح**: خۆشی، کەیفخۆشی، خۆشی خۆشی، دڵشادی، ڕەزم، شادمانی، ئافاقە، سوور، شایی، سووری، کەیف، دڵخۆشی.

- **افراح الزفاف**: سووران، سوورانە.

**الفرح**: دڵخۆش بوون، خەنی بوون، کەیفخۆش بوون، شکوتن.

- **مجلس الفرح**: بەزمگە.
- **يوم الفرح**: چارشەمە سووران، چوارشەمە سوورە.
- **ظهور السرور والفرح**: ترینگە، شادی.
- **اغماء من الفرح**: شاگەشکەبوون.
- **شدة الفرح**: گەشکە، شاگەشکە، شایی شایی.
- **فرح القلب**: دڵشاد، دڵخۆش، کەیفخۆش.

**فرحان**: کەیفخۆش، شادمان، دڵخۆش، خەرۆ، هاش، خەنی، دڵشاد، شا، گەش، دڵشاد، دڵگەش، ڕووخۆش، کەیفخۆش

**فرحة**: شادمانی

**فرخ (ج) افراخ وفراخ وفروخ** (ه): ١- فەرخە، جووجە، جووجەڵە، جووجیلەی باڵندە و بێچووی ئاژاڵانە، بێچوو، زەرنەقووتەڵە ٢- منداڵ، ڕچە، بەچکە.

- **افراخ كبيرة الحجل**: بارەکەو.
- **فرخ الحيوانات**: بێوڵە، دۆل.
- **فرخ الكلب**: تووتک.

**فرد (ج) افراد**: تاک، کەس، تاق، تەنیا، تەنها، باد، پێزە، تاکە، تەک، بێ هاوتا، بێ وێنە، هەڵکەوتوو.

**فرداً**: یەکێ، یەکێک.

**فرداً فرداً**: یەکاویەک، یەکەیەکە، یەکیەکە.

**مفرد (ج) مفردات:** تاک، تاقانه، تاکانه، تاق، تەنها، تک، یەکتا.

**- بائع المفرد:** تاکفرۆش.

**- افراد قلائل:** تەراک، تاک و تەراک.

**فردة:** تا، تابار، لابار.

**فردوس (ج) فرادس:** بەهەشت.

**فردي:** تاکی، کەت.

**الفرز:** شێو، دۆل، دەرە.

**فرّز:** بڕیاری بنج بڕی خۆی لەسەر دا.

**فرزان** (ە) فەرزین لە شەترەنجێدا.

**فرزدق (ج) فرازق:** ١- کولێوی نانییە، کولە ٢- ئەنگوتک.

**فرس (ج) فروس:** ١- مایین، ماهین، سەهەنەک، هێچک ٢- ئەسپ، ولاخی بەرز

**- فرس صغیر:** بالە

**فرسان:** دەستە سوارێک

**فرسخ (ج) فراسخ:** (ە) فرسەنگ (١٢٠٠٠) گەز و سێ میلە.

**فرش:** ڕایێخ، فەرش، شەلتە، مافووره، بەرە، ڕایەخ.

**الفرش:** ١- ڕاخستن، داخستن، تەپساندن، ڤەکشاندن، دامداندن، ڕامەزاندن، تۆل کرن، بیاوە شەرە، ڕایێخستن ٢- ئاشکراکردن.

**فرشاة:** فرچە، فلچە، قەلەمی مووێن.

**فرشة الملابس وغیره:** پرچە، پزنچە، فلچە، ماووتمال.

**فرصاد:** توو، تفی، تووێ، تی، شاتوو، گاتوو، تووی سپی.

**- فرصاد مجفف:** هیشکۆلک، تووی وشک.

**فرصة (ج) فرص:** دەرفەت، هەل، هەلکەوت، کەلێن، چەخش، کەیس، پێلیسک، کێس، بەرکەڤ، پات، پەردژ، پردژ، پشوو، سەرسەدە، سۆنگە، کەلەبەر، ماوە، مەیدان، وچان، بێن، ورینگ، دەلیڤە، دەسپەرژ، دەسرەس، سۆنگە، شێنەیی

**- فرصة في المدارس:** وچان، بێن.

**- اتاحة الفرصة:** ماوەدان.

**- انتهاز الفرصة:** بەهەلگەیشتن، دەرفەت دەستکەوتن، دەرفەت دۆزینەوە.

**- سنوح الفرصة:** هەلکەوتن، هەل هەلکەوتن.

**فرض (ج) فرائض وفروض:** ئەوەیە کە خودا لەسەر بەندەی خۆی گەرەک کردووە، گەرەک، پێویست.

**- فرض الشيء:** وەگرتن، وەدانان، واگرتن.

**- مفروض:** ١- گەرەک کراو ٢- دراو (لە ئەندازیاری).

**فرضاً:** گریمان، مەگرتی، دەمبر، بگرە، وەبگرە، گرتمان، وەبزانە، وادانێ، وادابنێ.

**- لنفرض:** گریمان، گرتمان، وەبزانین.

**- فرضنا:** گریمان، وامان دانا، مە گرتی.

**- إفرض:** وەبزانە، وادابنێ، وابگرە.

**فرط:** لە سنوور تێپەڕین، زیادەڕەوی.

**فرط الكرم:** لووچەک.

**فرع (ج) فروع:** ١- چکۆلە، گچکە، بەچکە ٢- لک، لق، پەل لق و پۆپ، لیپ، لکی داران ٣- لک، لق ٤- مندال، ڕۆلە

**فرع الجبل:** باسک، ملە.

**فرع العنقود:** زەنگەتە.

**فرعون (ج) فراعنة:** میصرییانی پێشوو بەپادشای خۆیان دەگوت فیرعەون دەشیان پەرست. (٢٦) زنجیرە فیرعەون لە میصرێ ژیاون یەکەمینیان ناوی منێس بووە کە ٥٠٠ سال پێش عیسا بووە واتایەکەشی: سەرکێش، خۆپەرست، زۆردار، فیزداریش هاتووە.

**فرغ فرغاً:** ١- لەکاربوونەوە ٢- بەتال بوون.

**الفرغل:** بێچووە کەمتیار.

**الفرق:** جوێ کردنەوە، هەلاواردن، لێک کردنەوە، قەتکردن، ژهەڤکرن، ژهەڤگرتن، گەمراندن، جوایەزی، جودایی، جودا، جیاوازی، جیایی.

**- فرق بینهما فرقاً:** جوێ کردنەوە.

**- فرق بین المربعین:** جیاوازی نێوانی دوو دووجا.

**- فرق البحر:** دەریای شەق کرد.

**- فرق بین المكعبین:** جیاوازی نێوانی دوو سێ جا.

**- فرق الشعر فرقاً:** پرچی بەشانە دیغ تێ خست.

**- فرق الطائر:** جیقنە، ڕیقنەی کرد.

**- فرق الشيء:** پەڕاگەندە و جودا جودای کرد.

**فرّق:** بڕوانە (تفریق).

**فَرق، فرقان:** ڕێگایە لە نێوانی تووکی سەریدا، شوێنی سەری، خەتی سەری.

**فرقان:** قورئان، چتی ڕەوا لە هی ناڕەوا جودا.

**فرقة:** جودایی.

**فرقة (ج) فرق:** داروودەستە، دەستە، کۆمەلە، بتۆم، تیپ، گرۆ، داروودەستە، لەشکر.

**- فرقة ریاضیة:** تیپ.

**- فرقة الاشبال او الطلائع:** تیپی بەچکەشێران، تیپی پێشەنگان.

**فَرقد:** گوێلک، ناوی ئەستێرەیەکی لە نزیکی قطبی باکووری.

**فَرقدان، فرقدین:** شەنگلە بەرەکەت، سنجاب، جووتەی هەنجیران، دوو ئەستێرەن لە نزیک قطبی باکووری.

**فرقعة:** تەقە، تەقەتەق.

**الفرقعة:** تەقەکردن، ترکەندن

**- مفرقعة (ج) مفرقعات:** تەقەمەنی، ترەقە.

**- فرقعة المفاصل:** جومگە و گرێی قامکان تەقاندن.

**فـرك:** هەڵپـرواندن، پرواندن، خـوراندن، کـوشین، لێـخـستن، کراندن، ولێن، گلۆفتن، داماڵین.

**الفرم:** نەنجنین، هەنجنین، هنجاندن.

**- مفروم:** جنراو، هەنجنراو.

**- لحم مفروم:** قیمە.

**فرمان (ج) فرامين:** (ف) فەرمانی میر و خونکار و پادشایان.

**فرن (ج) افران:** کوورە، فرن، نانەوا.

**- فرن عاكس:** پەرچەکوورە.

**- فرن عمودي:** ستوونەکوورە.

**- الفرن النفاخ:** فووەکوورە.

**- افران محولة:** گۆڕە کوورە.

**الفرناس:** کوێخا.

**فرنج (ج) افرنج:** فەرەنگ.

**- لغة الافرنج:** فەرەنگی.

**فرند:** دەبان، دەبیان، دەوان بۆ (تیغ).

**فرهود (ج) فراهيد:** بێچووە شێر، بەرخ، گیسکی بزنی کێوی.

**فرو، فروة:** کەوڵ، قاپووتی کەوڵ و پێست.

**فروج (ج) فراريج:** باڕۆکە، واڕۆکە، واڕک، جووڵک، کەرگ.

**فروسية:** سوارچاکی، سواری.

**فريد (ج) فـرائد:** تاقـانە، یەکـانە، تاک، تاکـانە، هەڵکەوتوو، تەراخ، میرکوڕ، ئاوێزە، یەکانی، سەڵتەزەلام، لنگ.

**فريدة:** گەوهەری نرخدار و گران.

**فريس:** زەنگوڵە.

**فريسة:** ١- نێچیری جانەوەر و داعبایانە ٢- نۆما، جوانووی یەکساڵە.

**فريضـة (ج) فرائض:** گەرەک، پێویست ئەوەیە کە لەسەر مرۆڤی گەرەک و پێویست کراو.

**فـريق:** ١- تیپ، دەسـتـە، تاخم ٢- سـەرلەشکر، سـەرتیپ، سەردار، سەرەک.

**- فريق منتخب اربيل:** تیپی بژاردەی هەولێر.

**- احتياط الفريق:** یەدەگی تیپ، دەژی تیپ.

**فريك:** ماتە، ولێن، جەرمە، فەریک.

**- فريك الحمص:** نۆکە فەریکە.

**- فريك القمح المشوي:** قەرەخەرمان، گوڵە پرووزە.

**- فريك اللوز:** چەقالە، چەقێلە، چەقەلە، چەقیلە.

**فـز:** ١- ڕاپەڕین، ڕاچڵـەکین، ڕاچەنین، داپەڕین، خـوریاندن، کریە، هلچەنن، دەریەڕین ٢- ئازارکردن ٣- دەریەڕاندن.

**فز فزاً:** لێ جوێ بوونەوە، داچڵەکین.

**فزة:** کریە.

**فزع:** ناڵە، زاری، هاوار و بانگ، شیـتـە، شیـتـەشیت، شهیـو، هاڵا، واواە، ترس، سام، هاوار، هاوارهاوار.

**الفزع الشديد:** هەترەش.

**فزع فزعاً:** ١- سـەخڵـەت بوون، پەنابردن، هاوارکردن، دادوبێداد و ڕۆڕۆکردن ٢- ترسان، زراوچوون، دڵخوریان، داچڵەکین، دڵ داخـوریان، زارەترەک بوون، تۆقـان، تۆقین، حـەیچـەحـەیچ، حەیشەحەیش.

**فزغند:** سێچکە، ماچیچکۆک.

**فـسـاد:** ١- خـراپ بوون، رزان، توڵانەوە، خـراپی، گـەندی، دافەتان، داوەشان، داقنان ٢- دووزمانی، پۆڵک کردن.

**- فساد الحليب ونحوه:** هەڵبرسکان، هەڵبرکان، هەڵبزرکان، هەڵپرووکان.

**- مفسد:** ١- دارزێنەر، دۆخمان، کولەبنە، ٢- کـووکە، گـای بنە، دووزمان، تێکولچێن، ئاوری بنکایە، کووکە.

**فسّاط:** خیوەت، خەرگا، سەراپەردە.

**فُسافس:** پشە.

**فستان (ج) فساتين:** پۆشاکێکی ئافرەتانە لە جیـاتی کەوایە. کراس.

**فستق:** (ف) پستە، پوستە، فستق.

**الفسح:** پەتە، پاس، ژوورۆچکەی هەوا.

**الفسح الهوائية:** پاس، ژوورۆچکەی هەوا.

**فسحة:** گوشادی، فراوانی، وچان، پشوو.

**الفسخ:** تێکدان، هەڵوەشاندن، لێک جوێ کردنەوە، ڕەواندنەوە، هەڵپـشکاوتن، هەڵرووشـاندن، تێکدانی سـەودا و پەیمان و بڕیار.

**فسر:** بروانە (تفسير).

**فسطاس:** ئاڵا، سـەراپەردە.

**فسطاط:** خیوەت، خەرگا، سەراپەردە.

**فسفور:** فۆسفۆر.

**فـسق:** لە ڕێگای خـودا دەرچوون، داوێن پیس، لە ڕێگای ڕاست لادان، پێ لە بەرەی خۆ پتر ڕاکێشان، پاشل پیسی.

**فسقية:** فووارە.

**الفـسـو (ف):** فـس کـەندن، تس کـەندن، فـسـین، تسین، کـەندن، کەنین.

**فسوة (ج) فسوات (ف):** فس، تس.

**كثير الفسو:** فسن، تسن، فسۆس.

**فسوق:** لە ئایین لادانە.

**فسيح:** گوشاد، فراوان، ئاوەڵە، کالا، وراق.

**فسيفساء:** خەڵف.

**فسيلة (ج) فسائل:** ڕیشە، نەمام، نیهال، پەل، لکی داری چەقاندنێ.

**الفش:** کاکۆل.

**فش فشاً (ە):** فش کردن، بەردان.

**فشا فشواً:** ڕاز پێ ئاشکراکردن.

**فشافش:** دەنگ و گیزەی تیرییە لە کاتی ئاوێژتنێدا.

**فشفش (ە):** فشەفش، فشەفش کردن.

**فشفشة الخرطوش:** فشەی فیشەکی.

**فشل فشلاً:** ١- خاوبوونەوە، فش و شلّ بوون، سست بوونەوە ٢- سەرنەکەوتن، بۆڕخواردن، بەزین، ترسان، فشەڵ بوون، هەڵوەشانەوە، ژێرکەوتن.

**فص (ج) فصوص:** ١-قاش، نقێمی ئەنگوستیلە، نەقیم ٢- گلێنەی چاو، پلەگۆشت، کوتێک گۆشت.

**فص النرد:** مۆرەی نەردێن.

**فص واحد:** پلێک گۆشت.

**فصاحة:** قسەڕەوانی، زمانی پاراوی، زمان تیژی، بەزمانی، وتەگوشادی، زمان کراوەوەیی، دەمەوەری، ڕەوانوێژی، زمانداری، زمانلووسی، شەهقۆنی، ڕەوانبێژی، زوانداری، تەڕزوانی، دەمهەراشی

**فصّاد:** خوێن بەردەر، خوێنگر

**فصال:** منداڵ لە شیرکردنەوە

**فِصح:** لەلای فەلان یادی ڕۆژی چوونە سەرەوەی عیسایە لەلای جوولەکانیش جەژنەی دەرچوونی وانە لە مصر.

**فَصد:** خووێن بەردان، خووێن گرتن.

**مصد:** نەشتەر.

**فِصفصة:** وێنجە، یۆنجە.

**فصل (ج) فصول:** ١- کەژ، کەش، پشکساڵ، گێڵ، هاڤرۆنگ، وەرز، کژ، گۆنەڵ ٢- بەند، تیغە، بەشێکە لە پەڕتووکاندا، گات.

**الفصل:** جوێ کردنەوە، دابڕین، هەڵاواردن، هەڵبڕین، ترازاندن، داترازاندن.

**الفصل الاول:** بەشی یەکەم.

**فصل الربيع:** کەژ، گۆنەڵ، گۆنەر، کژی بەهارێ.

**- فصل السنة:** کەشی ساڵی، کەژ، کژ.

**- فصل للكتب:** گات، بەند، بەش، بڕ، پار.

**فصم:** پچڕین، پچەڕین، پساندن.

**الفصوص الرئوية:** پلەکانی سیی.

**الفصول الاربعة:** چوار کەشی ساڵی.

**فصيح (ج) فصحاء:** زوان ئاوە، زواندار، زماندار، دەمڕاس، دەمڕاست، دەمهەراش، زمان تیژ، دەمەوڕ، زمان خۆش، شەهتۆت، بەزمان، زماندار، دەمەوەر، دیواندڕ، ڕەوانوێژ، دەم و پل پاراو، زمانلووس، قەلوودەل، زمان پاراو، ڕەوانبێژ، زمانتەڕ بەدەم، کەسێکە لە کاتی ئاخۆتن و خوێندنەوەدا زمانی ڕێک و لووس و پاراو و بێ گرێ و گۆڵ بێ.

**فصيل (ج) فصال:** پەل، دیواری کورتی حەوشێ، دەیلاغێکە لە دایکی جوێ کرابێتەوە.

**- آمر الفصيل:** سەرپەل.

**فصيلة:** ١- بۆر ( ) ڤیرگول ٢- دەستە، بەرە، تۆف، جەستە، جەسە، ڕیشە، تیرە.

**- فصيلة الاحياء الهوائية:** پەقلک.

**فضّ فضاً الشيء:** ١- شکاندن، وردوخاش کردن، ٢- ڕژتن ٣- کونکردن ٤- جوێ کردنەوە.

**فضّ البكارة:** ژاکاندن.

**فضاء (ج) افضية:** چۆڵایی نێوانی زەوی و ئەستێرانە، بەراوەڵە، گشێوش، جێگای گوشاد، پێش ئاوەڵە، بەرڤەکری، مەیدان، بلاوە، گوشادی، زەوی گوشاد.

**فضاحة:** ڕیسوایی، بێ ئابڕوویی، بێ شەرمی.

**فضاضة:** وردە.

**فضالة:** بڕوانە (**فضلة (ج) فضلات**).

**فضالة المائدة:** پاشخوان.

**فضة (ج) فضض:** زێو، زیڤ، زیو.

**- صائغ الفضة:** زێوگەر.

**- مفضّض:** ئاوەزێو، بزیڤ، ڕووکێشی زێوی، زێوین.

**نترات الفضة:** ماتە.

**فضح:** ئابڕووبردن، ڕیسواکردن، زێوکێش.

**فضفاض:** ١- شلەپەتە، خاو، فل، فلت ٢- فش، بلاو، فراوان ٣- جوامێر.

**فضل (ج) فضول:** ١- پیاوەتی، پتر بەسەردا هەبوون، کارزانی، ئاخەوەوەندی، چاکە ٢- پتری، فرەیی، سەرکەوتن، هونەرمەندی، شیاوی، هونەر پێز، پیت، بەسەرداهەبوون ٣- بەخشش، چاکە، ئەمەک، سایە، سایا، پیاوەتی ٤- زانست، زانایی.

**- ذو فضل:** هونەرمەند، بەهونەر.

**فضلة وفضال (ج) فضلات:** پاشماوە، پارۆ، شەرۆک، ماوەوە، پێما، بەرما، بەرماوە، پاشماگ، گنشتە، ماو، مەنە، پەشمەنە.

**- فضلة اغصان المقطوعة:** هەژ، هەژگ، هەژگ و بژاڵ.

**- فضلة الطريق:** پاشماوەی ڕێگا.

**فضلات:** پاشەڕۆک.

**فضلات المائدة:** پاشماوەی سفرە.

**فضوح:** ڕیسوایی، کەسێکە کاری بێ جێ دەکا.
**فضول:** دردووک، هەرزەوێژ.
**فضولي:** پاشماوە خۆری، دردووکی، هەرزەوێژی، مفت وێژی.
**الفضولي:** بروانە (**طفيلي**).
**فضيح:** ڕیسوا، بێ ئابڕوو، هەتک کراو.
**الفضـيحة فـضائح:** ئەتک، ڕیسوایی، خراوی، ئابڕوو، ئابڕوو بران، ترۆیی، بەدناوی، بێ ئابڕوویی، بێ شەرمی، چەپەڵی.
- **مفضوح:** ڕیسوا، ترۆ.
**فضّي:** زێوین.
**فضيلة (ج) فضائل:** پایەبەرزی، شان، پێتری لە هونەر و شان و شکۆ و زانستدا، هونەر، هونەرمەندی، بەسەردا هەبوون.
- **صاحب الفضيلة:** سایەدار، هونەرمەند.
**فطام:** منداڵ لە شیرگرتنەوە.
**فَطانة:** سەلیقە، وریایی، تێگەیشتن، هۆشیاری، هۆشداری، زانیاری لە کارێکیدا، زیرەکی، زرنگی.
**فطر:** ڕۆژوو شکاندن.
- **عيد الفطر:** جێژنەی ڕۆژووشکاندن، یەکەمین ڕۆژی مانگی شەوالییە.
**فطر:** درز، قرنجان، قەڵەشان.
**فطريات مجهرية:** ورد‌بینە کەڕوو.
**فُطر:** کارگ، قیقاز، خارچک، قارچک، کڤارک، کوراگ، کولاڤک، چیلۆکا، کاکڤلک، هەڵچ، هەڵچی، کفکار، کومکاهاچی، پرک.
**فطرة (ج) فِطر:** هەست و خوو و شێوەیەکە لە سەرەتای پەیدابوونی هەموو کەسێکییەوە زگماک دێتەدی، سروشت و سرشت شێوەی خۆرسکی مرۆڤان.
**فطرةً:** هەر لە خۆوە، زگماک.
- **بالفطرة:** لەخۆوە.
**فطري:** زگماک، سکماک، خۆرسکی، سروشتی.
**قوة فطرية:** گازۆر.
**فطرية:** سەدەقە، قوربانی.
**فطس:** فلچ، پان (کەپۆ).
**فطس الرجل فطساً:** فلچ بوونەوە، پرچەبوونەوە.
**فطس الحيوان:** تۆپی.
**فطم:** لە مەمک کردنەوە.
**فطن فطناً:** زیرەک و زانابوون.
**فَطِن:** زیرەک، هۆشیار، زانا.
**فطنة (ج) فِطَن:** سەلیقە، زیرەکی، وشیاری، وریایی، تێگەیشتوویی.
**فطور الصائم:** بەربانگ.
**فطور (اللقمة الصباح)** بەرچا، تاشتی، بەرتاشت، بەرقەلیان، بەرقەننە، تهێشت، بەردل، تاشتا، بەربانگ.
- **قبل الفطور:** ناشتا، خورێن.
- **مفطر:** ناشتاشکێن.
**فطير (ە):** ١- فەتیر، هەویری هەڵنەهاتوو ٢- ئەوەیە کە زوو پەی پێ ببرێت و زوو دەست کەوێت.
**فطيم:** منداڵی لەشیر براوەوە.
**فطين:** زیرەک، تێگەیشتوو، زانا، هیر، بەسەلیقە، بەخۆوەژیو، ژیر، شاک، شیار، وشیار، هۆشدار، هۆشیار.
**فظاظة:** دڵڕەقی.
**فظاعة:** دژواری، سەختی کار، شوو لێ هەڵکێشان.
**فظيع:** کاری ناشیرین، کاری ناڕەوا.
**فعّال:** بەکار، کاربین، ڤەرە، بکرد، کاربڕ، کارکەر، کارگەر، کروکاشکار، گورج و گۆڵ، چالاک، ناقۆڵا.
- **غير فعّال:** بێ کارە، ناچالاک.
**فعاليات المدارس:** جموجوڵی قوتابخانەکان.
**فعالية:** گورج و گۆڵی، چالاکی، جموجۆڵی.
**فعفعة:** کسسە، کسسەکس.
**فعل (ج) افعال:** کار، کردەوە، کردار، فەرمان، باس.
**الفعل:** کردن، کرن، کردەی، کارکردن.
- **إفعل:** بکە، کاربکە، دەی، سادەی، دەیجا.
- **رد الفعل:** دەسادەی، کاردانەوە.
- **الفعل (في النحو):** کردە، کردار، پیشک، کردەوە.
- **افعال الآلية:** ئامێرە فەرمان، کرداری ئامێران.
- **فعل البسيط:** کرداری سادە.
- **فعل سماعي:** کرداری بیستیاری، کرداری بێ سەروبەر.
- **فعل الطلب:** کرداری داخوازی.
- **افعال الشخصي:** کرداری کەسی، پیشکێن کەسۆک.
- **فعل قياسي:** کرداری دەستووری.
- **افعال غير قياسية:** کرداری نادەستووری، نەوەقتیا هن پشتان.
- **فعل اللازم:** پشکان لتگر، کرداری تێنەپەڕ.
- **فعل المتعدي:** کرداری تێپەڕ، پشکا دەرهنگێڤ.
- **فعل الماضي:** کرداری ڕابردوو.
- **فعل مجهول:** کرداری نەناسراو، کردەوەی ئاڤزێمکی.
- **فعل المركب:** کرداری لێکدراو.
- **فعل المساعد:** کرداری یاریکار.
- **فعل المضارع:** کرداری ڕانەبردوو.
- **فعل معلوم:** کرداری ناسراو.
**فقات الخبز في التنور:** هۆرتەڤان کۆڵوو.

**نقاح:** خونچە.

**نقاح الكرمة:** خونچە و گۆپکەی مێوی ترێ.

**فقار (ج) فقرات:** مۆرەی پشت، تیغەرەی پشت.

**ذو الفقار:** شیری إمامی عەلی.

**فقارة:** هەژاری، لێقەوماوی، کەساسی، پارسەکی، زیڤاری، بارچەوتی، بێ چارەیی، بایدەستی، پارس، ژارۆیی، دەرکۆ دەرکۆیی

**فقاع:** ١- مە.یێکە لە جۆ یا برنج وەیا لە مێوژی دروست کرێ ٢- خونچەی هەر جوورە رووەکێکی بێ.

**فقاع الكرم:** ژێڵ، گۆپکەی دارە مێوان.

**فقاعة:** بلّق.

**فقاعة المطر:** قەپووچکەی بارانە.

**فُقاعي:** ناوی جۆفرۆش، مەیفرۆش.

**فقاق الورد:** مەوڵ.

**فقاهة:** زانایی، بوونە فەقێ.

**فقد:** گومکردن.

**فقدان:** گوم کردن، لە دەست دان، بزر کردن، لە کیس چوون.

- **فقدان البصر:** کوێرایی داهاتن.
- **فقدان الحس:** تەزین.
- **فقدان الشهية:** لە خواردن دابڕان، لە خواردن کەوتن، لە خواردن بوون.
- **فقدان السلطة:** لە دەستەلات کەوتن.
- **فقدان الوعي:** لە هۆش چوون، بێ هۆش بوون.
- **فقدان المعنوية من الرّعب:** زارە ترەک بوون.

**فقر:** ئاتاجی، ئاوسەرکەمی، بابدەستی، کەساسی، بارچەوتی، بەلەنگازی، بێ نەوایی، تەنگدەستی، دەرکوودۆری، دەروێشی، دەست تەنگی، زیڤاری، قەلەندەری، کەماهی، گەدایی، لێقەوماوی، ناتەواوی، ناگوزیری، نەبوونی، نەداری، هەژاری، هاوسەرکەمی.

**(ج) فقراء:** ڕەش و ڕووت، قەلەو قووتە.

**فقر فقراً:** هەژاربوون، کەساس بوون، دەستکورت بوون.

**فقر الحال:** هەژار، دەستکورت.

**فقر الدم:** کەم خوێنی، خوێن کەمی.

**الفقرة (ج) فقرات:** ١- ترەختە، بڕبڕگە، مۆرە، مرۆخە، بڕبڕە، بڕبڕاگە ٢- ڕستە، وتار، بەندێک، وتەی ناسک.

**فقرات الظهر:** مازی پشتی، مۆرەی پشت، مرۆخەی پشتی، مووروخە، بڕبڕەی پشتی، مۆرەگەل، مازی گەل، بڕەگەل، ترەختەگەل، مرۆخەگەل.

**فقريات:** بڕبڕەدارەکان.

- **اَللا فقريات:** بێ بڕبڕە.

**فقرة:** تیکە، پارچە ٢- بڕبڕە، وارە، کەشە، جار، چەل.

**فقس:** هەڵهێنان، جووچکە هەڵێنان.

**فقس البيضة:** هێلکەکەی شکاند، هێلکەکەی هەڵێنا، جوچکەی هەڵێنا.

**فقس الطائر بيضتها:** باڵندەکە هێلکەکەی هەڵێنا.

**فقص:** بڕوانە (فقس).

**فقط:** تەنها، هەر، تنێ، بەس، تەنیا، تەنانەت، سف، هەر ئەوەندە.

**الفقع:** دمەلان، دومبەلان.

**فقم:** شەویلکە، ئارووت.

**فقه:** زانین، تێگەیشتن، زانیاری ئایین، پەی پێ بردن.

**فقه فقهاً:** زانین، تێگەیشتن.

**فقه اللغة:** زمانەوانی، زانیاری فرمان.

**فقيد:** ونبوو، لە دستچوو، لە دەست دەرچوو.

**فقيد الولد:** هۆشەنگ، زگسووتاو، منداڵ مردوو.

**فقير (ج) فقراء:** هەژار، بێ دەست، داماو، دەست تەنگ، ڕەجاڵ، دەستەهیشک، ڕێڤینگ، زیڤار، قەلەندەر، گەدا، کەرەواڵێ، نەبوو، کەرەواڵە، بێ دار و ماڵ، بێ کەس، بێ نەوا، بێ دەق، بنسی، کزۆک، بێ سامان، بڕەش، بێ باڵ، پرنسی، بەستەزمان، ژار، بەلەنگاز، بەرڤالە، دەولەتکەتی، کەساس، ڕەبەن، هەژیر، بابدەست، ژارۆ، ڕەش و ڕووت، ئاوسەرکەم، بارچەوت، پێداویست، بارکەوتوو، چەل، بڕەش، تەنگ دەست، چەورە، دەروێش، بێ دەست، نابوو، نابووت، ناجەسە، نەوار، بێ نەوا، واماگ، هاوسەرکەم.

**فقير الحال:** بەستەزمان.

**فقيع:** سوورهوول.

**فقيه (ج) فقهاء:** زانا، ژیر، زانای دەستووری ئایینی.

**فك:** ١- لێک کردنەوە، جوێ کردنەوە، ترازاندن، داترازاندن ٢- ڕزگار و بەرەڵا و ئازادکردن ٣- شەویلکە، لاشەویلکە، شەویلاک، هاروو.

**فك الاسفل:** شەویلکەی لای خوار، کاژێر.

**فك الاعلى:** شەویلکەی لای سەرەوە.

**الفكان (فك العليا والسفلى):** کاچێر.

**فكاهة:** گەپ، گاڵتە، فشە، زڕتەک، زڕتۆڵە، گەمە، کایە، تیتاڵی، دڵخۆشکردن، شۆخی، پێکەنین.

**فكر (ج) افكار:** بیر، وێر، یاد، هۆش، هوێر، بیراهی، هزر، ڕاوێژ، وژارە، هوور، کەڵکەڵە، واتەویرە، ڕامان، ڕاوێژ، خەیاڵ، ئەندێشە.

- **افكار ساسية:** بیرە بنەڕەتییەکان.
- **فكر عبث:** پەژارە.

**فكرة:** بيرۆكە، ئەندێشە.
**- كثير المشاغل الفكرية:** سەرپڕ.
**فكري:** بیرەوەری.
**فكز:** دووكەڵكێش، بوخاری مدبەقێ.
**فكور:** كەڵكەڵەدار، بەبیرەوەر، پڕبیرەوەر.
**فل:** گوڵێکە وە یاسەمەندی سپی دەچێ و، بۆنی خۆشە.
**فلاة (ج) فلوات:** دەشت، سارا، بیابانی چۆل و بێ ئاو و گیا، بێروون.
**فلاّح:** جووتێر، جووتبەندە، فەلەخوێ، دەشتەوار، دەشتەوان، دەشتەکی، شێفیار، کشتکار، جووتیار، جفتیار، کێڵکار، وەرزێر.
**فلاّح اجير:** پاڵە، سەپان.
**فَلاح:** ڕزگاری، قورتاری، هێوان، قوتارکاری، سەرکەوتن، ڕەسێن، ئازادی.
**فلاحة:** جووتێری، جووت بەندەیی، فەلەخوێیی.
**فُلان:** فیسکە، فیسار، کابرا، هەرامە، جوامێر، جایێ، ئەوک، جوانمەردلۆ، واک، وانیک، هێن، کێ (ئەردە.).
**فلان وفلان:** واکەواک.
**الفلة:** فرۆ، ژەک، زەها.
**فلت:** فرتەفرت.
**فلج:** شەپلە، مینک، ڕەقێتە، دووهێشە. دەردێکە لە هەر ئەندامێکی مرۆی بدات بێ هەستی دەکات.
**فُلِجَ افلاجاً:** لە گۆکەوتن، هشکلنگ، لەکارکەوتنی دەست و پێ شەپلە لێدان.
**مفلوج:** شەپلە لێدراو، لە گۆ کەوتوو، کلۆڵە.
**فَلْخ:** هەڵپشکاوتنی چتێکی، ئاشکراکردنی کار و فەرمانێکی.
**فلز:** ١- جوورە مسێکی سپییە ٢- کان، ئەردەزین، ئەردزین.
**- فلز النفاش:** بژە میتال (کیمیا).
**- شبه فلز:** نیمچەکان.
**- لافلز:** نامیتاڵ.
**فلس (ج) فلوس:** شایی، قەرەپووڵ، پووڵی سوور، جوورە دراوێکە لە مسی سوور دەکرێ، (٥٠)ی درهەمێکییە.
**- محب الفلوس:** پارەپەرست.
**- فلس احمر:** پووڵە سوورە.
**- فلوس السمك:** پووڵەکەی ماسیانە.
**- المفلس:** نابووت، مایە پووچ.
**فلسفة:** لێکدانەوە، لێ وردبوونەوە، بەراوەردکردن، لێکۆڵینەوە، پیتۆری، پیتۆڵی، قووڵ و وردبوونەوە، هونەرمەندیی لە پرۆژەی زانیاریدا، لێکۆڵینەوەیە لە بارەی زانست و زانیارییەوە، قووڵ پێدا چوونە خوارەوە، لە بنچینە و هۆی پەیدابوونی چتان کۆڵینەوە.
**- علم الفلسفة:** پیتۆڵی و زانیاری پیتۆڵی.
**فلسطين (ه)** فەلەستێن، فەلەستان، وڵاتی فەلان، خاکێکە فەلان ئەستاندوویانە لە چاخی سلطان صلاح الدین دا ناوبراوە بە فەلەستێن، فەلەستان (فەلەسطین).
**فلفل:** دەرمانگەرم، ئاڵەت، ئیسوەت، ئیسۆت، بیبار، ئاڵات.
**فلفل احمر:** هیچ مار، هیچکار، هەوجهار.
**فلفل اخضر:** بیباری سوور.
**فَلق:** قەڵەشتن، تروسکاندن.
**فَلق الحب:** تۆوترازندن.
**فَلَق:** سپێدە، قەڵەشتی کێوان، زەوی نێوانی دوو کێوان.
**فلق:** فەلاقە.
**فَلْقة:** نیوە، لەتک، لەتکی چتێکی لێک کرابێتەوە، لیچقە، فلیچقە، فەلاقە.
**- ذات فلقتين:** دووفلیقانە، دووفلیچقانە، هاچە.
**- ذو فلقتين:** دووفلیقانە، دووفلیچقانە، هاچە.
**- وضع الرجل في الفلقة:** ئەستەق کردن.
**- السويق تحت الفلق:** ژێر پەلک، لاسکۆکە.
**فُلك:** کەشتی، گەمێ.
**فلك:** کووژە، دەڵەک، کووشک.
**فلك (ج) افلاك:** ئاسمان، چەرخ، چەنبەر، کەشکەڵان، گەردوون، خولگە، چەپگەر.
**- دوران الفلك:** چەرخ.
**- برج الفلك:** کەلوو، کۆنگرە.
**- علم الفلك:** ئەستێرەناسی.
**فلكة:** تەپلەک، کوماجە، تەختەیەکی خڕی نێوەڕاست کونە لە سەری ئەستوندەی خێوەتی قایم دەکەن.
**فُلكة:** ١- ئاوچەی چوار ڕێگایان، پارچە زەوییێکی خڕە ٢- قایەخ، زەوی خڕ، چتی خڕ ٣- چەرخە، پێچە.
**فلكي:** ئەستێرەناس، ئەستێرە ژمێر، چەرخ ناس.
**الفلو:** جوانووی یەکساڵە.
**فلوس السمك:** پووڵەکەی ماسیان.
**فلوسج: (ه)** پەڵۆشە (ڕەگی گیایەکییە).
**الفليفلة:** بیبار.
**فم، فوه (ج) افواه:** زار، دەم، دەو.
**- جانبي الفم:** لالغاوە، لغاوە.
**- زبد الفم:** گرێز، کەفی زار.
**- فتح الفم اثناء العطاس:** مەلاسە.
**- واسع الفم:** گاشەدەم.
**فن (ج) فنون:** ١- هونەر، پیشە، تەکتیک ٢- جوور، چەشن
**- صاحب الفن:** هونەرمەند، هونەروەر.

**قلب قلباً:** وەرگێـڕانەوە، سـەرەوژێركـردن، نخـوون، نخـوونین، هەڵگێڕانەوە، هۆرگێلیای، نخوون كردنەوە، قڵپ كردنەوە، وەرچەرخـاندن، هەڵگەڕاندنەوە، دەرنخـوون كـردن، بەروانژی كردن.

**قلب:** شێواندن.

**مـقلوب:** هۆكـدار، ئاوەژوو، سـەرەوژێر، پەلەوانژە، چەواشـە، دەرنخـوون، دەمـەونخـوون، ولاژی، هەڵگەڕاوەوە، بەروانژی، قـەلەوانژی، چەواشـە، بەراپشت، هەڵگەڕیاو، سـەرەوخـوار، سـەرەونخـوون، سـەرنخـوون، سـەرنیگوون، قـاژی، قـەلەوانژە، لاترقـەوچ، وەرگەڕاو، وەرگەڕاوەوە، وەرگێـڕراو، وەرگێـلاو، هەلاوگێر.

**قلباً:** بەدڵ، لە كانگای دڵەوە، بەداو و دڵ.

**قلة (ج) قلل (ە):** تـوللە، تەپۆڵكەی سـەر كـێـوان، لووتكەی سەرچیایان، بازگە، تەرازن، تیـپالك، قۆپ، كەمك، بەراز، پچووكی، قۆچ، كۆپ، كۆت.

**قِلّة:** كەمی، كـێمی، چكێتی، كـەماسی، كەماهی، كەمایەتی، كەمایەسی، كەمایی.

– **قلّة التجربة:** سادەكاری، تازەقەلایی.

– **قِلّة الحیاء:** بێ شەرمی، چەقەسوویی، بێ ئابڕوویی.

– **قِلّة الشرف:** بێ ئابڕوویی، سووكی، سووكایەتی، سووكێتی.

**قلّد:** بڕوانە (**تقلید**).

**قلزم:** دەریای سوور.

**قلع:** قەلایی، قا.

**قلع:** هەڵكەندن، هەڵشكاوتن، لە ڕیشە دەرهێنان، ئانیف كـرن، ڕیشە كەنكرن، هلكرن، هنگوستۆك.

**قَلَع:** كاو، كەور، كەورگ.

**قلع السن:** ددان كێشان، دیانكێشان.

**قَلَع:** لادرگە.

**قلعـة (ج) قـلاع (ە):** قـەلا، قـەلات، دژ، كەلات، بورج، برج، كۆت، هەوراز، باروو.

– **حامي القلعة:** دژدار، قەلاتەوان.

– **هادم القلعة:** قەلاشكێن.

**قَلِق:** پەرێشان، پەشۆكاو، نەسرەوت، كەوڕێ، شپرزە، شپرزیاگ، شپرێو، خۆنەگر.

**قلق قلقاً:** پەرێشان و شپرێو بوون.

**قَلَق:** پەرێشـانی، شەپرێوی، شـلـەژان، قـەلەقـاژی، شـپـرزەیی، شـپـرێوی، نائارامی، بێ ئارامی، ئاژاوە، ئاژاوڵە، پشـێـونە، پەرێشان بوون، پەشۆكاوی، پەشۆكی، جاڕسی، جەرگاووسی.

**القلقاس:** پەتاتە، سێف زەمینی.

**قلقلة:** كەڵكەڵە، سەودا، شۆڕ.

**قلم (ج) اقلام:** (ە) قەڵەم، پێنووس، خامە، ئامرازێكە كە پێی دەنووسرێ.

– **قلم الحكاكين:** قەڵەمی مۆرهەڵكەنان.

– **قلم الزهرة والحشايش:** نێرك، نێرتك، نێرۆت.

– **قلم السرّي:** ڕازگە، جێڕاز.

– **برى القلم:** (ە) قەڵەم برین، پێنووس دادان، قەدكردنی قەڵەم.

– **حق القلم:** سەرقەڵەمانە.

– **ريشة القلم:** نووكی پێنووس، دمك.

– **سراع القلم:** ژاژ.

**قلّم قلماً:** دادانی پێنووس، قەلەمكردن، چڕاندن، قەڵتكردن.

**قلّم الشجر:** دارەكەی بڕی.

**قُلْم:** مشەقە، توول، قەڵەمی دار و گوڵ و نیتر.

**قلنسوة:** جوورە كلاوێك.

**قلولاء:** قازو قوڵینگ.

**قلي:** زاخی ڕەش.

**قلى قلياً:** بڕوانە (**قلا قلواً**).

**قلى اللحم:** كەمرین.

**قلية (ج) قلايا (لحم):** بریانی.

**قلي الشحم:** هۆركزاندن، هەڵكزاندن، هۆركزانن.

– **صوت قلي اللحم والشحم وغيره:** چزاندن، چززەچزز، كززەكزز.

**قليل الشأن:** نزم، سووك، زریەهرە.

**قليل (ج) قليلات:** كەم، كێم، نەخت، چك، تۆز، پت، پچك، پچ، پچكۆك، پیچ، چەن، داپیچ، كەمۆڵە.

– **قليل الادب:** كەم شێواز، ترەك، چارقاپ، چاونز.

– **قليل الاهتمام:** كەمتەرخەم.

– **قليل الكلام:** كەمدوو، كەمدوێن.

– **قليل التجربة:** چاڤگرتی، سادەكار، تازەقەلا.

– **قليل الحياء:** بێ شەرم، سودك.

– **قليل العمل:** دەستەوەستان، بێ دەستاو.

**قليلاً:** تۆزێ، چكێ، چكێك، پچك، نەختێك، كەمێ، نەختێ، پچـێـك، پچێ، كـەمـەك، هێندێك تۆزێك، بەرەبەرە، كەمێك، برێك، برِبرِە، برِبرِاگە، قیچێك، هندەك.

**قليلاً قليلاً:** كەمكەمە، تۆزتۆزە، نەختەنەختە، بەرەبەرە، برِبرِە، لەسەرەخۆ، پچك پچك، پیچ پیچە، چەپێ.

**قليلاً جداً:** خەمێ.

**قُم:** هەسـتـە، هەڵسـتـە، نوورز، هۆرزە، وەرزە، ڕابە، هەڵتـرە، هەڵوو، هولوو، هوڵوو.

**قمار (ە):** قومار.

– **عِراف القمار:** لاجلاج، قوماریاز.

**قماش (ج) اقمشة:** كووتاڵ، چۆخ، پارچە، كالا، نەهێن، سیپاڵ.

- **قماش ذو سمك خفيف:** پارچەی یەکباد.
- **قماش صوفي:** هرین، چۆخی خوری، چۆخ.
- **قماش غليظ:** قەستۆر.
- **قماش قطني ملّون:** چیت.
- **قماش القطن الاسمر:** خام، جاو.
- **قماش الكتان:** کەتان.
- **اقمشة حريرية:** کالای ناوریشمی، کەسرەوان.
- **اقمشة صوفية:** کرباس.

**قماط (ج) قمط:** دەسرازە، پێ پێچە، پێ چەنە، دەستەرازە، قونداغە، قنۆرک، ئەو پەرۆ و پالات و کەژوەیە کەلاق و لەتەنی منداڵی ساوای پێ دەبەسترێ.

**قمة (ج) قمم:** هەلەم، بەراز، کەپک.

**قمة التل:** سەربستوو.

**قمة الجبال:** بازگە، قوللەی سەری کێوی، تەپڵەسەری کێوی، تەپلاک، تەڤینگ، سەری چیا، قولله، سەرکەل، تەپۆلکەی سەر چیایان، قام، قوتکە، کەلک، کلاوە، کلۆیینگ، کمت، لووتکە، کلیڤانک.

**قمة الجبل المائلة الى جهة:** پەسارگە.

**قمة الرأس:** تەپڵی سەر، تۆقی سەر، گاسک، بانەسەر، بۆلک، تۆقەسەر.

**القمم النامية:** لووتکەکانی گەشە.

**قمح:** بڕوانە (حنطه).
- **سنابل القمح:** گوڵەگەنم.
- **فريك القمح المشوي:** قەرەخەرمان.

**قمحة:** دەنک، دانگ، نۆک.

**قمحدوة (ج) قماحد:** ئێسکی پشتی سەر.

**قمر (ج) اقمار:** مانگ، هەوی، هەیڤ، هێڤ، هەموو، کاووت، مۆنگ، هەڤی، ما.
- **خسوف القمر:** مانگ گیران.
- **ضوء القمر:** شەبەقی مانگ.
- **لون القمر:** ڕەنگ مانگ.
- **ليلة قمراء:** مانگەشەو، هەویەشەو، ماتاو.

**قمراء:** سپێکی لێڵ، مانگەشەو.

**قمرون:** کوللەی دەریایی.

**قمري:** قومری، کەڤۆ، کورپک، تنتسک، فانتک، جۆرە کۆترێکە تەوقی لە گەردنی دایە.

**قمصان:** سەرەقۆڵ.

**قمطر (ج) قماطر:** دۆلابی پەرتووکان، فەلاقە، مرۆی کورتە بالا و تێکسرماو.

**قمطرير:** گرژ و تاریک، پەرێشان، کەنەفت کردن، بەدارلێدان، سەرکوتانەوە.

**قمع:** بڕوانە (قلع).

**قمع (ج) قموع:** بڕوانە کشتبان.

**قمع (ج) اقماع:** ڕەحەتی، کۆڤ، کۆفک، گۆفک، ماستەک، کووفک.

**قمقام:** دەریا، ژمارەیێکی زۆر، مرۆی گەورە و دڵفراوان و بەخشندە.

**قمقم و قمقمة:** تونگەیێکی گەرووتەنگە ناوی قوم قوم لێ دێتە دەرێ.

**قمل:** ئەسپێ، سپەه، سپە، سپهک، سپێ، عەبوویژ، مۆریان، هەسپێ.
- **صغار القمل:** بانگە، متوولکە.
- **قمل الدجاج:** کەپلە، کەوری، چیکنە.
- **قمل الدجاج والمعز وغيرها:** کەوری.

**القميء:** خەپلە، کولێر، کورتە بالا، کورتەڵ، خرین، کوڵە بالا، کوڵەبنە.

**قميص (ج) اقمصة:** کراس، گجی.
- **قميص العروس:** چار.
- **قميص النوم:** کراسی شەوێ.

**قنّاء:** کەسێکە کارێزی هەڵدەکەنێ.

**قن:** قۆپ، زێرکرید، زەرخرید، نوکەر.

**قنابل محرقة:** بۆمبای سووتێنەر.

**قناة (ج) قنوات:** ١- جۆگەی ژێر زەوی، کارێز، کەنداو، نۆکەند ٢- مۆدنە، دارجغارە.
- **القناة الاصطناعية:** نۆکەند.
- **قناة السمع:** بۆری گوێ.
- **قناة شوكية:** بۆری بربرە، برەبۆری، برەجۆگە.
- **قناة الماء:** کارێز.
- **القناة الهضمية:** بۆری هەپروون.

**قناد:** گوێنی.

**القنّاد:** شەکەرچی، شیرنیاتساز، شیرنیاتفرۆش.

**قنّادي:** بڕوانە (حلوانی).

**قناص:** بڕوانە (صیّاد).

**قناع (ج) اقنعة:** ١- سەرپۆش، پێچە، ڕووبەند ٢- سینی، مجوعە، لەنگەری، مەرسەف.

**قِناع (ج) أقنعة:** سەرکلاوە، سەرپۆشی ژنان.
- **مِقنع:** سەرپۆشی ژنانەیە.

**قناع:** سارۆخ.

**قناعـة:** چاوتێری، چاف تێری، بالێ خوە ڕازی، دابینی، ڕۆکەوتن، کەمخۆری، کەموەری، دڵنیایی.

**قناعة:** سەرکلاوە، کلاوزرێ، سەرنل، تلی، تلە.

- **اقنعة غازات السامة:** کلاوی ژەهرەگاز.

**القنال:** بروانه (**ترعة**).

**قنّب (القنّب)** گیا، کەندر، گیابەن، بەنی گیای.

- **خیط قنّب:** کەندر، کندر.

**قنبرة (ج) قنابر:** بروانه (**قنبُرة**).

**قنبلة (ج) قنابل:** بۆمبا، نارنج، نارنجۆک، دانه.

- **قنبلة ذرية:** بۆنبای ئەتۆمی.
- **قنبلة يدوية:** نارنجەک، نارنجۆکی دەستی، دانه.

**قنبيط:** داشکەلەم، کەلەم بوهار.

**قنّة (ج) قنن:** بروانه (**قلة**).

**قُنْدر:** سەگاو.

**قُندُس:** سەگاو.

**قنديل (ج) قناديل (ه):** قەنديل، چرا، لامپا.

**قنديل البحر:** ئەستێرە ماسی.

**قنص:** ڕاو، نێچیر.

**قُنصل (ج) قناصل:** شابەندەر، شابەنەر.

**القنصل العام:** سەرشابەندەر.

**قنصلية:** شابەندەرخانه، شابەندرخانه.

**قنطار (ج) قناطير:** مالی زۆر، کێشێکی ١٠٠ ڕەتلییە، (١٠٠٠) مەنە، خەروار.

**قنطرة (ج) قناطر:** کلی پرد و ئیدیکەیە.

**قنع قنعاً:** چاوتێربوون، دابین بوون.

**قنفذ (ج) قنافذ:** ژووژک، ژووشک، کولە، ژیژی، ژۆژ، ژیژک، ژیشک، ژووژی، ژڤژی، ژووژک، ژووژوو، ژوو، ژژژۆ، کودۆ، ژێروو.

**قنوت:** خۆ نزم گرتن، فەرمانبەرداری، له نوێژێدا ڕاوەستان، پاڕانەوه له نوێژێدا.

**قنوط:** بێ هەویا، ناهومێد، بێ هێڤی، بێ هیوا، دڵسارد، تەراسیان، ئومێد بڕاو.

**قنوع:** بروانه (قانع).

**قنينة (ج) قناني:** بوتری، شووشه، دەسکەله، کەمووله.

- **قنينة الرش:** پرژە شووشه، شووشەی پرژێن.
- **قنينة الكثافة:** کەمووله چڕی.
- **قنينة الوزن النوعي:** کەموولەی کێشانەی تایبەتی.

**قنيوات:** جۆگەله.

**قهّار:** بروانه (**قاهر**).

**قهر:** دڵنەخوازانه، بتەوێ و نەتەوێ، بۆژه، پشم، چیرەبوون، تووڕەبوون، تێکشکان، بەزین، زۆری، زۆر، نوودڵانه، زۆربگیر.

**قهرقهراً:** بێ وێران، زۆر لێکردن، کەنفت کردن، تێکشکان، لێ تووڕەبوون.

**القهر:** پشماندن، تووڕەبوون.

- **مقهور:** مەڕس، وستۆ.

**قهراً:** بەزۆری، بەخورتی.

**قهرمان (ه):** قارەمان، ئازا، پاڵەوان.

**قهري:** زۆرەملێ. زۆرەمله، زۆربایی، زۆربگیر.

**قهقر قهقرة:** کشانەوه، پاشەوپاش، گەڕانه دواوه، پشتاوپشت.

**قهقري:** کشانەوه، پاشەوپاش، گەڕانه دواوه، پشتاوپشت.

**قهقهة (ة)** پرقه، پرکه، تریقه، قاقا، تریق و هۆڕ، قاقای پێکەنین.

**قهقهة الاطفال الصغار:** زرووقانەوه.

**قهقه قهقهةً:** له قاقای پێکەنین دان، تریقاندن، زرووقانەوه، زرووقیانەوه بەقاقا پێکەنین، قاقاکردن، زرەقیان.

**قهوائي:** ١- چاچی، چایچی، قاوەچی ٢- ڕەنگی کەفی، ڕەنگی قاوەیی.

- **مائل للقهوائي:** قاوەیی باو، قاوەیی نوێن.

**قهوة:** قاوه، چاخانه، قاوەخانه.

- **ساقي القهوة:** قاوەچی، چایچی.
- **مقهى:** چاخانه، چایخانه، قاوەخانه.

**قواد (ه):** گەواد، تەرەس، جاکێش، ژن بەمز، ژن حیز، قورمساخ، قەڵتە.

**قوادم الطيور:** شاپەڕ، جغ، جخه، شمشیرەی پەڕی کەڵەباب و ئیتر، پەڕە هەرەدرێژەکانی سەر باڵی باڵندانه.

**قوارة (ه):** قەوارەی لەش یا دیوار و یا بەرگ و ئیدیکەیە.

**قواس:** کەواندار، کەوانگەر.

**قواع:** کەروێشک.

**قواطع:** بڕەر.

**قواعد اللغة:** ڕێزمان.

**القواقع الحلزونية:** هێلکەی شەیتانۆکه.

**قوّال:** زۆربڵێ، ڕووخۆش، دەنگخۆش، گۆرانیبێژ.

**قوام:** ڕێکی، ڕاستی، ڕێکوپێکی بناغەی چت، ڕاس، داد، ناوێجی.

- **قوام الانسان:** بالا، بەژن، قەد، جوان و درێژی.
- **ثخين القوام:** خەست.
- **شمعية القوام:** بالا، مێوین.

**القوب:** جووچک، جووجەڵه.

**قوباء:** لیر، خارشت، ئاوره، ئاگرۆکه، سەودا.

**قوة (ج) قوات وقوي:** دەستەڵات، باشار، هێز، تین، زەبر، گوڕ، کوتەک، گریک، گۆ، پێز، تەووژم، گوژمە، گف، تووک، دەستوودوو، وره، گوژم، هەڤل، وژه، تەوش، خورتی، هاز، توانایی، نیرەوان، پەلۆپۆ، توانایی، هێل، بەزە، زۆر، تەنیا،

برە، زەبروزەنگ، ڕچڵ، گاز، زاخ، ئەنیا، بەرگە، بڕشت، برە، تاو، زووخ، زەبەردەست، کـەڵـەزەڕی، گلوکـوێز، گـۆردی، مەندینە، وەرگە، هەڤل، هێل، کێش، سەرگر (في العتلة)، دەرەقەت، ڕچڵ، وزە، هەست، گیر، یارا، بارە.

- **قوة الانتاج:** هێزی بەرهەمهێنان.
- **قوة التثاقل:** هێزی قورسەکی.
- **قوة التجاذب:** هێزی یەکتر کێشکردن.
- **قوة تنفيذية:** هێزی بەجێهێنان.
- **قوة جاذبية:** هێزی ڕاکێشان، سرن.
- **قوة الجذب:** هێزی کێش، تەوژمی کێشان.
- **قوة جذب الارض:** هێزی کێشکردنی زەوی.
- **القوة الجوية:** هێزی هەوایی.
- **قوة دافعة:** پاڵهێز، هێزی پاڵ پێوەنەر.
- **القوة الدافعة الكهربائية:** پاڵهێزی کارەبا.
- **قوة الدفع:** هێزی پاڵنان.
- **قوة الشامة:** بهنۆ، هێزی بۆنکردن.
- **القوة الصاعدة:** هێزی سەرخەر.
- **القوة الطبيعية:** گازۆر، هێزی خۆڕسکی، تەوژمی خۆڕسکی.
- **القوة فطرية:** گازۆر.
- **القوة العسكرية:** هێزی سوپایی.
- **قوة لامسة:** ساوایی، هەستی لێکەوتن.
- **قوة محركة:** هێزی بزوێن.
- **قوة معنوية:** هەترەش، زندەق، زەهلە، کۆم، نەترە، هێزی ورە، زراو، زارەترەک، زار، زەندەق.
- **تركيب القوة:** پێکەوەنانی هێز.
- **عديم القوة:** بێ وزە، بێ تین.
- **القوة النووية:** هێزەکانی ناوکی ئەتۆم.
- **ذو قوة:** بەرگرگر، هێزدار.

**قـوت (ج) اقـوات (ە):** قـووت، ڕۆزی، بژیوی، بژێو، ڕۆژی، هۆی، ژیان، ئەمە لە (قووتدان)ەوە وەرگیراوە.

**القود:** یەدەک، یەدەک.

**قَوَد:** تۆڵە، خوێنڕێژ کوژتن.

**قوس:** مانگی نۆیەمینە بەپێی ژماریاری بورجان.

**قوس (ج) اقواس:** کەوانە، کەڤانە، کڤان، قاپ، کەڤان، کەمان، کەوان، کڤارک، گەو.

- **القوس الانعكاس:** پەرچەکەوان.
- **القوس الدائري:** کەوانەی بازنەیی.
- **قوس الفقري:** کەوانە پشت، بڕبڕەی کەوان.
- **قوس منتظم:** کەوانەی ڕێکوپێک.
- **قوس النصر:** تاقی پیرۆزی.
- **مقوَّس:** کەوانەدار، گەودار.

**قَوسَرة:** بەرچنە.

**قوس قزح:** کۆلکەزێڕینە، پەلکە شەبەندە، ڕۆژ زێڕینە، شەو بەندە ڕۆژ، هەســارە زەڕینە، پەلکە ڕەنگینە، ئەســتــوونە، کـەوانی ڕۆستەم، کەسک و سۆر، تیرەژە، کۆڵەزێڕینە.

- **نفس القوس:** هەمان قەوس.
- **قوسين صغيرين:** جووت کەوانە.

**قوصَرة:** زەنبیل.

**قوق** بڕوانە **(قوأة)**.

**قوقـأة الدجاج:** قـدەقـد، قـرتەقـرت، قـرتاندن، گـارە، گـارەگـار، گاراندن، قارەقاڕی مریشکان.

**قوقعة:** چەقچەقۆکە، تاقلە جنۆکە.

**قَوقَل:** کەوی نێر.

**قوقلة:** بەچیاو کێوان هەڵگەڕان.

**القـول:** وسـتن، وێژتن، وێشـتن، هوێـتن، کـوتـن، گـۆتـن، گـۆهتن، بێـژتن، بێـژان، وتن، ڤتن، واتەی، مـووش، واتن، مـیـەن، وەش، پەیڤ.

**قول:** وتە، کوتە، گۆتە، واژە، کەڤنەر، شۆب، وژە، واتە، گوفتار، وتوویژ.

- **قول الصدق:** ڕاستوێژی، ڕاستبێژی، وتەی ڕاست.
- **صادق القول:** ڕاستبێژ.

**قُل:** بڵێ، بوواچ، بێژە.

- **لاتقل:** مەڵێ، مەبێژە.

**قول (ج) اقوال:** بەڵێنی، هەرێ، گوفت.

- **اقوال مأثورة:** قسەی نەستەق.
- **اقوال فارغة:** گڵتە و فڵتە.

**قوم (ج) اقوام:** ١- هۆز، نەتەوە، ئێل، جۆم، دوودەمان، لێزم، نەڤـیـچرک ٢- گـرۆ، کـۆمـەڵێکە لە خـەڵکی ٣- کـەڵێکی هاونەژاد و هاوزمان ٤- خزم و کەسوکار، خۆیی، خۆیش

**قومي:** نەتەوەپەرست.

**قوميّة:** نەتەوایەتی.

- **أقلية قومية:** کەمەنە تەوایەتی.

**قوَنس:** بڕوانە (شُعبان).

**قـوي (ج) اقـويـاء:** بەهێـز، بەتین، هێـزدار، تیندار، زەبردار، بگەوەدە، کـاریگـەر، داگرتی، بۆکـە، دووتا، بەزاخ، خـووەڕوو، مایەدار، وەهاز، هازوار، دووباد، دووتا، زەبەردەست، زۆردار، بەگوشام، گوندار، توانا، دەستەڵاتدار، زەبەردەست.

- **قوي البنية:** ساخ، تەندروست، بەخۆوە، ئێڤنۆتە، مەندین.
- **قوي الجسم:** ساخ، تەندروست، بەخۆوە، ئێڤنۆتە، مەندین.
- **قوي الذاكرة:** بەیاد، بیرتیژ.

**قوى العشرة:** هێزەکانی دە، دەچاوگەی دڵ، دەچاوکە، دەسگای تەن.

**قَويم:** ڕاست و دروست، ڕاس، سـێخ، بەژن جـوانی و ناونجی، بالاجوان، وەک دووخی ڕاست.

**قيء:** ڕشانەوە، ڤـەڕشـان، دڵهـاوردنەوە، دلغـەلینەک، هێـڵـنج هاتن، قـورپ، قـلـپی ڕشانەوە، هێـڵـنج هێنانە خۆ بۆ ئەوەی خواردەمەنی ناوزگی بەزاری دابێتەوە دەرێ.

- **تجشئ للقيء:** هێڵنج هاتنەوە.
- **تحرك الى القيء:** هێڵنج، قرپ.
- **مقدمة القيء:** قلْپ، قوربی ڕشانەوە.
- **مقيء:** ڕشێنەوە، ڤەڕشێن.

**قـيـادة:** ١- ڕێ نیـشـانـدان، لەشکرگـێـڕی، لەشکرکـەشی، سەرکردەیی، سەرۆکێتی لەشکر، سپاڕانی، ڕێبەری، ڕابەری، بەڵەدی ٢- ئاژۆتن، لێخوڕین.

- **قيادة الاسطول:** دەریاداری.
- **قـيـادة الجيش:** فـەرمـانداری سـوپا، سـەرۆکـێـتی لەشکر، سپاڕانی، سوپاڕانی، سوپاسالاری.
- **مقر القيادة:** بارەگای لەشکری.

**مقود:** جڵەو، ڕست، لڤان، هەوسار.

**مِقياد:** جڵەو، ڕست، لڤان، هەوسار.

**قياس:** ئەندازە بەراوەرد.

**القيـاس:** پێـوان، بەراوەردکردن، ئەندازەگرتن، لێکدان، وازتێن، لێکدانەوە، پێچواندن، وێچواندن، پێمان، پێڤان.

- **قياس الحجم:** بارستپێو.
- **قياس الزاوية:** پێوانی گۆشە.
- **اجراء القياس:** پێوان، ئەندازەگرتن.
- **آلات القياس:** مرازەکانی پێوانە.
- **فن القياسات:** ئەندازەگەری.
- **مـقـيـاس (ج) مـقـايس:** مـرازی ئەندازە، ئەندازەگـر، پێـوەر، پێوانە.
- **مقياس الارتفاع:** پێوەری بەرزی.
- **مقياس التثاقلي:** پێوانەی قورسەکی.
- **مقياس الخارطة:** پێوانەی نەخشە.
- **مقياس الرسم:** پێوەری وێنەکێشان، وێچواندن، وێنەپێو.
- **مقياس الرطوبة:** شێ پێو.
- **مقياس السطوح:** پێوەری ڕوو.
- **مُقايسة:** خەمڵکردن، وەگرتن، دانان، بەراوەردکردن.
- **مديرية المقاييس:** بەڕێوەبەرێتی پێوانە.

**قياسي:** پێوانەیی.

- **لاقياسيان:** هاوپێوانە نین.
- **النسب القياسية:** ڕێژە هاوپێوانە.

**قيافة:** تووێزم، قەلافەت، سیما، فەساڵ.

**قيافة الرأس:** سەروسەکوت.

**قـيـام:** هەسـتـانە سـەرپێ، ڕاسـەوەبوون، هەسـتـان، هەڵسـتـان، هەڵسان، هالبوون، هلبوون، هۆستەی، هوورسەی، هێزکردن، ڕاوەسـتـــان، ڕابوون، ڕاپەڕین، ورێزان، هۆرێزان، هۆرزان، هالبوون، ئاخێزکردن، ڕاستبوونەوە، ڕاستەوەبوون، هەج، هەج، لە زاراوەی منالاندا، زیندووبوونەوەی ڕۆژی پەسلان.

**قياماً:** بەپێوە.

**قم:** هەستە، بروانە (قم).

**قيامة (يوم القيامه):** پەسلان، پاشەڕۆژ.

**قيثارة:** مرازێکی مۆزیقەیە.

**قيح:** کێم، هەوا، زۆخ، ئاداب.

**قـيـد (ج) قـيـود واقـيـاد:** ١- پێـوەند، پابەند، زنجـیـر، ئەشکێل، پابەست، پەیوەند، خـەلیلی، مـەرپەن، مـەربەند ٢- تۆمـار، زابەند.

**قيد (للدواب):** دەستبەند، پێوەند، پابەند.

**قيد (للرجل):** کۆت.

**قيد الكتاب:** تۆمارکردن، نەکەپووزکرن.

**قيد (التحديد الفرس):** سندم.

- **مقياد:** هەوسار، هەڤسار، قەراسە.
- **مقود:** کەمەن، کەمەند.
- **مُقيَّد:** پابەست کراو، پابەند، گرفتار، دەربەست، گیر، گیراو، گیری، گیرۆ، گیرۆدە.

**القيد:** تۆمارکردن، پەت کردن، سندم کردن، پێوەندکردن.

**قَيَّد تقييداً:** سندم کردن، پێوەندکردن.

**قَيَّدَ الدواب:** ولاخ بەستنەوە.

**قَيَّدَ الفرس:** پێوەندکردن.

**قيَّدة:** ڕەدووکەوتوو، ڕادوو.

**قير (ە):** قیر، قیل.

**قيراط:** لە یونانی وەرگیراوە، نیودانگ کە بەقەد ٤ جۆیە.

**قَيروان، قيروانات (ە):** کاروان، مەکارە.

**قيصر (ج) قياصرة:** نازناوی پێشووی پادشایانی ڕۆمی بووە.

**قيصري:** قەیسەری.

**قيصوم:** کاردوو.

**قيطان:** قەیتانی باریک کە لە ئاوریشمی دروست دەکرێ.

**قيطوس:** نەهەنگ، لە یۆنانی وەرگیراوە.

**قيطون:** دۆلاب.

**قيظ:** سەختی گەرما.

- **المقيظ:** ئێلاخ، هاوینەوار.

**قیف:** ڕەحەتی.

**قیفال:** ڕەگێکە لە باسکی خوێنی لێ بەردەدرێت.

**قَیقب:** ١- قەڵتاخی زین ٢- دارکەوت، کەوێت، کەڤۆت ٣- ئاسنێکە لە نێوانی لغاو و ئەو پارچەیەی کە لە زاردایە.

**قیّم:** نرخدار، بەنرخ.

**القیماق:** قەیماخ.

**قیلولة:** سەرخەوشکاندن، چاو گەرم کردن، خەو بۆ حەسانەوەی نیوەڕۆ.

**قیمة:** نرخ، بایی، مەزندە.

**- مقوِّم:** سەوداگەر، مەزندەکار، نرخ پرس.

**القیمة المطلقة:** بەهای تایبەتی، نرخی ڕووت.

**قیّم:** سەرپەرست، سەرپەرشت، کاربەدەست.

**قیِّن:** بڕوانە (حدّاد).

**قیوّم:** نەمر، پایندە.

# ك

**ك: پیتی بیست و دووەمینی ئابێی عەرەبییە**

**ك:** ڕاناوی کەسی دووەمە وەکوو: **کتابك:** ١- پەرتووکەکەت، پەرتووکت ٢- وەکوو، وەکی، بەوینەی: آزاد کالاسد: ئازاد وەکوو شێرێ وایە.

**كآبة:** پەرێشانی، کەنەفتی، نەگبەتی، نەگبەتێتی، تێشکان، ئاهێن، ئەنین، خاکەساری، کزی، سەرکزی.

**كائن (ج) كائنات:** هەبوو، ئافەریدە، پەیدابوو، تازە پەیدابوو.

**الكائنات:** هەسگەل، چتگەل، کەیهان، ڕۆژگار، تازە پەیدابووان.

**الكائنات الحية:** زیندەوار، گیانلەبەر.

**كائن حي:** گیاندار، گیانلەبەر.

**كائن خرافي:** مێمل.

**كابوس:** دێوەزمە، مێردەزمە، شەوە، تەنتەڵ، دێوەزمۆکە، دێوەڵووکە، شەشە، شەڤە، شەوڕەگ، ئاڵە، کامووس، ئاڵ.

**كاتب (ج) كتّاب وكتبة:** نووس، نووسەر، نووسێن، نووسەر، نووسیار، بنووس، دەوێر، میرزا، نڤیسکار، نڤیسیار.

- **كاتب التعاويذ:** کۆلێنانی، نوشتەونووس.
- **كاتب الحسابات:** نووسەری ژمارەگەری، پەڕاوی گر.
- **كاتب السر:** ڕازنووس.
- **كاتب الطابعة:** تیپکار، تلێنڤیسەر.
- **كاتب الطلاسم:** تەلەسم نووس، جادوونووس.
- **كاتب العدل:** دادنووس، دادپەروەری نووس.
- **كاتب النقابة:** نووسەری سەراچە.

**كاتم:** بڕوانە (**كتوم**).

**كاتم السرّ:** ڕازدار، ڕازپۆش.

**كاحل:** ١- چاوڕشتوو، کل لە چاو کردوو، مۆن، مۆر، مش و مۆڕ ٢- جومگەی نێوانی لوولاک و پێیان.

**كاد كوداً:** نێزیک بوون.

**كادح:** ڕەنجبەر، ڕەنجدەر، ڕێنجبەر، کادر، کارگێڕ، هەربین، کارهەڵسووڕێنەر.

**كاذب (ج) كذاب:** درۆزن، ناڕاست، ڤرکەر، ڤرڤرۆ، ڤرۆکەر، دەرەوێر، دەرەوێر، دەرەوین، ڤرڤرە، بەفیشاڵ، فیشاڵکار، فیشاڵکەر، نەرمەبڕ، زووانباز.

**كاذة:** وەرڤەگ، مووسلدان، بەرزگ.

**كار:** مرخن.

**كاربون غير نقي:** کاربۆنی ناپاک، کاربۆنی گەرددار (کیمیا).

**كارثة (ج) كارثات وكوارث (ه):** کارەسات، بەدبەختی، ڕووشە، پەرۆش، بەسەرهات، گۆنگەڵ، تاوێر، هێل، چورتم، کۆلاو، فەتەڕات، هەوان، هێل، کۆست.

**كاره:** بێزوبۆ کار، بەناپەسند زان.

**كأس (ج) كئوس (ه):** کاسە، پیاڵە، بادە، پەیمانە، ئیستیکان

- **كأس خشبي صغير:** قودیلە، کۆجیلە.
- **كأس خشبي كبير:** کەموولە.
- **كأس الزهور:** کاسەی گوڵان، کاسە و کیفی گوڵان.
- **كأس الماء:** لێوان، کاسەی ئاوێ.

**كاسب:** سەوداگەر، فریاد، گردۆکار، گردوکۆشکار.

**كاسد:** بێ بازاڕ، کەساد، نارەواج، بێ برەو.

**كاسر (ج) كواسر:** شکێنەر، شکێن.

**كاسل:** ولووڵ، تەنبەڵ، خاو.

**كاسي:** ١- کۆک، پۆشتە، بۆشناخ ٢- پۆش، پۆشندە.

**كاشر، مكاشر:** ددانکڕ.

**كاشف:** پەیداکار، وەدەرخەر، دەرخەر، دۆزەرەوە، ئاشکراکار.

**كاظم (ج) كظم:** ڕق خۆرەوە، بێ دەنگ، پشوو خۆرەوە.

**كاف:** بەس، تێڕا، وەس، بەسە.

**الكافت والكفات:** شاردنگە، پەناگا، پەنا، مەکۆ، کەهێن

**كافة:** هەمووی، تێکڕا، گشتی، هەمی، تەڤدە، ڕایگەم، سەرانسەر، سەراپا.

**كافر (ج) كفار (ه):** گاور، گومڕا، بەدڕا، ڕام نەبوو، بەدخوار، بێ باوەڕ، شەوی تاریک.

**كافور (ه):** كافوور، دەرمانێكی بۆنخۆشە، چێوەی دارێكیشە، گیایەكی بۆنخۆشە، بەبەری دارەكەش هەر دەڵێن كافوور.
**كافي:** بەس، بەسە، تێرا، وەس، ڕەس.
**- مقدار الكافي:** تێچن.
**- مكافىء:** بەقەد.
**- مكافأة:** تۆڵەی چاكە.
**كالّ:** كول، كۆڵ، نەبڕ (بۆ تیغ).
**كال بكيل:** پێوان.
**كالبتوز:** ژاگر.
**كالح:** ١- مۆن، ڕووترش، گرژ، تووش، مۆڕ، دوومێرەكی، گڤن، ڤرمۆز، مچ و مۆڕ، مێر ٢- سەخت، دژوار.
**كالمه مكالمةً:** دواندن، لەگەڵ كەسێكی ئاخەفتن، شتەغالی، یەكتر دواندن.
**كامل:** ١- تەواو، دروست، خشت، سەرپاك، ڕەبەق، خڕ، دەق ٢- ئامادە.
**- غير كامل:** ناتەواو، كەموكوڕی دار، كەم و كورت.
**كاملاً:** بەتەواوی، تەڤ، تەڤدە، خڕ، خشت.
**كامن:** شارراوە، پەنهان.
**كان:** بوو.
**- ماكان:** نەبوو، نەوو.
**- لم يكن:** نەبوو، نەوو.
**كأنه:** گۆیا، وەسە، سایكە.
**كأن، كأنه:** دەڵێی، ئێژی، نەیژی، ئەرەچیا، سایكە، مەرچیە، هەروەكو.
**كأنما:** هەروەكو.
**كانون:** ئاگردان، مەقەڵی.
**كانون الأول:** مانگی دوازدەمینی ڕۆمییە ٣١ ڕۆژە، بەفرانبار، كەوبەردار.
**كانون الثاني:** مانگی یەكەمینی ڕۆمییە، چلە، ڕێبەندان، هەوەڵزستان.
**كاهل (ج) كواهل:** ١- نێوشان، ناومل، سەرشان، كاهێل، ناوشان ٢- سست، تەوەزل، داكەوتوو.
**كاهن (ج) كهنة:** كۆنەمرۆ، پیر، كەسێكە وا خۆی نیشان دا كە ڕازی نهێنی (غەیب)ی دەزانی، كەسێكە لە ڕێگای خواپەرستێتی دا ڕەنج و ئازاربكێشی.
**كاهن اليهود:** مالم.
**كئيب:** خەمناك، دڵتەنگ، داماو، پەرۆشدار، دڵزار، پەست، پەنزەهار، خەمبار، زنخ، خۆڵبەسەر، خاكبەسەر، دڵشاد.
**كبّ كبّاً:** ڕژتن، وەرگێران، دەرنەقووتكرن، قلپ كردنەوە، ڕژاندن، ڕێژتن، ڕشتن، سەركز، قوڵپاندن.
**- مُكِبّ:** كەسێكە هەمیشە سەری خۆی شۆڕكاتەوە و تەماشای زەوی بكات، سەرشۆڕ.
**كبابة:** بەری دارێكییە پتر لە هیندوستانێ دەڕوێ وەكو دەنكی بەلەسانی وایە پێشی دەڵێن (حب العروس).
**كُباد:** جەرگ ئێشە، ئێشی جەرگ، كەبات.
**كُبار:** گەورە.
**كُبارة:** گەورەیی.
**كبة (ج) كبب:** قانكڵی دەزوو و نیتر، كەلاف، كلافە، گونەڵە، گلۆڵە، كرۆز، گرۆفك.
**كبة (طبخ) (ه):** كفتە، كوفتە، كووتە، كووتلكە، كرك.
**كبة البرغل:** كووتلك.
**كبة ثلج:** كلووی بەفری، تۆپە بەفر.
**كبة الخيط:** گلۆڵە دەزوو، كەلاف، كلافە، گونەڵە.
**- مكبة (ج) مكبات:** غەرغەرە، خرپلە، ئارماز، خەبینە، خەبینەت.
**كبت:** ئابڕووبردن، سووك و نزم كردن، بەسەختی بەسەر دوژمنان دادان.
**كبح:** لغاو و جڵەوكێشان بۆ ڕاگرتنی وڵاخ.
**كبد (ج) أكباد:** جەرگ، جیگەر، یەهەر، پیلاڕەش.
**- التهاب الكبد:** جەرگ ئێشە.
**- تضخم الكبد:** جەرگ ئاوسان.
**- تورم الكبد:** جەرگ ئاوسان.
**- متورم الكبد:** جەرگ ئاوس.
**- حلزوني الكبد:** مارپێچی جیگەر.
**- لوعة الكبد:** كزەی جەرگ.
**- كبد السماء:** كەشكەشانی فەلەك.
**كبداء:** نێوانی ئاسمانێ، دەستار، كەوانەیەكە دەسكەكەی پڕ بە دەست بێ.
**كبدت الشمس السماء:** ڕۆژ گەیشتە نێوەڕاستی ئاسمانێ.
**كَبُرَ:** گەورە بوو.
**- مُكَبِّرة:** بڵندبێژ، بڵێنەبێژ.
**كبر:** ١- گەورەیی، مەزنی، پایەبەرزی، زلی، شانازی، فیز، فیزداری ٢- فیز، هەوا، لووت بڵندی.
**- مكابرة:** خۆ بەفیز و گەورە نواندن.
**كبرى:** مێیینەی (اكبر)ە.
**كبرياء:** ١- گەورەیی، ترزلی، ترزلێتی، مەزنی، مەزناهی ٢- زەبروزەنگ.
**كبريت:** گۆگرد، كەوكورت، ككرت (سەلفەر) ٢- شەمچە، لێخرتنە (شخارتە).
**الكبريت:** ئۆكساید (كیمیا).

- اسيد كبرتيهك: ترشاوى گۆگردى، سولفريد ئەسيد.
كبريتات: گۆگردان، (سولفان).
كبس كبساً: ١-پەستاوتن، پەستین، پەستان، لە سنگ و بەردنان، پەستاوتنەوە، داگرتن، داپەستان، ناخنینەوە، پەستانەوە، پەستن، داپەستاوتن ٢- لە پرێکا پێدادان.
كبس الحملَ: بارداگرتن.
- مُكبِس: پەستێنەر.
- مَكْبَس (ج) مكابس: مەنگەنە، جەڕ و مەنگەنە.
- مَكْبَس دوّار: پەستێنەری گەڕۆک.
- المكبس المائي: مەنگەنەی ئاوی.
- مكبوس: ناخنراو، پەستاوتراو، پەستراو، داپەستراو، پەستوو
كبش (ج) كباش: بەران، وەرەن، وەران، قۆچ، نگل.
- كبش ذو سنتين: مازماز.
- كبش المخصي: هۆگەچ.
- كبش المخصي ذو سنتين: مازماز خەساندی.
كبكبة: بروانە (دبدبة).
كبل (ج) كبول: زنجیری بەندیخانە.
كبو: سەرسمدان، سەرەنگرێ دان، نسكۆ، هەڵەنگووتن، سەرەنگرێ، سەرسم، سەرمەقولات، ساقە.
كبير (ج) كبار، كبراء: مەزن، زل، گیر، زۆپ، سەر، زەلام، بۆڕ، بێمێز، درشت، شینە، كەلان، كەڵە، لۆفە، یە، زنک، گر، گرا، گەورە.
- الاكبر: گەورەترین، زلترین، هەرەگەورە، گەوسۆنە.
- الاكبر في السن والقيافة: هەراش.
كبيرة (ج) كبائر: گوناهانی گەورە وەكوو كوژتن و داوێن پیسی
كبيس: ١- جوورە خورمایەكە ٢- جوور خشڵێكی ناو بەتاڵە و پڕ لە بۆنی خۆشە.
كبيسة: لە چوار ساڵاندا جارێكی ڕۆژێک خستنە سەر مانگی شوباطی.
- كبيسة الكبائس: ساڵی سێزدە مانگ.
- السنة الكبيسة: ساڵی سێزدە مانگ.
كُتّاب: دوگمەتیر، تیری دوگمەدار.
كتاب (ج) كتب: پەرتووک.
كتاب (رسالة رسمية): نامە، ڕەشبەڵەک، ئابادی، دەستنقیس.
- كتاب طبي: پەرتووکی پزشکی.
- كتاب رسمي: نامەی دیوانی، نامەی یاسامەنی.
- كتاب العار: نەنگنامە، شوورەیی نامە.
- كتاب اللغة: فەرهەنگ.
- كتاب القانون: داڵنگۆ.
- كتاب مخطوط: دەستنووس، دەستنقیس.

- بائع الكتب: پەرتووكفرۆش.
- كتابكم: نامەكەتان.
كتابة: نووسین، نوویسین، نڤیسین، نووسان، نووسەوەری، نوویسان، نووسەری، نووسیاری.
- معرفة الكتابة والقرائة: سیواد.
كتابة اليد: دەستنووس، دەستخەت.
كتب كتباً: بروانە (كتابة).
مكتب (ج) مكاتب: قوتابخانە، فێرگە، دەبوستان، خوێندنگە، مەكارە.
- المكتب الخاص: نووسراوخانەی تایبەتی.
- المكتب السياسي: شوێنی ڕامیاری.
- مكتب للمحاماة وغيره: شوێنی پارێزەران.
- مكاتبة (ج) مكاتب: نامە بۆ یەكتری نووسین.
كتابي: خاوەند پەڕتووک.
كتان: گیایەكی لاسک باریک و بڵندە گوڵی لاجوەردی هەیە، كەتان، گوڵەكەتان، لە ساقەكانی گوڵەكەتان دروست دەكرێ.
- قماش الكتان: قوماشی كەتان، پارچەی كەتان.
- دهن الكتان: ڕۆن كەتان.
كتباً: بەنووسین.
كتبي: پەرتووكفرۆش.
كتف (ج) اكتاف: شان، پیل، مل، پێ.
- كتف الجبال: ملە.
- لوح الكتف: دەفەی شان.
كتلة (ج) كُتَل: ١- قەوارە، كۆمای چت، كۆگای چتی، ماسە، بارستە، تۆپەڵ، بارستایی، بارست ٢- تەپۆڵكە، كۆمای قوڕ
كتلة في الفيزياء: بارست.
- كتلة حصيد الشعر والحنطة: مەڵۆ، مەلوو، مەلووک.
- عدد الكتلة: بارستە ژمارە.
كتلي: كەتری، قۆری تەنەكە.
كُتَم: كەڵای نیل، وەسمە.
كتم: شاردنەوە، داپۆشین، حاشاردان، بەژێر لێوەوەكردن، پەنام كردن.
- مكتوم: پۆشراو، پەنهان كراو.
كتماً: بەپەنهانی، بەداپۆشراوی.
كتمان: پەنهانكردن، ڕازشاردنەوە.
كتوم: ڕازدار، پۆشەر، بەڕاز، ڕازڕاگر، ڕازشێرەوە.
كتيبة (ج) كتائب: ١- دەستەیێكە لە لەشكرێكی ٢- ڕەوە، ڕەوگ، دەستەیێكە لە ڕەوەی یەكسمان ٣- دەستە سوارێكە، دەستە، لەشكرێكە ٤- نووسراوێكە لەسەر دەرگا یا دیوار، وە یا لەسەر بەردی، و یا لەسەر كاشی بێ.

**کتیم:** پەنهان، نهێنی.
**کثار السؤال:** قەرە هەواڵ، پرپرس.
**کثافة:** نەستووری، ستووری، کەماچی، چڕی، خەستی، پەیتی، توندی، پیسی، چڵک.
**کثرة:** زۆری، زەبەندی، فرەیی، گەلێک، مشەیی.
**کثرةً:** زۆربوون، مشەبوون، پەرسەندن.
- **کثرة المشاغل:** پەژارە، بارگرانی، سەرقاڵی.
- **غایة الکثرة:** فت و فراوان.
- **بکثرة:** زۆربە، زۆربەیەتی، زۆربەیی.
**کثیب:** تەپۆڵکەی خیزی یا لیمی.
**کثیر:** زەعەف، زۆر، فت و فراوان، فراوان، کەماچ، مۆلفی، گەلەک، گەلێک، زەبەند، زۆربە، فرە، زەعەڤ، مشە، زەهف، قەوی، زەمە، ژەمەند، بۆش، گڕۆمە، زەحەڤ، بۆڕ، پڕ، زەحف، زەحڤ، زەعڤ، گەل، گەلێ، مشەمەر، (ئەردە.).
- **کثیر الاضلاع:** خاوەندی چەندین لاکۆشە.
- **کثیر جداً:** ئێکجار زۆر، ئێجگار فرە.
- **کثیر العدد:** ژمارە زۆر.
**کثیرا (ە):** کەتیرە.
**کثیراً:** زۆرجاران، فرەجار.
- **کثیر الصدق:** ڕاست بێژ، ڕاستاڵ.
- **کثیر الصّمت:** کەمدوو، کەمدووێن.
- **اکثر:** زۆرتر، زەبەنەتر.
- **الاکثر:** زۆرترین، فرەترین.
**کثیف:** ١- نەستوور، ستوور، کەماج، بۆڕ، چڕ ٢- توند، چڕ، خەست ٣- گرانجان، ڕەزاگران ٤- پیس، چەپەڵ، ناپاک.
**مکثاف، مُکَثَّف:** خەستکار، خەستەر، چڕکەرەوە، خەست کەرەوە
**کَح (ە):** کۆخە، کۆخین.
**کحال:** ١- چاوڕێژ، کل لە چاوکار، سوورمە لە چاوکێش ٢- پزشکی چاوان، باپێش.
**کحالة:** پزشکێتی چاوان، باپێشی، سوورمە لە چاوکێشان.
**کحل، الکحول:** ئالکۆل.
**کُحل:** کل، کلە، سوورمە.
**کحل کحلاً:** کل لە چاوکردن، چاوڕشتن.
**کحلاء:** مێیینەی (اکحل)ە، ژنێکە چاوی ڕشتبێ.
**کَحیل:** چاوڕشتوو، کل لە چاوکراو.
- **مِکحل:** کلچێوک، کلچۆک، پارووشک، کلچۆڤ، کلتوور، مێڵ.
- **مکحلة:** کلدان، کلدانک، کلەدان.
**کدّ:** دنگ، دینگ، کلتوور.
**کدّ:** ڕەنج، کۆشەوە، خەبات، ئازارکێشان لە کارکردندا.

**کداس:** کلیلە بەفر، کۆمەڵە بەفر.
**کدأس:** پرماندنی ولاخ و ئاژاڵ و ئیتر.
**کدح:** ڕەنجبەری.
**کدر:** لێڵ، شلوێ.
**کدر:** ١- پەرۆش، خەفەت، خەم، کزی، پشێوی، بووشکول ٢- شلوێ، لێڵ، شێلوو، شلوو، لێلاو، تێکڵ، شێلوێ، لێخن.
**کدِر:** خەمبار، خەفەتبار، دڵکول.
**کدَرة:** شلوێیی، لێخن بوون.
**مکدّر:** خەمناک، دڵکول، خەفەتبار، خەمگین، کز، داماو، بڕەش
**کُدس (ج) اکداس:** تایە، گیشە.
**کدسة وکداس:** پشمینی چوارپێ، پشمین. جارجارە بۆ مرۆڤانیش بەکاردەبرێ.
**کدمة:** خوێن تێزان.
**کدورة:** دڵتەنگی، ئالۆزی.
**الکدیة (ە):** گەدایی، سەختی ڕۆژگار.
**کدیش (ج) کدش:** بارگیر، بارگین، کادانە.
**کذا:** هەروا، هەما، هەنگوورە، هۆ، هۆتۆ، وەتۆ، وەسان، وەک وەی، واتە، واسە، واوا، وایە، ئاوا، بەو جوورە، بەو چەشنە، وا، وسا، ولۆ، ئەوها، هووسا، ڤەهە، ئەئاوا، ئەیوا، پاسەن، ساماڤایە، وەتی، وەها، وەهات.
**کذاب:** بڕوانە (کاذب).
**کذلك:** بڕوانە (کذا).
- **ألیس کذلك:** وانیە.
**کذب:** زوانبازی، نەرمەبڕی، درۆ، هەلات، دەلەسە، ڤر، ڤرکا، قەوانە، گەزاف، گزنی، هەڵبەست، هەڵبەستراو، دەرموناڕاست، هەلات، خواری، پۆت، چاپ، چاپ و چووپ، چاووڕاو، چڕین، درۆکردن، درۆزنی.
**کذوب:** زۆر درۆزن.
**کُرّ:** پێوانەیێکی ئاوێیە کە درێژی و قووڵی و پانی هەریەکەی سێ بست و نیو بێ، ئامانێکە (٣٥٠) لیتر ئاو بگرێت.
**کَرّ:** پەلامار بۆ سەر دوژمن، هەڵمەت بردن.
**کَرّ وفرّ:** وەرگەڕانەوە سەر دوژمن لە مەیدانی شەڕێدا و لە پاش گەڕانەوە هێرش بردن.
**کرا:** (ە) کرێ.
**کراث:** کەوەر.
- **کراث بري:** کوڕادە، قوڕادە، سڕمۆکە، کتی واڵ.
- **کراث البغل:** کوڕادە، قورادە، سڕمۆکە، کتی واڵ.
**کراج:** گاراج، گارلژ، خۆشبەزخانە، خۆڕۆخانە، خۆشڕۆخانە.
**کرأر:** زۆر هێرشبەر، هەڵمەتبەر، بەتەژوژمەوە شەڕکردن، پەلاماربردن.

**كراز:** تونگەی گەرووتەنگە، پیپۆک.

**كُراز:** بەران.

**كـراسـة (ج) كـراريس:** بەند، پەڕاوی، پەلدانک، بەندە پەڕتووکێک.

**كراع (ج) كوارع:** پاچە، سەروپێ، کەللەپاچە، سەروپاچک، کەللە و پاچە.

**كرام:** ڕەزەوان.

**كرامة:** ١- قەدر گرتن، ڕێزگرتن ٢- قەدر، ڕێز، گەورەیی، ئابروو، ئاوروو، خۆشەویستی ٣- فەرمان و کاروبارێکی سەیرو نەدیتراو لە کەسێکییەوە دیێ.

**كراوة:** والّ (جوغرافيا).

**كراهة:** بێزان، بێزوبۆ لێکردن، بێزیان، خۆشنەویستی، ناپەسندی

**- مكروه:** بێزوبۆ لێکراو، گەند، گەندەژە، ناپەسند، ناشیرین، ناڕەوا.

**كراهية:** ناپەسندی، بێزران، لێ بێزران.

**كراية (ه):** کری.

**كرب (ج) كروب:** ١- خەم، پەرۆش، ناخۆشی ٢- ئازار، ڕەنج، مەینەت.

**كرب:** وەرد، کێڵان.

**كرباس (ج) كرابيس (ه):** (پارچەی لۆکەیی).

**كربال:** بێژنگ، کەوانەی پەڕەکەری.

**كربة:** حزن، خەم، پەرۆش.

**كَرَّة (ج) كـرات (ه):** کـەڕەت، جـار، چەل، هەل، حـەل، چین، کایە، گل، کاو، گەڕ، خول، نۆبە، نۆرە، هەیتێ.

**كُرَة (ج) كـري وكـرات:** گـۆ، کـوودە، تۆپ، هەنارک، خـڕۆک، بەهەموو چتێکی خڕ دەڵێن.

**- الكرة الارضية:** گۆی زەوی.

**- الكرة بيلسان:** تۆپی بەیلەسان.

**- كرة الثلج:** تۆپە بەفر، تۆپەڵە بەفر.

**- كرة حجرية صغيرة التي يلعب بها الاطفال:** مەڕمەڕ، کەللا، گوللە.

**- كرة خشبية:** هۆگەگ.

**- كرة الريشة:** تۆپی پەڕ.

**- كرة السلة:** باسکە، یاری سەبەتە، تۆپێنی شەبەکە.

**- كرة الطين:** تۆپەڵە قوڕ.

**- كرة العين:** کلێنەی چاو، گلارەی چاو.

**- كرة القدم:** چهیر، ساقوول، تۆپ، تۆپی پێ، تۆپی تۆپێنێ.

**- كرة المنضدة:** یاری تۆپێنی سەرمێز.

**- كرة اليد:** تۆپی دەستی.

**- لعبة الكرة:** تۆپێن، تۆپانێ، تۆپەڕاکردن، هۆلانە.

**- لعبة الكرة بالصولجان:** هۆلێن، هۆلی، شەقێن، شەقانێ.

**كرج:** کەرەکیفە.

**كُرد (ج) اكراد:** کـورد، کـرمـانج، کـاردۆ، کـاردۆخ، کـوردۆ، کاردۆک، پاڵەوان، هۆزێکی ئاری نەژاد و ناسراوە و لە هەموو شـوێنێکی گـێتـیـدا بەئازایی و جـوامـێـری و بەزەییـداری و دڵفـراوانی و نەبەزی و مـیـوان پەروەری و بەخـشـندەیی ناوبانگی دەرکردووە. ناوی نیشـتمـانەکەشـیان (کوردستان)ی پیرۆزە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاسـتـیـدا بەسـەر ئێـران و ڕوسـیـا و تورکیا و سووریە و عێراقیدا دابەشکراون.

**كردستان:** کوردستان، شوێنی کورد، جێگای کورد.

**الكردوس:** ڕەوە، ڕەوەگ، ڕفو.

**كردي:** مرۆڤی کورد، زمانی کوردی.

**- اللسان الكردية:** زمانی کوردی.

**- اللغة الكردية:** زمانی کوردی.

**كرز:** گەلاز، هەڵووچە، هەرووگ، هەڵووژە، گەوجە، هەڵوچکە، هەرووک.

**كُرسف - كُرسوف:** لۆکە، لیقەی دەواتییە.

**كرسي (ج) كراسي (ه):** کورسی.

**كرش (ج) كروش:** ورگ، خۆرگە، گەیە، گەدە، ئورگ.

**- ذوكرش:** ورگن.

**- مكرّش:** ورگن، زگن، سکن.

**- المكرشة:** گیپە.

**كرع:** زار لەناو ئاونان و ئاو خواردنەوە.

**كرع (ج) كوارع:** سەروپێ، کەلەپاچە، کەللەپاچە.

**كرفس (ه):** کەرەوز، چەوف، کەرەسپ، کەرەوس.

**- كرفس الماء:** کووزەڵە.

**كركدن (ه):** کەرگەدەن.

**كركرة (ه):** کرڕە کرڕ.

**الكركرة:** دەڵەمە.

**كركم:** زەعفەران.

**كركي (ج) كراكي:** قوڵینگ، قورینگ (باڵندە).

**كرم (ج) كروم:** مێو، دارەمێو، داری ترێ، مەردەمێری، مێیو، زیج، زیچ.

**- الكرم الجبلي:** نزبە.

**- سناد الكرم:** قایەی مێوی.

**- شتل الكرم:** قاشۆ مێوی، هشەل.

**- ورق الكرم:** گەلامێو، پەلکی مێوی.

**- طلع الكرم:** بلۆقی دارە مێوی، گۆپکە.

**كَرَم:** دڵفـراوانی، بەخـشـندەیی، ڕەندی، جـوامـێـری، پیـاوەتی، جوانمەردی، جووانمێری، چاکە، دەسـتدرێژی لە بەخشندەیەتی، نان بدەیی، دەس و دەهەنە.

- **الفرط في الكرم:** لووچەک.
**کرمانج:** بروانە (**کرد، اکراد**).
**کرنب:** داشکەلەم.
**کره کراهةً:** بروانە (**کراهة**).
- **مکروه:** بێزوبێ لێکراو.
**کري:** خریلە، گرد، گردیلە، گۆیی، گرمۆچە، گرمۆلە، گۆیانە، گرمولە، خڕۆک.
- **البعد الكروي:** دووری گۆیی.
**کروي:** کەرەوالە.
**کري:** ئەوەیە کە لە خەوندا دەبینرێت.
**کريات الدم الحمراء:** خڕۆکە سوورەکانی خوێن.
**کريات الدم الابيض:** خڕۆکە سپییەکانی خوێن.
**کريز:** بروانە (اقط).
**کريص:** شیرێژ، یراج.
**کريم (ج) کرام:** ڕەند، جـوامێـر، نان بدە، ناندەر، جـوانمێـر، جوانمەرد، بەخشندە.
- **غير کريم:** چرووک، نەمێر.
**کريمة (ج) کريمات:** ئافرەتی ڕەند.
**کريه:** گەند، گەندەژە، ناپەسند، ناشیرین.
- **صوت کريه:** هۆڕە.
- **کريه المنظر:** ناحـەز، ڕەزاگـران، دزێـو، خـوێن تاڵ، بێ ڕەزا، ئێسک قورس، مرقن، ئێسـک گران، خوێنسارد، سەرفڵت، سیخن.
- **مکروه:** ناحەز، ناپەسند، بێزوبێ لێکراو، نارەوا.
**کزاز:** ١- گوێ ڕەپەی وڵاخ و ماڵاتانە، دەردەکۆیان، قەسـەر ٢- لەسەرمان قـەسرین، سربوون، پێستی لەش قرچ هەڵاتن ٣- ناوی نەخۆشێکە کە بەهۆی برینەوە میکرۆبەکەی دەچێتە نێو لەشەوە.
**کزبرة:** گژنیژ، کژنژە، (گیایە) ٢- ڕەشکە
**کساء:** پۆشاک، بەرگ، جل، پۆشامەنی، جلوبەرگ، پەڵاس.
**کسابة:** سەوداگەری، کڕین و فرۆشیاری، دان وستاندن، مزیاری، گرد و کۆش، سەوا، سەودا، هەوڵ و دەو.
**مکسب (ج) مکاسب:** ئەوەیە کە لە کـڕین و فـرۆشـتندا دەست دەکەوێ قازانج، سوود.
**کسّاح:** ڕادەر.
**الکساح:** ئێسکەنەرمە.
**کساد:** نارەواج، بێ برەو.
**کسارة:** شکێن.
**کسارة:** چکێ، کەمێ لەهەر چێێکی بێ، ورتکە، وردە، نەختێ.
**کسارة الخبز:** ورتکەنان، کورتەڵ.

**کسارة السکر:** شەکر شکێن.
**کسالة:** تەنبەڵی، تەوەزەلی، پیکانی، بڵحی، تەپی، خەمساری، خەمساردی، لەش گرانی، سستی، لەش داهێزران.
**کسب:** سـەوداکـردن، دەست خـستن، دەسـتگیـر، قـازانج، سـوود وەدەست هێنان.
**کسب کسباً:** سـەوداگـەری کردن، بەشـوێن مـاڵداری و خـوێندن کەوتن.
**کسب الرهان:** گرێو بردنەوە.
**کسب الوقت:** کات بردنەسەر.
**کسح کسحاً:** بروانە (**کنّس کنساً**).
**مکسحة:** بروانە (**مکنسة**) لە (**کنّسَ**)دا.
**کَسر (ج) کسور:** کەمێ، کێمی، ئلۆل، ساتن، کەل، شکست، کەرت، پارچە، نیو، سێیەک، چواریەک، پێنج یەک، شەست یەک، حەوت یەک، هەشت یەک، نۆیەک، دەیەک ئەوەیە کە لە ئەژماریاری شایانی دابەشکردن نەبێت.
**الکسـر (ج) کـسـور:** ١- شکاندن، کـەرتکردن، داشکاندن، شکیـاندن، قـەرستن، قەیتاندن، قـەرستـاندن، مخـمخـاندن، ڕاشکـاندن، سـاتن، تووخـانـدن، دەرزاندن، مـاردەی، هەرسـتـاندن، ئلۆل کـردن، پەڕاندن، شکاندنەوە، هراندن ٢- ڕاونان، ڕەپێ نان، شکست تێخستن، قەتی خستن.
- **کسر اعتيادي:** کەرتی ئاسایی.
- **کسر بسيط:** شکانی ساکار، شکانی سادە.
- **کسر حقيقي:** کەرتی ڕاستەقینە، کەرتی بەڕاستی.
- **کسر الخبز:** ورتکەنان.
- **کسر عشري:** کەرتی دەیی.
- **کسر قطعي:** شکاندنی گردەبڕ.
- **کسر لفظي:** کەرتی زاری.
- **کسر مرکّب:** کەرتی ئاوێتە.
- **کسر العظام:** شکاوی ئێسک.
- **کسر اليد:** دەست شکاندن.
- **ارقام کسرية:** ژمارەی کەرتی.
**مکسَّر، مکسور:** شکاو.
**کسـرة (ج) کسـرات:** ١- ژێرە (ِ) ٢- کـوت، لەت، تیکە، پارچە ٣- هەڵاتن، شکان.
**کسرا، کسری** (ە): کەیسەرا، کیسرا، بەپادشایەکانی ساسانیان دەکوت کسرا کە زنجیرەکەیان لە سەرەتاوە تا ئەنجامی کوردی فەیلی بوون..
**کسری (ج) أکاسرة:** بروانە (کسرا) ناوبانگی پادشایەکانی ساسانی بووە کە فەیلی بوون.
**کسع:** تێهەڵدان.

**كسف:** برين، گيراني مانگ يا ڕۆژ.

**كَسَّل:** تەپڵۆسی، تەمبەڵی، سستی، دڵسستی، تەوەزەلی.

**كَسِل:** بروانە (كسلان).

**كَسِل كسلاً:** بروانە (**تكاسل**).

**كسلان:** لەشگران، قەلپ، بێ قوونەبان، تەپ، دەخەڵ، دڵسست، تەنبەڵ، تەوەزەل، خاو، سست، منۆغ، بێ كار، تەپلۆس، فسۆس، چەل، ترال، تەپان، قوون فرە، بلەوەز، تەواساو، برانگوە، برانگوویا، برانگهەد، باپیكان، خنۆك، تەپلەتر، تەسەڵ، باپیشان، بارهەنگف، بلح، تەسەڵ، خەمسار، خەمسارد، دەستگران، فسۆس، منۆخ.

**كسمة:** مووی پێچراو و لوول دراو لە كەنار ڕوو، پەرچەم.

**كسوة:** بروانە (لباس).

**كسور:** پارچەكان، كەرتەكان.

- **كسور المتر:** كەرتەكانی مەتر.

**كسوف الشمس:** ڕۆژگیران، گیرانی خۆر، پەناگرتنی ڕۆژ، خوەر دوور گرتن، هوێرگیران.

**كسول:** بروانە (**كسلان**).

**كش (ة):** كششە (بۆ دەركردنی باڵندان).

**كشاف:** ئاشكراكار، پێخواز، دۆزەرەوە، واتازان، دیدەوان، پەیجۆ، پەیخواز، گەمار، ئاشكراكەرەوە، پێشرەو، ڕێناس، ڕێزان، دەرخەر، ژوور دەستی گەسك لێدەر و كۆلان و شەقام و مالان.

- **الكشاف الكهربائي:** كارەبا دۆزەرەوە.
- **كشافة:** دیدەوان، قلێر، پێشرەوان.
- **انوار الكشافة:** شەوق ئاوێژ.
- **التربية الكشفية:** پەروەردەی دیدەوانی.
- **قائد الكشافة:** سەردیدەوان، سەركردەی دیدەوانی.
- **قنينة الكشافة:** كەموولە چرێ.
- **كشافة او استطلاع الجيش:** دیدەوانی پێش لەشكری.
- **المخيم الكشفي:** خێوەتگەی دیدەوانی.

**كُشَّة:** ١- گوودڵە، گوودیلە ٢- نیوچاوان، ناوچاوان.

**كشتبان:** كلك واتە، ئەنگوستیلەی درووممانێ، هنگوستۆك، كلكەوانەی درووممانێ، دەق، سەرتلیلك، قوپچەكە، سەرتیلك.

**كشح:** قەبرغە.

**كشر:** مراندنی سەگ، مرەمر.

- **مكاشر:** ددان گر.

**كشطة:** داماڵین، كراندن.

**كشط (مصطلح هندسي):** كراندن.

**كشف:** ئاشكراكردن، ناسینەوە، دۆزینەوە، پشكنین، پەیخوازی، پەیجۆیی، دەرخستن، پەیدۆزی، پشكناندن، مەرە، ڕەخساندن، پێخوازی، پەردە لەسەر چتێ لابردن، نۆڕین، ناسینەوە.

- **مكشوف:** بەربەرەڵا، ئاوەڵە، سەرئاوەڵە، ڕاست ڤەكری، سەربەتاك، واڵا، سەربەرەڵا، سەرواز، سەرنەوەسیاگ، سەرنەبەسیاگ، سەرنەگیراو.
- **المكشف:** چێر، دۆزەرەوە، دەرخەر، ئاشكراكار.
- **مكاشفة:** ئاشكراكردن، دەرخستن.

**كشف السرّ:** ڕاز پەخشكردن، ڕاز ڕانەگرتن.

**كشك (ه):** كۆشك، باڵەخانە.

**كشكول (ه):** كەشكۆڵ.

**كشمش (ه):** كشمیش.

**كظامة:** سەرچاوەی ڕووباران، میزگەی ئافرەتان، ئالقەی كەناری شەهێنی تەرازوو، ئاسنێكە ڕستەی پێوە بەبەستنەوە.

**كظم:** دەركە داخستن، بەستن، بەندكردن، زارگرتن، ڕۆكەوتن، داكەوتن.

**كظم الغيظ:** هێوڵی، پیش خواردنەوە، ڕق نیشتنەوە، قین خواردنەوە.

**كظيم:** بروانە (كاظم).

**كعب (ج) كعاب:** گە، جومگە، جمگەی ئێسكانە لە هەموو شوێنێكی لەشدا.

**كعب (ج) كعوب:** گەی قامیشییە.

- **كعب الرجل:** گوێزنگ، قاپ، چوو، گووزەك، قاپەڕەقە، كاپ، ڕەقێتە، قولاپە، قولەپێ، گۆزنگ، گوێزینگ.
- **كعب الاناء:** پڕی كرد.
- **كعب البندقية:** قۆنداغ، قۆنداخ.
- **كعب الحذاء:** ناڵچە، پانیە، پاژنەی كەوش.
- **كَعَّبَ الشيء:** كردیە سێ جا.
- **كعب اللعب:** جگ، میچ.
- **كعب الكعاب:** جگێن، جگانی، میچێن.
- **ورم الكعب:** قاپك.
- **مكعَّب:** (**اس ٣ قوة ٣**) سێ جا.
- **مكعَّب:** زارسا، زاراسا، شەش پاڵوو، خشتەك، چتێكە خاوەندی شەش ڕووی چوار گۆشەیی بێت.
- **مكعّب الشكل:** زارسا، زاراسا، شەش پاڵوو، خشتەك.
- **مجموع مكعّبين:** سەرجەمی دوو سێ جا.
- **مكعَّب:** مۆرەی تەختە نەردی بەدوو تاسی تەختە نەرد.

**كعبة:** خانووی چوارگۆشە، دیو، ژوور، (**بيت الحرام**) ماڵ خودایە لە (مەككە) موسوڵمانانی هەموو شوێنێكی لە كاتی نوێژی كۆڕنۆشی بۆ دەبەن.

**کعبرة:** کرمۆڵە، کرمووڵە، کرمۆچە.

**کعك:** کولیچە، کولووچە، کاک، کێک.

**کعل (ە):** کاکۆڵ.

**- مُکعَّل:** کاکۆڵدار، گونگل.

**کعوب:** کەنگر، قنگر، ئەنگینار، قۆنک، کنگر، ئەرتی چۆک.

**الکعیت:** بولبول، چوڕڕە بازاڕی.

**کف:** مست، لاگووێل، لامشت.

**- ملء الکف:** مست، مشت.

**کف (ج) کفوف:** ١- بەری دەست، قول، لەپی دەست، لەواشەی دەست، مــەچ، ناودەست، ناو لەپ، بەرە لەپ ٢- چەپاڵە، شەپاڵە، شەپاڵـمە، مست.

**- الضرب بجمع الکف:** بەمستەکۆڵە لێدان.

**- جمع الکف:** مستەکۆڵە.

**الکفّ:** دەست بەردان، واز لێ هێنان، لێگەڕان، وازهاوردن، وازهێنان.

**- الکفّ عن البکاء:** ژیر بوونەوە.

**- الکفّ عن المساعدة:** لێگرتنەوە.

**- مکفوف:** کوێر، نابینا.

**کفاء:** سزادان، پاداش دان.

**کَفاء وکفاءة:** ١- بارێکە چتی تێدا وەک یەکتری لێ بکرێت ٢- وەک یەکـتـری بوون، لێـهـاتوویی، هاوچەشن، وەکـوو یەکتری، هاوتا.

**کفاءة لادارة الامور:** باشارکردن.

**مکافیء:** بەرانبەر، هاوتا، هاوشان.

**- مکافئة:** پاداش، تۆڵەی چاکە.

**کفاح ومکافحة:** دەگژڕاچوون، پێشگرتن، نەهێشتن، نەهێژتن، چەرخــە، بەربەرەکــانی، بەرانبــەری کــردن، بەرەنگاری، تێکۆشین، قەلاچۆکردن.

**- مکافح:** تێکۆشەر، پێشگر، بەربەرەکانی کار.

**- مکافحة:** قڕان تێخستن.

**- مکافحة الامیة:** نەهێشتنی نەخوێندەواری.

**- مکافحة الحشرات:** قەلاچۆکردنی زیندەواران.

**کفارة:** گوناهپۆش، چتێکە لە تۆڵەی گوناه بدرێ و یا چتێکە لە تۆڵەی سوێند لێکەوتن بەخۆراک و بەرگ و ڕۆژوو بدرێت.

**کفاف:** ڕۆزی، چتێکە مرۆی لە پێداویست بێ نیاز بکات.

**- عیشة الکفاف:** کوڵەمەرگێ.

**کفـالة:** دەمـان، دامـان، وەخـۆگـرتن، یاریکاری، یارمـەتیـدان، دەستەبەری، دەمانی، دامانی، دەستبەرەیی، هەڵگرتن، شان دانەبەر.

**کفایة:** ١- ڕەسالی، پێراگەییشتن، بەشکردن، بەسبوون، بایی، باوی، تەســەلی، تێ هەڵێنانەوە، تێ هەڵێنان، تێــرابوون، بەسی، تێچن، گوربژە ٢- لێهاتن، شیان، زرنگی، گروفەن، وریایی، چەلەب، قۆچاخی، گورجی، گوربزە.

**کفة:** تای تەرازوو، لنگەتەرازوو، پەلە، کووهەر.

**- کفة العین:** کاسەی چاو.

**- کفة المیزان:** تا، تایە، تاکە، لنگە تەرازوو، تای تەرازوو.

**کفت (ە):** کفتی، ماندوێتی.

**کفر کفراً الشي:** داپۆشین.

**کُفر (ج) کفران:** ناسوپاسی، بێ باوەڕی، بەدڕایی، گومڕایی.

**الکفر:** بڕوانە (**قریة**).

**کُفرّی:** پشکۆژەی خورما، خونچەی خورما.

**کفل (ە):** کـەفـەڵ، قـالـچـە، سـمت، کـلـۆڵە، کـلـۆک، کـولـۆت، سورین.

**کفل (بکسر الفاء):** دووپشتەکی، هاوپشتی.

**کفن (ج) اکفان:** خەڵات (**کفن**).

**کفن کفناً:** داپۆشین، شاردنەوە، پۆشین، خەڵات لەبەرکردن.

**کفوء (ج) اکفاء:** ١- هاوتا، هاولف، هاواڵ، هاوشان، هاوکار، لێهاتوو، هاوەڵ، هاوچارشێو ٢- توانا، لەبار، سازگار.

**- غیر کفوء:** لەونەش، لێ نەهاتوو، نالەبار.

**کفور:** بڕوانە (کافر).

**الکفی:** پەڵە (باران).

**کفی:** بڕوانە (**کفایة**).

**کفیل:** دەستەبەر، دەمان، دامان، وەخۆگر، تەنخوا، وەخۆگرتوو.

**کُلّ:** هەمــوو، گـشت، تێکڕا، سـەراپا، گـە، هەر، خڕ، هەمی، هەکس، ڕایگەم، هاماو، خشت، تەڤدە، گردی.

**- الکل اکبر من الجزء:** گشت گەورەترە لە پارچەیەک.

**- کُلّ یوم:** گرۆژی، هەموو ڕۆژێکی، هەر ڕۆ، هەر ڕۆژەی.

**- الکل یساوي مـجـمـوع اجـزائه:** گـشت دەکـاتە کۆی هەمـوو پارچەکانی.

**- في کل حین:** هەموو دەم، هەمیشە.

**کُل:** بخۆ، حەم، حەمی کە (لە زاراوەی منداڵاندا).

**کَلّ (ە):** کول، کۆڵ، کەرخ، کوه، هاڵ، نەبڕە، تیغی کول.

**کَلّ:** گرانی، سەنگینی، گێچەڵ، خێزان.

**کُلاً:** هەمووی، تێکڕا، پاکی، یەکشەق.

**کَلاّ:** وانیە، نەخێر، هیچ وانیە، نا، نەو.

**کلاء:** ١- گیا، گژوگیا، گیوا، سەوز، سەوزە، سەوزایی، کڕاش، گزرە ٢- هەردووک، هەرتک، هەردک، هەردوو.

**کُلاّب (ج) کلالیب (ە):** قولاپی چت پێدا هەڵاوەسین.

**کلأبة:** گاز، گیرە.

**كلال:** ماندوویتی، شەكەتی.

- **كَلال السكّين:** كەرخی، كولی چەقۆ.

**كلالة:** ماندوویتی، شەكەتی.

**كلام:** بێژە، واتە، گوتە، ڕاز، وتە، كوتن، واشە، ئاخەوفتن، قسە، گوفتار، وتن، پچەپچ، وتار، پەیڤ، ئاخاوتن، واژە، وتە، واشە.

- **كلام باطل:** گەزاف.
- **الكلام المباشر:** وتەی سەربەخۆ.
- **الكلام التافه:** زرت و پرت، زڵت.
- **الكلام سرّاً:** سرتە، پچەپچ، سرتەسرت.
- **كلام سخيف:** قسەی قۆڕ.
- **كلام طيب:** قسەی خۆش.
- **كلام فارغ:** هەڵیت و پەڵیت، قسەی پڕوپووچ، گەزاف.
- **كلام قاس:** قسەی ڕەق.
- **الكلام المستهجن:** فلتەفلت، زار.
- **زخرف الكلام:** هیچ و پووچی وتار، وتەی پڕوپووچ.
- **قليل الكلام:** كەمدوو، كەمدووێن.
- **كثرة الكلام:** زۆر بلێیی.
- **كثير الكلام:** زۆربلێ، چەنەباز، چەنە درێژ، چیرە درێژ.
- **صياغة الكلام:** دروستكردنی وتار.
- **مضغ الكلام قبل التلفظ به:** گلماندن، قسەجوونەوە.
- **قاسي الكلام:** زمان ڕەق، قسەڕەق.
- **ناقل الكلام:** قسەگێڕەوە، قسەچێن، دووڕوو، دووەگ، پشێوێنە.
- **كلام الله:** فەرمایشی خودا.
- **مكالمة:** یەكتر دواندن، پێكەوە وتوووێژ و ئاخەفتن كردن.

**كلاهم:** هەموویان.

**كلاهما:** هەردووكیان، هەردووك، هەردوو.

**كلتاهما:** هەردووكیان، هەردووك، هەردوو.

**كلب (ج) كلاب:** سەگ، كەماڵ، سە، كسۆك، سەو، كوچك، سپە، صە، تووتە، سەناتوو، سپلۆت.

- **مباطحة الكلاب:** یەكتر گەوزاندنی سەگان، گلماندنەوە.
- **كلب افرنجي:** فینە، مندۆ.
- **كلب الذكر:** گۆڵە سەگ.
- **كلب سلوقي:** تاجی، تاژی.
- **كلب صغير:** كووچك، گوجیلە.
- **كلب الضخم:** كەماڵ، گۆڵ.

**كَلَب:** تینوێتی سەخت، نەخۆشی هاری لە سەگ یا لە ئینساندا.

- **الكلب العاض خفية:** نهێنی گر، سەگی نهێنگر.
- **كلب عقور:** سەگی هار.
- **كلب كبير:** گەمبۆل، گەمۆڵ.
- **كلب الماء:** سەگاو، سەگلاو، سەماسی، سەگاوی، سەیاف، سەی ئاڤێ، سەیێ ئاڤێ.
- **كلب المجدور:** سەگی گڕۆڵ.
- **الكلب ينبح:** سەگ دەوەڕێ.
- **حويك الكلب:** گەزگەزك، گەسگەسك.
- **ولغ الكلاب:** لەپاندن.
- **ذكر الكلاب:** گۆڵ، گەماڵ، گۆردی.
- **شبق الكلاب:** بەبابوونی سەگ.

**كلبة:** دێڵەسەگ، دێڵ، دەڵ.

**كلبتين (ه):** جوورە گازێكە، گاز، لە (كەڵپ)ەوە وەرگیراوە.

**كلثوم:** ڕووپڕ، ڕوخسار پڕ گۆشت، گووپن، گوڕپن.

**كَلَد:** ڕەقەن، ڕەقێن، زەوی زەق و سەخت و چەقێن.

**كلس:** قسڵ، هەك، تەهەك، جاڕوو، ئاهەك، ساڕووج.

**كلس الحيّ:** قسڵی زیندوو.

- **حجر الكلس:** بەردی قسڵی، سەمەبەرد.
- **طين الكلس والرماد:** جاڕوو.
- **ماء الكلس:** قسلاو، شۆرباوڕێژ.
- **الملاط الكلسي:** قوڕوقسڵ.
- **مكلّس:** قسڵدار.

**كلع:** ١- شوقاقی (نەخۆشێكی ولاخانە) ٢- كەمرە، كەمێڵە

**كلف:** وشكەبیرۆ.

**كَلَف:** ١- تانەی سەرچاو ٢- ڕەنگی ڕەش و سووری تێكەڵاوە، ئەو پەڵانەن كە لەسەر ڕووی مرۆیان پەیدا دەبن ٣- پەڵەكانی نێو قەوارەی مانگ و ڕۆژێیە.

**كلفة:** ١- مرخێش مرخێش، هەرك، مركێش، ٢- ڕەنج، ئازار، دەردەسەری، چەرمەسەری ٣- گرانی، ئەرك.

- **كلفة الشيء:** تێچوون.
- **مكلف:** بەسەردابڕاو، بەسەردا سەپاو.
- **متكلف:** كەسێكە خۆی لە چتێكەوە بدا كە تەنها سەرزارەكی بێ، تێوەچوو.
- **جندي مكلف:** قاف.

**كَلَف:** ڕەشانگ، ڕەشایی، پەڵە پارچە خاك، بەردێكە كە لەناو بەفری وشك هەڵگەڕابێ.

**كلفاء:** ڕەشبەڵەك، بەڵەك، ڕەش و سپی، ڕەش و بازگ.

**كلك (ه):** كەڵەك.

**كل كل:** پیاوی قوڵەبنە، كورتە بالا.

**كلل:** ١- كولی، كۆڵی ٢- ماندوێتی، فلی، ئەرخێن.

**كلما:** هەر كاتێكی، هەر دەمێكی، هەر جارێكی، هەرچەندە، هەرچی، هەرچیەكی، هەرچێكوو.

**كلمات فارغة اغرائية:** گالەی دەم.

**كلمة (ج) كلمات:** وشە، وتە، واژە، پرس، واتە، پەیڤ، واچە، بێژە.

- **الكلمة البسيطة:** وشەی سادە.
- **الكلمة المركبة:** وشەی لێكدراو.

**كلمه تكليماً:** بریندار و زامداركردن.

**كلمة تكلماً وكلاماً:** دواندن، ئاخەفتن.

- **متكلّم:** بێژندە، گۆیار، بێژەر، وێژەر، ئاخەفتەر.
- **مكالمة:** یەكتـر دواندن، پێكەوە ئاخـەفتن، ئاخـڤـاندن، پشتەغالی، ئاخافتن، ئاخاوتن، ئاخفتن، ئاخۆتن، ئاخێوتن.

**كلّي:** گشتی، هەمووی.

**كل شيء:** هەرچی، هەرچییەكە.

**كل من:** هەر كەسێكی.

**كل نوع:** گجوور، هەموو جوورێك.

**كل نحو:** گجوور، هەموو جوورێك.

**كليّاً (مجموع الكلي):** سەرجەم، تێكرا، بەتەواوی.

**كليةً:** ١- سـەرانسـەر، سـەراپا، سـەراسـەر، هامـاویان، هەمـوو، گشت، سەرتاسەر ٢- كۆگە، كۆگا.

**كل يوم:** هەررۆ، هەر ڕۆژە.

**كلورايد الرصاص:** لید - كلورايد.

**كلون:** ماندوو و فل بوون.

**كلية (ج) كليات:** زانستگا، هیرگە، هیرگا، زانستگە، كۆلێژ.

- **رسوم الكلية:** مزی زانكۆ.
- **كلية الاحتياط:** زانكۆی دەژیاری.
- **كلية الحربية:** زانستگای شەڕێ، زانكۆی جەنگ.
- **كلية الحقوق:** زانكۆی دادپەروەری، زانكۆی مافپەروەری.
- **كلية الزراعة:** زانكۆی كشتوكاڵ.
- **كلية الصناعة والفنون:** زانكۆی پیشە و هونەران.
- **كلية الصيدلة:** زانكۆی دەرمانگەری، زانكۆی دەرمانیاری.
- **كلية الطبية:** زانكۆی پزشكی.
- **كلية الطب البيطري:** زانكۆی پزشكێتی ماڵاتان.
- **كلية الهندسة:** زانكۆی ئەندازیاری.

**كلية، كلوه:** گـورچیلە، گـورچەویلە، وڵـك، گـورچیلك، گرچوو، گورجوو، گورچیسك، گولچیسك، گونچیلكە.

- **كلية الحيوانات:** زووغوو.
- **مغص كلوي:** دەردی گورچیلە.

**كُليل:** زوویر، خەمناك، سـست، كەسێكە چاوی باش نەبینی، كول، كۆڵ، كەرخ، نەبڕ (تیغ).

**كليم:** ١- ئاخەفتـەر، بێژندە، بێژەر، قسـەكـەر ٢- بریندار ٣- هاودەنگ، هاوگوفتار.

- **كليم الله:** نازناوی موسا پێغەمبەرییە.

**كُم:** تان (ڕاناوی لە مەڕی لكاوە) بۆ كەسی دووەم لە باری گەلدا وەكو: **كتابكم:** پەڕتووكتان.

**كَم:** چەند، چەندە، چقاس؟

**كم (ج) اكمام:** قۆڵ، (ئی كراس و كەوا)، سەرقۆڵ، سەردەست.

- **كم طويل للقميص الكردي:** ئەنگوچك، گوچكە، ئاسـووێنە، ئاوەستێ، نووچك.
- **الكم الكردي:** سۆرانی، وچك، ئەنگوچك، فەقێیانە.
- **الكم المتدلي:** كلكەنگوچك.

**كمأ، كمأة:** دومبەلان، دمەلان.

**الكمّ:** چڵ، چرۆ.

**الكم:** مست، مشت.

**كمأ:** گونەلان.

**كُما:** ڕاناوی لەمـەڕی لكاوە بۆ دووكەسی ئامادە **رأيت رجلاً في داركما:** پیاوێكم لە ماڵی ئێوەدا دیت.

**كَما:** وەكو، هەروەكو، مینا، واكینۆ، وەچكوو، وەر، وەرگە، وها، هالۆ، هەروەكی، هەروەی، هۆسە، هەڤتۆنە.

**كما تشاء:** كێفا تە، كەیفی خۆتە.

**كماد:** تەشەنە، ئاوكوت.

**كمادة:** مادە، مەزركە، نیوەئەك، پەڕۆی گەرم (ضماد).

**كمال:** تەواوی، بەسەردابوون، ڕاپەڕان، گرژۆری، دەست بەربوون، شێوە تەواوی، بێ كەموكووڕی.

**كماليات:** بابەتی دڵخوازی، فەنتازی، زێدە خۆری.

**كمان:** كەمانچە، ڕباب، ڕوباب، مرازێكی سازوئاوازە.

**كمـامة (للحيـوان):** زاربەست، دەمبـەست، قـەمـتـەر، بزمـۆك، دەمكوت، زاربێن، بزمك، دەمـبـەس، دەمكوش، زارەوانە، كلاوە، كەڵەوە.

**كـمُّ (ج) اكـمـام:** سـۆرانی، ئەنگوچك، كلكەنگوچگ، كەلانگوچك، ئاوەستێ، لەوەندی، ئاسوێنە، ئەنگوچك.

**رأس الاكمام:** دیدار، سەدەقۆڵ، لەوەندی.

**كمثرى:** هەرمێ، هەروو، كارچڤ، هەمرۆ، مرۆ، مرۆی، كارچك، هەرۆ، هرمێ، گولاوی.

- **كمثري البري:** هەرمێ كێویلە، كرۆسك.
- **كمثري الجبلي:** شەقۆق، كرۆسك.
- **حب الكمثري:** هەجووجك.

**كمر (ه):** كەمەرەی دیواران.

**كمع:** كەوا.

**كمل كمالاً وتكامل:** تەواوبوون.

**كمل واكملّ:** تەواوكردن، لێبوونەوە.

**كمنجة (ه):** كەمانچە، كەوانە، كەمان، كەمانە.

**عازف علی الکمنجة (ە):** کەمانچەژەن، کەوانەژەن.
**کمود:** دەقاقدان، وتوو لێدان.
**کَمّون:** زیرە.
**کمون اسود:** زیرە.
**کُمون:** پەنهان بوون، نیهان و نەدیو بوون.
**کُمیت (ە) (کمید) (ە):** کویت، کەوێت، ئەسپێکە ڕەنگی لە نێوانی ڕەشی و سووری دابێ.
**کَمیّة(ە):** هێند، هەند، بڕ، هێندە، قاس، بارستایی، چەندی، هەندی، کۆمایەک، تیاب، چەندێتی، قەر، چەندەتی، بڕێک، کە کەم و کەمی و کەمێتی وەرگیراوە.
**- الکمیات الاتجاهیة:** بڕە ئاراستەکان.
**- الکمیات غیر الاتجاهیة:** بڕە نائاراستەکان.
**کمیتان:** دووهێند.
**کمیل:** بچووککراوەی (**کامل**)یيە.
**کمین (ە):** کەمین، کەلێن، بۆسە، پەیجۆر، سپێر، کەلەن، مەلاس، مەکۆ، میل، نۆرینگ.
**- کمین الصیاد (ە):** سیپ، سیپە، شاردنگە، کەمین.
**کُنّا:** بووین.
**- نحن کنا هناك:** ئێمە لەوێ بووین.
**کنارة (ە):** مرازێکی شایلۆغانییە (مۆسیقا).
**کناري (ە):** کەنارە (باڵندە).
**کُناس (ە):** کونی ئاسکی، شوێنی لێ حاوانەوەی ئاسک.
**کنّاس:** گەسک لێدەر، ماڵستە، ماڵەر، کوتکێش، گەسکدەر، پاکەوان، گێسکڤان، جێریفکڤان.
**کنانة:** تیردان، کێشک.
**کنایة:** مەبەس، پلار، تەشەر، توانج، تانووت، هێما، دوورنیازی، لاتاو، گۆشە، مەبەس، مەبەست، درگە، کاسەی ڕەش، هەژاری. وشەیەکە لەجیاتی واتای تایبەتی خۆی بۆ واتایەکی تر بەکاربېرێت وەکو ئەمانەی سەرەوە.
**کَنَب:** قرتاغە، ڕەقێنە، ڕەقێڵە، کەمێڵە.
**کنبد (ە):** گومبەز، گومەز، ئاقد.
**کنة (ج) کنائن:** بووک، وەوی، (کە ژنی کوڕ یا هی براییّ).
**کندج (ە):** کەندوو، نووسرە، کوار، کەنۆڵە، کەنوو.
**کندس:** قەلەباچکە، تشقەڵە، قەلەبازەڵە، کلک مەقلی.
**کنز (ج) کنوز:** گەنج، گەنجینە، گەنجینەی زێڕوزێوی. ماڵ و پوولێکە ڕۆژی ڕەش هەڵگیرێ.
**کنز کنزاً:** کۆکردنەوە، ئەنبارکردن، پاشەکەوت کردن.
**- کنز اللغة:** فەرهەنگی وشان.
**کنّس کنساً:** ١- ماڵین، ماشتن، گەسک لێدان، داماڵین، مالیان، مالای، ڕادان، ڕاماڵدان، ڕاماڵین، ماڵینەوە ٢- ڕاونان، تەراندن، داماڵین.

**مکنسة:** گەسک، گێسک، سڤنک، سیزگە، ڕیش، کوینسک، گزە، گەزک، گزک، گزی، جریفک، ڕێژ، ڕێس، کس، کویسک، مل کسک، ملکس، کسی، مەڵکەس، گسی، گسک.
**کنف (ج) اکناف:** پەنا، داڵدە، قەف، هەمەت، هەنووان، شەقۆق، دەرەتان، ڕزگارگە، ئەوا، کولێن، بابوێر، بۆرگە، نوان، قوژبن، پەناگە، ئەولەگا، بابوهێر، لا، کەنار، سێبەر (باڵی باڵندە).
**کن فیکون:** چەقو تەف، چەقاوتەف، گرویف، کۆلێژە.
**کُنود:** بەگژ ڕاستیدا چوون، ناسوپاسی.
**کَنود:** ناسوپاس.
**کنه:** ١- گەوهەر و ئاوارەی چتی ٢- بنەبان، بنەڕەت، ڕەچەڵەکی چت.
**کنیة:** کەسناو، ناسناو، سەرناوێکە بۆ ڕێزگرتن لە سەرەتایەکەیدا بە (**اب**) یا بە (**ام**) و یا (**بنت**) و یا (**ابن**) دەست پێدەکات وەکو: ابو المعالي، أم کلثوم.
**کنیسة (ج) کنائس:** دێر، پەرستگا.
**- کنیسة النصاري:** کلیسا، دێر.
**- کنیسة الیهود:** کەنیشتە.
**الکنیف:** کۆتان، هەسارگەلە.
**کنین:** گەنەگەنە (دەرمان).
**- محلول کنین:** گەنەگەناو.
**کهانة:** ئەستێرەناسی، لە نهێنی دوان.
**کهرباء:** کارەبا، کارفێن، ئەلەکتریک، زەردوویی، زەردەیی.
**- آلات الکهربائیة:** مرازەکانی کارەبایی.
**- تیار الکهرباء:** ڕەوتی کارەبا.
**- طاقة الکهربائیة:** وزەی کارەبایی.
**- قوة کهربائیة:** هێزی کارەبایی، تەوژمی کارەبایی.
**- الکهر ضوئیة:** کەهرووناکی.
**- الکهرباء الاسود:** کارەبا، شەوە، شەڤە (موورروو).
**- الکهرمائیة:** کەهراو.
**- بطاریة کهربائیة:** پاتری.
**کهربائي:** کارەبائی.
**- جهد کهربائي:** پەستانی کارەبایی.
**- القوة الدافعة الکهربائیة:** پاڵهێزی کارەبا.
**کهف (ج) کهوف (ە):** ئەشکەوت، غار، خار، کۆڤ، کوومزەخ، ڕابەند، غولۆلیف، زاخوور، مەرە، کاو، کەوڕ، ئەشکەفت، شکەفت، مەڕ، کەورک، زڤنگ، زایەند، کەوورک، هاڵ، موغارە لە کێو، کێف وەرگیراوە.

- **مختار القرية:** کوێخا، کۆخا، کێخوا.
- **مختار المحلة:** کوێخا، کەلانتەر.

**مختال:** قوودە، خۆپەسند، بەهەوا.

**مختبر:** تاقیخانە، تاقیگە، زموونگە (لابۆر).

**مخترع:** لە **(اختراع)**دا بیدۆزەوە.

**مختزل:** لێکەرەوە.

**مختزَل:** لێکراوەوە.

**مختص:** تایبەتی، هیین، لەمەڕ.

**مختصَر:** لە **(اختصار)**دا بیدۆزەوە.

**مختصِر:** کۆتایی پێدەر، کۆتایی کار، کورتەبڕ.

**مختفٍ:** بزر، گوم، ون، شاردراوەوە.

**مختل:** شپرزە، ئاڵۆز، شپرێو، شێواو.

**مختل التوازن:** لاسەنگ، سەنگەلا.

**مختلس:** ڕفێن، خۆ نابووتکار.

**مختلق:** دەستکرد، دەستهەلبەست، ساختە، داڕێژراو.

**مختلط:** تێکەلاو، ڕژانە پاڵ یەکتری.

**مختلف:** لە **(اختلاف)**دا بیدۆزەوە.

**مختلف اللون:** هەڕەمە، هەمەڕەنگە.

**مختنق:** خنکاو، خەفەکراو.

**مختوم:** مۆرکراو، کۆتایی هاتوو، دەرمۆر، سەرمۆر.

**مخدر:** سڕکار، بێ هەستکار، هۆشبەر.

**مخدرة (ج) مخدرات:** ئافرەتی پەردەنشین، دەرمانی بێهۆشی.

**مخدة:** لە **(خدّ و خدود)**دا بیدۆزەوە.

**مَخدع (ج) مخادع:** گەنجینە، ژووری گچکەیە لەناو ژووری گەورەدا.

**مَخدع العروس:** پەردەی بووکێ.

**مُخدِع:** تەفرەدەر، کەڵەکباز، فێڵباز، لە خشتەبەر، دەست شکێن هەڵخەڵەتێن، ساختەچی.

**مخدوش:** داڕووشاو، ڕنراو، ڕنیاگ.

**مخدوع:** دەستخەڕۆ، هەڵخەڵەتاو، فریودراو.

**مخدوم:** گەورە، بەگ، ئاغا، ڕاژەکراو.

**مخذفة:** لە **(خذف)**دا بیدۆزەوە.

**مَخذول:** واز لێ هێنراو، بێ بەهرە.

**مخراق:** پیاوی خۆش ئەندام و دڵفرە.

**مخرِّب:** وێرانکار، کاولکار، خاپوورکار، ڕووخێنەر، گێرە، شێوێن.

**مخرَّش:** ڕندراو.

**مخربَط:** شێواو.

**مَخرج (ج) مخارج:** دەرگە، دەرک، دەراو، ژێرە، کۆم، دەرەتان، شوێن چوونەدەر.

**مخرج:** کۆم، داودەرچە.

**مُخرِج:** دەرخەر، دەرهێنەر.

**مخرز:** درێشە، درەوشە، قولاپی چنینێ.

**مَخرَم:** کونکراو، هەڵتڵیشاو، هەڵزڕاو.

**مخروب:** کاول، وێران، داغان.

**مخروط (ج) مخاريط:** ١- لەخەرتدراو، خرت، قوتەک، قووچەک ٢- گومەرزە، قووچەکە، قووچەک، گرد، کومبەز، چتێکە وەشێوەی ڕەحەتی دەچێ.

**مخروط دائري:** قووچەکێکی بازنەیی.

**مخروطي:** شێپووری، گومبەزی.

- **دور مخروطي:** ئەرلنمایەر (کیمیا).

**مَخزم:** ڕچە، باریکەڕێ.

**مخزن (حكومي):** عەنبار.

**مخزن (ج) مخازن:** کۆگە، ئەنبار، ژووری کەلوپەل و دانەوێڵەیە.

- **مخزن الارزاق:** ئەنباری ئازووخە.
- **مخزن الاحمال:** بارخانە.
- **مخزن الاسلحة:** بڕوانە **(مذخر الاسلحة).**
- **مخزن التبن:** کادان، کادێن.
- **مخزن الجمد:** سەهۆڵخانە.
- **مخزن الحنطة:** ئەنباری دەخڵی، تەرەک.
- **مخزن الخبز:** ناندێن، مزاخە.
- **مخزن الفواكه في الشتاء:** لیان.
- **مخزن ماء الطاحونة المائية:** قۆتەرە.

**مخزوم:** خەزێمەدار، کەسێکە کەپۆی کون کرابێ و خەزێمی تێکرابێ.

**مخشلات:** خشل، چەک، ڕەشمە.

**مُخَصَّصات:** تەرخانەکان، دەرماڵە.

**مخصوص:** خۆماڵی، تایبەتی، ڕادایی، تەلەخان، بەلاوە، پوختە، دانستە، دەستندە.

**مخصوصاً:** بەتایبەتی، بەڕادایی، ئەخازە، تەنانەت.

**مخض مخضاً اللبن:** مەشکەژاندن، ژەندن، ژەنین، ژەنیای، ژەنیای، کەیاندن، شڵەقاندن.

**المخصي:** خەساو، خەسێنراو.

**مخضرات:** بڕوانە (خضر و خضروات).

**المخض من الدواب:** ئێختە.

**مُخضِع:** سەرپێ نزمکار، سەرپێ دادێنەر.

**مخضوض:** ژاندراو.

**المخط:** چڵم ئەستڕین، فم کردن، لووشاندن، لووت خاوێنکردنەوە.

**مخطَّط:** لە **(تخطيط)**دا بیدۆزەوە.

**مُخطِر:** بڤ، بەگێژەنە، تەلەزگەدار، هێڵکار، خەتخەت، خەتخەتی، داخداخ، دێردێر.

**مخطّط:** هێڵ هێڵ، دێغ دێغ، جزغ جزغ.

**مخططات:** نووسەوەری، نڤیساکە.

**مخطوبة:** خوازبێنی کراو، ناوبراو، بووک، خوازتراو، نیشانەکراو، دەزگیران.

**مخطوط:** دێغدێغ، دێخدێخ، جزغ جزغ، ڕێڕێ، نووسراو، دەستنووس، دەستنڤیس.

**المخطوطة:** نڤیسار.

**مخطوف:** ڕفێنراو، هەڵگیراو.

**مخطيء:** لە (**اخطاء**) بیدۆزەوە.

**مخفر:** پاسگە، پاسگا.

**- مخفر الحدود:** پاسگای سنوور.

**مخفَّف:** تەنک، ڕوون.

**مخفِّف:** تەنک کار، ڕوونکەرەوە.

**مخفى:** وەشارگە، پەنا، بەسیو، شاردنگە، شارگە.

**مخفي:** پەنهان، شارراوە، پەنام، ون، سەربەست، شاریاگەوە، پۆشراو، نهێنی.

**مُخلّ (ج) امخال:** مەلغە، لەهار، ئاسنێکی درێژە بەردی پێ بڵند دەکرێ وەیا هەڵدەگیرێ.

**مخل:** مێخەکە، بزماری پێ.

**مُخلّ:** زیاندەر، زیانگەیێن، زیانەخەرۆ، کەموکوڕی گەیێن.

**مخلاة (ج) مخال:** توورەکەی ئالیکی ولاخانە، جۆڕک، توورک، جووهوور، جهیر، جوولۆک، جهار، جهوەر، توور، توورەکە، توورین.

**مخلب (ج) مخالب:** چەنگ، چەنگاڵ، چڕنووک، چنگورک، ڕنۆک، ڕکە، چنک، پەنجە، چەپۆک، چەنگوڕک.

**مُخلخل:** شوێنی خڕخاڵ (لەپێ دا).

**مخلَّد:** پایندە، ڕاوەستاو، هەمیشە، نەمر.

**مَخلَص:** ڕزگاریکار.

**مُخلص:** خۆشەویست، دڵڕاست، دڵپاک، دڵڤەکری، کارڕاست، یەکدڵ، یەکڕوو، دۆست.

**مخلص صميم:** دڵسۆز، جگەرگۆشە.

**مخلَّع:** مرۆی سست و بێ هێز و یا هێندێک لە ئەندامەکانی بێ هەست بووبێ، خەلاتکراو.

**مخلفة (ج) مخلفات:** پاشماک، پاشماوە، میرات.

**مخلفات:** ژێمایی، پاشماوە، شرەوبرە.

**مخلوط:** تێکەلاو، ئاوێتە، ئامێتە، پالۆش، تەڤل، گێرەڤێزە، نەهەڤگرتی.

**مخلوع:** خەلاتکراو، ڕووتکراو، لە جێ چوو، لەگەچوو، هەڵکەنراو.

**مخلوق (ج) مخلوقات:** ئافەریدە، مرۆڤ، مەردوم، مەرێتە، میرهۆڤ.

**مخلّى:** بەتاڵکراو، شوێنی چۆل، بۆرانی باینجان.

**مخمخة (ە):** مخەمخ.

**مخمَّر:** ترشاو، هەلاتوو.

**مخمّس:** پێنج خشتەکی.

**مخمّس:** پێنج گۆشە (لە ئەندازیاری دا).

**مَخمصة:** برسێتێکی زۆر، ڕەنج و گرفتاری.

**مُخمَل (ە):** مەخمەر، فرەز.

**مخمِّن:** خەملێنەر، قرسێن، خەملچی، تەخمینکار، واگر، وادانەر، خەملێن، وەگر، قرسێنەر.

**مخمَّن:** هەڵسەنگێنراو.

**مخمور:** مەست، سەرخۆش.

**مخنَّث:** ژنانە، ژنانیلە، نێرەمووک، نەمێر، نەژن نەمێرد، ڕەنگ مەبیک.

**مخنِق:** خنکێنەر، خەفەکار.

**مخنوق:** خنکاو، خنکێنراو، تاساو، خنکیای.

**مخوِّف:** ترسێن، زەهلەبەر، زراوبەر.

**مخيخ:** مێشکۆڵە.

**مخيَّر:** سەرپشک، تەرخان، ناڤبر.

**مخيض:** ژەنراو، ژاندراو، شڵەقاو، دۆ، دەو، کەواو، گوراو، ماستاو، شیناو، ئاودۆ، ژنیاگ.

**- مخيض فاهي جداً:** شیناو، گۆراو.

**- مخيض حامض (قارص):** دۆی ترش.

**- رواسب المخيض المغلي:** شیرێژ، ژاژی.

**مخيضة:** ئاودار، دۆژەن، دۆژەنگ.

**مخيط:** فم کردن، لووت خاوێنکردنەوە.

**مخيط:** سووژن، گونۆژ، گنۆژ، گۆچەوەنی، جەوالدوور.

**مخيطة:** دەرزیدان.

**مَخيلة:** هێزی ڕامان و وردبوونەوە لە مێشکدا.

**مُخيف:** بەسام، بەترس، بەربچاڤ، زەهلەبەر، سامناک، ترسناک، ترکزە، تەڵەکە، تەگەرە، ترسێن، سامدار، بەترس.

**مخيَّم (ج) مخيمات:** خێوەتگە، چادرگا، هۆبە.

**- مُخيم حديث:** نووهەوار.

**- مخيم الاغاثة:** خێوەتگای فریاکەوتن.

**- المخيمات الكشفية:** خێوەتگایانی دیدەوانی، هۆبەکانی پێشڕەوان.

**مخيوط:** دووراو، درواو.

**مَد:** داو، ڕستە، پرد، ڕۆژی شەشەمینە لە هەموو مانگێکی خورشیدی.

**مُد (ج) امداد ومداد ومدة:** كێشانەیێکە پڕ بەدوو مستان بەرانبەری (١٨) لیترانە.

**المَدّ:** لێشاو، خێزاو، کێشان، ڕاتەنگاوتن.

**- مدّ البحر:** بەرزبوونەوە و کشانەوەی ئاو.

**- مدّ الشيء مدّاً:** ڕاخستن، داخستن.

**- مدّ الطنَب:** ڕایەڵکردنی تەناف، ڕاچاندن، ڕاکێشان.

**- مدّ يد العون:** دەسگرۆیی، دەستکرۆیی، یاریکاری.

**مدّ و جزر:** بڕوانە (جزر ومدّ)

**مدائن:** شارێک بووە لە نزیک بەغدای ئەمڕۆکەدا کە سەراپەردە و ئەیوانی کیسرای لێ بووە، ناوی پێشووی (تیسفۆن) بووە، میدییان بەناوی خۆیان ناوناوە یەکەمین پادشای بنچینەی کیسرایان ئەردەشێری بابەکانە و ئیی هەرە دواییان یەزدی کوردە و لە ڕەچەڵەکدا کوردێکی فەیلی بوون.

**مدّاح:** هەڵنەر، هەڵنێر، هەڵگۆت، هەڵدەر، هەڵگۆ

**مداخلة:** خۆتێهەڵقوتاندن، دەست لە کاریێ یا لە کاری کەسێکییەوە دان

**مِداد:** بڕوانە (حِبر)

**مَداد:** ١- تەرسەقول، قەرسەقول ٢- مەرەکەب، پێنووسی مزی

**مَدار:** ١- خولگە، سووڕگە ٢- تەوەرەی ئاش، ٣- مۆرە، تفە، دیواری قوڕین

**- مَدار الجدي:** خولگەی کارژۆڵە

**- مَدار السرطان:** خولگەی قرژاڵ

**- مَدار الطاحونة:** تەوەر و بستەی ئاشی، مۆرە

**مداراة:** ڕابواردن، پێکەوە هەڵکردن، لەگەڵ یەکتری ڕابواردن، لەگەڵ کەسێکی نەرمی کردن، بەسەربردن

**مداس:** سۆل، پێلاو، کەوش، کاڵە و پێتاو

**مداعب:** دەستباز، دەستواز

**مداعبة:** دەستبازی، دەستوازی

**مدافع:** بەربەرەکانی کار، پێشگێرەوە، لاکۆشکە، لاگیر، لەسەر، پارێزگار، پارێزەر، بەرەوان، بەرەڤان، هەڤالدار.

**مدافعة:** بەربەرەکانی کردن، پێشگیری، دەستکردنەوە، هەڤالداری، دەستەوەکەری

**مُداقّة:** لە فەرمانێکی وردبینی کردن

**مدالات:** بڕوانە (تسلية)

**مدالسة:** تەفرەدان، زۆر لێکردن

**مدام:** هەمیشە

**مُدام:** شیلە، شیلاو، مەنی، شیرە، بارانەی بێ پسانەوە

**مدامة:** شیلە، شیلاو، مەنی، شیرە، بارانەی بێ پسانەوە

**مداهمة:** بەسەردادان

**مداهن:** سەرزمانخۆش، دووزمان، سابوون لەبەری پێدان، مرایی

**مداهنة:** کلکەسووتە، ڕۆن لەبەری پێدان، زمانلووس، فێڵ کردن، تەفرەدان، شوونی وەبن هەنگڵ دان

**مداواة:** دەرمان و تیمارکردن، چارەکردن، چارەسازی، چارە، دەوەری

**مداوم:** کەسێکە لە ئەنجامدانی کارێکی پشوودرێژ و خۆڕاگریی، گیر.

**مداومة:** پشوودرێژی و خۆڕاگرتنە لە ئەنجامدانی کاروبارەکاندا، ڕاگراوی، پایەداری، درێژەپێدان، گیری.

**مدبّب:** نووک تیژ.

**مدبّر:** ڕاوێژکار، ڕاوێژیار، بەمشوور، چارەساز، ژیرلۆ، ڕاوێژگەر، مامۆتک، تەگبیرکار.

**- مدبّر الاطفال:** لەلەی منداڵان.

**- مدبّر الامور:** کارساز، خودا.

**مدبغة (ج) مدابغ:** بۆنگخانە، دەباغخانە.

**مدبوغ:** دەباغکراو، بۆنگکراو، خۆشکراو.

**- غير مدبوغ:** خاو، خام، چەرمی خاو و پیستی بۆنگ نەکراو.

**- الجلد المدبوغ:** قایش.

**مدّة:** زووخاو، کێم.

**مَدّة:** بەم ڕیکە (آ)ی دەڵێن، کەشە، کشاو.

**مدة (ج) مدد:** ١- دەم، بێن، تاو، چەنی، قاس، کات، چاخ، گاوەگاف ٢- ماوە، ماودا.

**- مدة اخرى:** دەمێکی کە، تاوێکی دی، گاڤا دی.

**- مدة قصيرة:** بێ جێ، دەمێکی.

**- مدة قليلة:** تاوێ، ماوەییەکی کەم، دانگ.

**- مدة وجيزة:** کەمێکی تر.

**- بعد مدة اخرى:** لەپاش دەمێکی دیکە، تاوێکی دی، گاڤا دی

**مُدّثّر:** کەسێکە خۆی لە پەردە و یا کراسێکەوە پێچابێ.

**مدجامة:** مێزەر، پێچ.

**مدح:** هەڵکوتن، پێهەڵکوتن، هەڵگۆت، سوپاس، ستایش، پەسناندن، پەسن‌کردن، چاکەکوتن، هەڵنان، پاسین، هلنگفین، پەسن، ئەڤراختن، وەسپ، وەسپکردن، هەرگۆت، هەڵدان.

**مدحاة:** ڕەوڕەوە.

**مدحض:** هەڵدێرراو.

**مدحُر:** پاشەکەوت.

**مدخل (ج) مداخل:** دەرکە و دەروازە، ئاستانە، دەرگا.

**مُدَخِّن:** جغارەکێش، دووکەڵکار.

**مدخنة:** کوورە، سۆبە، بوخاری، دووکەڵکێش، دووکەڵگیر.

**مدخنة التّبغ:** سەرەقەنە، سەبیلە.

**مدخول:** چووە ژووری، لە ژووری کراو.

**مدد:** يارمەتی، ياريكاری، هاوپشتی، ئاری، هامەياری، هاری، ئاريكاری، هاوپشتی، فريا، كۆمەگی، هانا، ياری، ياريدە.
**مُدد:** دەرمان و يا ميوە و تەڕەكاری ميزكردنی.
١- گلـەمەت، سندەگل، گلۆسن، سندە، گومتەل، گومتيل، كوندە، كەستەك، كەرسەك، پەل، سمتەگل، كێستەك، كلۆس، گلۆتە، مۆرە.
**مَدَر:** قوڕ، هەرك، هەڕگاو.
- **مَدَر المكان:** سواخی كرد.
**مدر مدراً:** زك لێ هاتن، هەلامسان.
**مَدْراء:** ژنی زگ نەستوور.
**مدرِّب:** خارێن، ڕاهێنەر، مەشق، پێكار.
**مدرَّب:** تاقی كراوەوە، ڕاهاتوو.
**المدرة:** بروانە (**الودقة**).
**مدرَج:** پلەپلە، پايەپايە.
**مدرَج (ج) مدارج:** ڕاگە، پلە، پايە.
**مـدرس:** وانەوێژ، ئامـۆژگـار، وانەبێـژ، وانەدادەر، وژەبێـژ، ئامۆژيار، مامۆستا، مامۆسا، وژەر، وانەواج.
**مدرسة (ج) مدارس:** قوتابخانە، فێرگە، خوێندنگا.
- **المدرسة الابتدائية:** قوتابخانەی سەرەتايی.
- **مدرسة ادبية:** قوتابخانەی وێژەيی.
- **مدرسة الاعدادية:** قوتابخانەی ئامادەيی.
- **مدرسة الثانوية:** قوتابخانەی دوا ناوەندی.
- **مدرسة الحقوق:** قوتابخانەی مافپەروەری.
- **مدرسة الطبية:** قوتابخانەی پزشكی.
- **مدرسة عالية:** هيرگا، زانكۆ.
- **مدرسة الفنون البيتية:** فێرگەی كابانی.
- **مدرسة الفنون الجميلة:** قوتابخانەی هونەرە جوانەكان.
- **مدرسة المتوسطة:** قوتابخانەی ناوەندی.
- **مدرسة المهنية:** قوتابخانەی پيشەيی.
**مدرعة:** كەشتی زرێداری شەڕی، زرێ پۆش.
**مُدرِك:** هۆشيـار، وشيـار، ڕێ پێبەر، پرمێشك، تێگەيشتوو، قۆتە، شيت.
**مَدرَك (ج) مدارك:** بەڵگە، پاژە.
**مدروس:** كۆنە، كەونينە، شێت.
**مـدس مدسـاً:** دامـاڵين، كـەلەزووسك، خـەشك كـردن، دەست پێداماڵين.
**مدعو:** بانگهێشتراو، وەستە، وەسە، ويستـراو، باسكراو، ناوبراو.
**مدعوك:** هەڵشەپاو لە ئاوێ.
**مدعي:** داواكار، دادخواز، كومكافر، گليڤان، كەنۆ، بەگلەيی، داخواز پێشمار، گازاندەكار، داوان، گازندەر، خوازگار.
**مدعى:** داواكار، ويستراو، داديار.
**مدعى عليه:** گلەيی لە دەست كراو، دادوگازاندە لێ كراو، داد لە دەست كراو.
**مدعي العام:** دادوانی گشتی، داديارى گشتی.
**مدعي العموم:** داواكاری گشتی، دادوانی گشتی.
**مدَّغم:** تێهەڵكشانی پيتێكی لە پيتێكی تر.
**مدفئة:** كوورە، سۆبە، سۆپە، زۆپا.
**مَدفَع:** گۆم، گۆل، دەراو.
**مِدفَع (ج) مدافع:** تۆپ (چەك).
- **مِدفَع الرشاش:** تۆپی ڕشێن، شێست تير.
**مدفعي:** تۆپچی.
- **حامل المدفع:** تۆپچی.
- **صانع المدفع:** تۆپساز.
**مدفن (ج) مدافن:** گۆڕ، شاردنگە، ناشتگە، ناشتنگە.
**مدفوع:** دراو، پێدراو، دوورخراوەوە، پاڵ پێوەنراو.
**مدفون:** شارراوەوە، شاردراوەوە، بەخاك نەسپێرراو.
- **المدفون تحت الاحجار:** سەنگەساركراو.
**مدق، مـدقة:** چەكوچ، نقـوورە، زەنپ، پەمـاخ، چۆمـاخ، زۆنب، زۆنت، كوتك، مشتەی زيندرووان، كوتەك، ماوەر.
- **مدق الهاون:** دەسكاونك.
**مدقَّة:** مێ ئەندام.
**مدقَّة:** كوتك.
- **مدقَّة خشبية:** كۆتكی دار، مەيكوت.
**مُدقِّق:** سەرنجـدەر، لێكدەرەوە، وردبين، وردكەرەوە، هووندەنێر، بەراوەردكار.
**مدقوق:** كوتراو، وردكراو، لێدراو، ڕەقياگ.
**مُدل:** ڕێ نيشاندەر.
**مدلّس:** ساختەكار، كەسێكە كەموكوڕی خۆی ياكالا و كەلوپەلی خۆی لە خەڵكی بشارێتەوە.
**مُدَلل:** نازدار، بەڵگە بۆ هێنراوەوە.
**مدلهم:** تاريك، شەوەزەنگ.
**مدلول:** واتا، ناوەرۆكی مەبەس، ڕێ نيشاندراو.
**مدمِّر:** وێرانكار، ڕمێن، كاولكار، ڕووخێنەر.
**مدمِّرة:** وێرانكار، ڕمێن، كاولكار، ڕووخێنەر.
**المدمكي:** نانی تيرە.
**مدمن:** بەسەر كار و يا پيشە و ڕەفتارێكييەوە چڕ بووەوە، لەسەر ڕۆ، هەميشە خەريكی.
- **مدمن المسكرات:** ئارەقخۆر.
**مدموغ:** گێل، گـەوج، كـەسێكە سـەری وا شكابێ كـە زيان بە مێشكی گەيشتبێ ويا كارەساتێك بەمێشكی وی گەيشتبێ.

**مدني:** ١- شارستانی، شاری، باژێری، ماژاری، ژیاری، ٢- خەڵکی شاری مەدینە.
**مدنية:** شارستانێتی، شارسانیەتی، شارستانەتی، جهزایی .
**مَدَني:** (مقابل عسكري) بەیارەوان.
**مُدهش:** واق ورکار، سەرسامکار، سامدار، بەسام، سەرسامی هێنەر، زەهلەبەر، سوزرەت، سوسرەت، ناوێزە، ئاشنا، زۆرسەیر.
**مدهن:** چەورکار.
**مدهنة:** رۆندان، یەخدان، کەلەشاخ.
**مدهوش:** سەرسام، سەرگەردان، واق ورماو، سەرسوورماو، مەندەهۆش.
**مدهون:** چەورکراو، چەوروچلێک.
**مدوّد:** کرمن، کرمێ، رزێو، کرماوی، گرد، گروفر.
**مدور:** خڕ، گر، خشت، هنارک، گرک، گردە، گەڕ، گروفەر، بەگەڕ، گردیلە، گەودار، پلیف، چەرخی، گونینە، خڕپ، خڕخشت، خڕۆڵە، خریلە، خریلانە، شیوەڵە، گرموچە، گرمۆڵە، گرمولە.
**مدوَّر (کمصطلح مالي):** گەڕاوە.
**مدوَّن:** کۆکراوەوە، تۆمارکراو.
**مدوِّن:** رێکخەر، کۆکەرەوە.
**مدوِّن القانوني:** تۆمارگەری یاسا.
**مدى (ج) مدية:** ١- مەبەست، دڵخواز، گاڤێن، پایان، بنەبان، شوێن، هەرەدوایی، درێژایی، ئەوپەڕی ٢- برکردن، ماوە (لە فیزیا).
**- مدى تأثيرها:** ئەندازە و پلەی کاریگەری.
**- مدى الحرارية في الجغرافية:** ماوەی گەرمی، پلەی گەرمایی.
**- مدى الليل:** شەوگار، بەدرێژایی شەوی.
**- مدى المقدرة:** ئەوپەڕی توانا و برکردن.
**مدية:** سێکارد.
**مديح، مديحة (ج) مدائح:** پێ هەڵکوتن، هەڵنان، ستایش.
**مديد:** درێژ، کشاو، کێشراو، ناوی یەکێکیشە لە دەریایانی هەڵبەست لەسەر کێشی: **فاعلاتن فاعلن فاعلاتن فاعلن.**
**مدير (ج) مدراء:** کارگێر، هەڵسووڕێنەر، بەڕێوەبەر، رەنێوهێنەر.
**- مدير الادارة:** بەڕێوەبەری .
**- مدير الري:** میراو، سەرکاری ئاویاری.
**- مدير التسوية العامة:** بەڕێوەبەری کۆک کردنی گشتی.
**- مدير الشرطة:** کەلانتەر، داروغە.
**- مدير صحة الطلاب:** بەڕێوەبەری تەندروستی قوتابیان.
**- مدير المدرسة:** بەڕێوەبەری قوتابخانە.
**- مدير الناحية:** پەرگەنەدار، مەڵبەندار.
**مديرية:** بەڕێوەبەرایەتی، هەڵسووڕێنگە، بگێری، کارگێری، کەوێنگە، سەرپەرشتی.
**- مديرية الاصلاح الزراعي:** بەڕێوەبەرایەتی ئاماری کشتوکاڵ.
**- مديرية الادارة:** کارگێری کارداری، بەڕێوەبەرایەتی کەوێنگە.
**- مديرية البناء:** بەڕێوەبەرێتی ساختمان.
**- مديرية التجارة والاحصاء:** بەڕێوەبەرایەتی بازرگانی و ئامادەیی.
**- مديرية الدعاية العامة:** بەڕێوەبەرایەتی چاو و ڕاوی گشتی.
**- مديرية الريّ العامة:** بەڕێوەبەرایەتی ئاودێری گشتی.
**- مديرية الزراعة العامة:** بەڕێوەبەرێتی کشتوکاڵی گشتی.
**- مديرية الشرطة:** کەلانتەری، داروغە.
**- مديرية الطيران المدني:** بەڕێوەبەرێتی فڕینی شارستانێتی.
**- مديرية المباحث الصناعية:** بەڕێوەبەرایەتی باسی پیشەسازی.
**- مديرية المحاسبات العامة:** بەڕێوەبەرێتی ژمارەگەرێتی گشتی.
**- مديرية المدارس:** بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانان.
**- مديرية الميرة والتموين:** بەڕێوەبەرایەتی ئازووقە و تفاق.
**- مديرية الواردات العامة:** بەڕێوەبەرایەتی دەرامەتی گشتی.
**مدينة (ج) مدائن ومدن:** شار، باژێر.
**مديون:** قەرزدار، قەردار، لەسەر، مشکڵۆزمە.
**مديونية:** قەرزداری، قەرداری، مشکڵۆژمەیی.
**مُذ:** بڕوانە (منذ).
**مذاب:** تواوە، تاواوەوە.
**مذاق:** چێژگە، چەشکە.
**مذاكرة:** لەگەڵ کەسێکی وتووێژکردن و لێدوان.
**مذبحة (ج) مذابح:** کوژتارگە، سەلاقخانە.
**مذبذب:** لە (ذبذب)دا بیدۆزەوە.
**مذبوح:** سەربڕاو، سەر ژێکراو.
**مذبول:** سیس، چرچ، گەچراو.
**مذخر (ج) مذاخر:** گەنجینە، ئەنبار.
**- مذخر الادوية:** ئەنباری دەرمانان.
**- مذخر الاسلحة:** جەبەخانە، چەکخانە، قۆرخانە، سکدار.
**مذراة:** بژارچن، بژاربڕ، پیشک.
**مذروع:** پێوراو.
**مُذعن:** درکێنەر، مل کەچکار.
**مذكَر:** مەرد، نێر، نێرینە، نێرزا، نێرە
**مذكرات:** بیرەوەریان، یادداشتان.
**مذكِّرة:** بیرەوەری.
**مذكَّرة:** یادداشت، یادگارنامە، بیرەوەخەر.
**مذكور:** ناوبراو، نێوبراو، باسکراو.

**مُذل:** کەنەفتکار، پەرێشانکار.
**مذلّة:** کەساسی، پەرێشانی.
**مذمّة:** بەدگۆیی، بەسەر ڕۆیشتن.
**مذموم:** لە پاشملەی دواو، پاشگۆتن کراو.
**مُذنّب:** کلکدار.
**مذنب:** لە (ذنب)دا بیدۆزەوە.
**مدهامّتان:** دوو باخی سەوز و تێرئاوە کە لەبەر سەوزی بەرەش بنوێنێ.
**مـذهّب:** ئاوەزێرکـراو، زێرن، زێرکـێش، زێرکـفت، زاڤ، سەردلکری، ڕووکێشی زێری.
**مذهب (ج) مذاهب:** ئایین، زاڤ، ڕێباز، ڕەووشت، سەرەڕێگە، بەرەگە.
- **مذهب الادبی:** ڕارەوی وێژەیی.
- **مذهب الاقطاعی:** ڕێبازی دەرەبەگی.
- **المذاهب الدینیّة:** باوەڕیانی ئایینی، ڕارەویانی ئایینی.
- **المذاهب السیاسیة:** ڕێبازانی ڕامیاری.
**مذیاع:** ئامرازی بلاوکردنەوە، پژێن، پەخشەر، بلندبێژ، گێرەوە، مرازی پەخشکار.
**مذیب:** توێنەرەوە، ئاوێنەوە.
**مذیع:** پەخشکار، پەخش و بلاوکەرەوە، پەخشەر.
**مُذیّل:** داوێندار، داوێن درێژ.
**مُرّ (ج) امراء:** ١- تاڵ، تەهل، ژاراو، ژەهر، ژەهراو ٢- جیـوە یا شیـرەیێکیشە کە لە داران پەیدا دەبێ و ڕەق دەبێ و بۆنی خۆشە و تامیشی تاڵە.
**مرّ مرّاً ومرورا:** بڕوانە (مرور).
**مرء:** مرۆ، پیاو، مێر، مەردوم، مەریتە، پیاگ، مەرتیە، مەرد، مرۆڤ، مێر، مەرف.
**مراء:** چاپلووسی، زمانلووسی، مرایی.
**مرائی:** دووڕوو، شەشخاپێن، دووزوان.
**مراب، مرابی:** سووتخۆر، مردەخۆر.
**مرابحة:** سوود و قازانج کردن.
**مرابطة:** بەندیواری لەگەڵ یەکتری پەیدا کردن.
**مرات:** زۆرجاران، فرەجاران.
**مرأة:** ژن، ئافرەت، ژنک، هاوسەرژەنی، هەوخەو، پت، پتکۆ، ژنک، ئاوسەر.
- **مرأة العجوز:** پیرێژن.
- **مرأة علی وشك وضع الحمل:** ژنی لەسەر دەستان.
- **مرأة الفاتنة:** زەری، پەری.
- **مرأة المتزوجة:** ژنی بەمێرد، ژنی شوودار.
- **المرأة المرجلة:** کەسکە.
- **المرأة المرضعة:** ژنی منداڵ لەبەر.
- **المرأة المسیحیة:** کیلۆ، ئافرەتی فەلە.
- **حقوق المرأة:** مافی ئافرەت.
- **خمار المرأة:** هیزا.
**مـرآة (ج) مـرایا:** ئاوێنە، جـام، نەینـک، جـامـەک، نەینۆک، ڕۆنایی، درووڤ، ئادەنە، درۆڤ، قودک، قبالە.
**جعبة المرایا:** قۆدی ئاوێنە، قوتووی ئاوێنە.
**مراجع:** گەڕاوەوە، ڕووتێکار، ڤرگەر، لە شـوێن گەڕاو، بەدوودا خول خواردوو.
**مراجعة:** گەڕانەوە، گـەڕانەوەسـەر، ڕووتێکردن، وەدووکەوتن، ڤـەگـەڕان، بادانەوە، گـرگـر، پێـداچوونەوە، وەرگـەڕانەوە، هۆدانەوە، فلخواردن، خولخواردن.
- **إرجع:** بگەڕێوە.
**مراح:** مۆڵگەی وشترانە.
**مراح الغنم (حظیرة):** پەچە.
**مراد:** خواست، مەبەست، ئامانج، خەلەسکوو، دڵخواز، مەبەس، ئاوات، ویست، داخـاز، مـراز، مەرازنچک، گـاڤین، سـەردل، مکێز، خواستراوەوە.
**مرادف:** هاوتا، هاوواتا، هاولنگە، هاومەبەس.
**مرادفة:** بڕوانە (ترادف).
**مراراً:** زۆرجاران، گەلێک جاران، فرەجار.
**مَـرارة (ج) مـرار:** ١- تالـی، تالاو، تاراو، تالایی، زارە، زاوور ٢- زراو، زالـوو، زالۆ، زارە، زالە، توورەکـەیەکـە زەرداوی تێدایە و بەجەرگەوە نووساوە، زاوەرە، زاورە.
**مراسل:** پەیامبەر، وەلامبەر، سلیڤ.
**مراسلة:** نامە بۆ یەکتری نووسین.
**مـراعـاة:** چاوەدێری، ڕێزگـرتن، ئاوڕ لێـدانەوە، ئاگـا لـێ بوون، پارێزگاری کردن، ئاگاداری، سەرپەرشتی.
**مراغة:** شوێنێکە چوار پێیان خۆیان لێ دەگەوزێنن.
**مرافعة:** دادخوازی، گازندە لە یەکتری بردنە لای دادوان.
**مرافق:** هاوڕێ، برادەر، یاریکار، یاوەر.
**مرافقة:** هاوڕێیی، ئامرایی، یاریکاری، برادەرایەتی.
**مراقب:** لە (راقب مراقبةً) بیدۆزەوە.
**مراقبة:** لە (راقب مراقبةً) بیدۆزەوە.
- **تحت المراقبة:** دەست بەسەر.
**مرام:** دڵخواز، خەلەسکوو، ئاوات، ئارەزوو، ئارۆزمکێز، نیـاز، ویست.
- **نیل المرام:** بەئاوات گەیشتن.
**مراماة:** تیر و یا گوللە پێکەوەنان، شەڕە گوللە، شەڕەبەرد.
**مرامح:** ڕمباز.

**مرامحة:** ڕمبازی، نێزەبازی.
**مراهق:** هەرزەکار، جحێڵ، لاوێکە لە دەوروبەری پازدە ساڵی و خۆناسینی بێ، دەمڕووت، سیپە.
**مراهقة:** هەرزەکاری.
- **دور المراهقة:** سەردەمی هەرزەکاری.
**مراهَنة:** گرێو و مەرج لەگەڵ یەکتری کردن.
**مراودة:** لەگەڵ یەکتری دۆستایەتی و هاتوچۆکردن.
**مراوز:** پەستان پیو.
**مرئوس (مرؤوس):** کەسێکە لە ژێر دەست سەرۆکێکی کار بکات
**مراوغة:** زۆرەوانی گرتن، فێڵ لێک کردن.
**مرئي:** دیار، ئاشکرا، بەرچاو، لەبەرچاوان، خویا، دەرکەوتوو، بەرز.
- **غیر مرئي:** پانۆک، نەپەندی، نەپەنی، ون، نادیار، نەدیو، گوم، بزر، پەنهان.
**مربٍ، مربّي:** بروانە (**مربّي**).
**مربض:** گەلەخان، گەوڕ، مۆڵگەی ئاژاڵان.
**مربّع:** چوارگۆشە، چوارسووچ، دووجا، چارسووچ، چوارگە، چوارێن، چارگۆشە، چارنیچک، چواچمک، دامەدامە.
- **مربّع الشكل:** چوارگۆشە شکڵ.
- **مربّع الضلعين المتناظرين:** دوولای دووجایی هاوجێ.
**مربّع الكامل:** دووجای تەواو
- **المربعات الخيالية:** چوارگۆشە سپیەکان.
**مَربَع:** بەهارە هەوار، بەهارەوار، هەوارگەی بەهاران.
**مَربَع الحيوانات الوحشية:** نۆرینک.
**مربعة:** شەغرە.
**مربوط:** بەستراوە، پێوەندیدار.
**مربوع:** چوارشانە.
**مربّي:** مرەبا، ڕیچاڵ، ڕیچۆڵ، ڕب، ڕوب، ڕەنێوهێنەر، داشدیار.
**مربّي:** پەروەردەکار، بەخێوکار، پەروەردیار، ڕەنێوهێنەر، لەلە، پێراگەیێن.
- **مربّي الاطفال:** لەلە، دادووک.
- **مربّي القرود:** لۆتی.
**المربيّة:** دایەن، دایان، تایەن، فەرهەنگار، مامان.
**مرة (ج) مرات ومراراً:** جار، چەل، کەڕەت، دان، وەهلە، هۆن، چین، کـژ، ڕا، گەڕ، گل، هەل، حەل، دەم، دەرب، باو، جارێکی، هەینێ، نۆبە، هەل، هەو، کاو، سەر.
- **مرة اخرى:** جارێکی تریش، هەمیسان، جارێکی تر، دووبارە
- **مرة واحدة:** یەکجار، یەکجارەکی، بەنێکجاری، یەکدان، چەلێکی.
- **بالمرة:** بەیەکجاری، یەکجارەکی.
- **هذه المرة:** ئەم جارە، ئەمسا، ئی جارە، ئنجا.
**مرتاد:** گەڕاوەوە.
**مرتاض:** وەرزشکار، کەسێکە بۆ خاوێنکردنەوەی هۆڵیان (نفس)ی ئەرکی وەرزینەوە بکێشێ.
**مرتان:** دوو جاران، دوو چەلان.
**مرتَّب:** ڕێک، ڕێکوپێک، بەسەرویەر.
- **غير مرتب:** ناڕێک، بێ سەروبەر.
**مرتِّب:** ڕێکخەر، ڕێکوپێک کار.
- **مرتِّب الحروف:** پیت چن، پیت چێن.
**مرتبة (ج) مراتب:** بروانە (رتبه).
**مرتبط:** بەندیوار، پەیوەندکراو، پەیوەست.
**مرتبك:** شێواو، سەر لێشێواو، پەشۆکاو، شڵەژاو، شپرزە، ئاڵکاو، بێ سەروبن، سەرسووڕماو.
**مرتجع:** لە (**ارتجاع**) بیدۆزەوە.
**مرتجف:** لەرزەک، بەلەرز، لەرزۆک، لەرز.
**مرتجل:** هاکوو، کەسێکە لەبەر و هەر بەسەر پێوە، هەڵبەست یا وتار و پێوەر بخوێنێتەوە، کەسێکە وتارێکی سەرپێیی بخوێنێتەوە یا هەڵبەستێک.
**مرتجي:** ئومێدەوار.
**مرتخي:** سست، شل، خاو.
**مرتد:** هەڵگەڕاوەوە، ڕووگەردان، هەڵگەڕیاگ، وەرگەڕاو، لە ئایین دەرچوو.
**مرتشي:** بەرتیل وەرگر.
**مرتضى:** بەخشراو، پەسندکراو، کەیفخۆش، بژاردە.
**مَرتع (ج) مراتع:** لە (**رتع**) بیدۆزەوە.
**مرتعب:** ترساو، زەهلەچوو.
**مرتعش:** لەرزێن، هەژێن.
**مرتفع:** لە (**ارتفاع**) بیدۆزەوە.
**مُرتكب:** کەسێکی سواری کارێکی ببێ یا کارێکی بکات و یا گوناهێکی لێ ڕووبدات.
**مرتكز:** ڕاوەستاو، جێگیر، جێگرتوو.
**مرتهن:** بارمتە، چتێکە لە گرەو دانرابێ.
**مرتين:** دوو جاران، دوو چەلان.
**مرثية (ج) مراث:** سەردوولکە، دولکە، سەردولکەبێژی، بەدەم شین و شەپۆرەوە بەمردوان هەڵکوتن.
**مرج (ج) مروج (ه):** مێرگ، مێرگەشە، چیمەنزار، شەکار، چیمەن، زرچک، سەوزەڵان، گیاجار، مێرخوزار.
- **مرج مزروع بالاشجار:** هێسار.
- **مرج الملتف النباتات:** تاڕوون.
**مرجام:** قۆچەقانی، کانک، بەرزەقانی، بەرکانی، قەفکانی، کەفک، کەڤرکانی، کەڤکانۆک، کەهنی، کانیک.

**مرجان:** وردەدوڕ، دوڕی گچکە، بستام، بەسد، مەرژان، شیلان، مووروی سوور، زیندەوارێکی دەریاییە وەگیای دەچن وەکو گیاش بەزەوییەوە دەچەسپێ، لە پێشدا بەگیایەکی دەریایی دەزانرا بەشێکیان مەرجانی سوورە لەگەوهەربەندێ بەکاردەبرێ.

**مُرَجَّب:** سامدار، گەورە، خاوەند شان و شکۆ.

**مرجَّح:** بەسەردا هەبوو، پەسندکراو، پەسند.

**مرجحة:** بڕوانە (**ارجوحة**).

**مرجَع (ج) مراجع:** سەدە، شوێنی گەڕانەوە، سەرچاوە.

**- مرجَع الفدان في الحقل:** هۆگان، کاگێرە.

**مُرجِّع:** گێرەوە.

**مرجل (ە):** مەنجەڵ، سوکرە، خەزان، پانی، پەرۆش، نەلبەکی.

**- مرجل صغير:** دەستە مەنجەڵ، پەرۆش.

**مرجو:** ئومێدەوار، بەهەویا.

**مرجوع:** گەڕاوەوە.

**مرجوم:** بەردەباران و سەنگەسار کراو.

**المرح:** شادمانی، خۆشی خۆشی.

**مرحاض (ج) مراحيض:** ١- ئاودەست، ئەودەستخانە، پێشاو ٢- کوتکی جلک شوشتنییە.

**مُرَحَّب:** گوشاد، فراوان.

**مَرحَب:** گوشادی، خۆشی

**مرحباً:** شا، خۆشا، شابەحاڵی، بەخێرهاتی، خۆشهاتی.

**- مرحباً بك:** تووشی خۆشی و گوشادی هاتووی.

**- مرحباً مرحباً:** بەخێرهاتن کردن، خۆشهاتن کردن.

**مرحلة (ج) مراحل:** قۆناخ، پلە، چەقز، مەڵبەند. پلە (ماتماتیک)

**مرحمة (ج) مراحم:** میهرەبانی، دڵسۆزی، دڵسۆژی، بەزەیی

**مرحوم:** بەخشراو، خوا لێ خۆشبوو، بەهەشتی، ژ دنیایێ چاڤ مچاندی.

**مَرخ:** دەستەچیلە.

**مرخ مرخاً جسده بالدهن:** هەنوون، هەنووین، هەنین.

**مرخص:** ماوەدراو، دەستووردراو، ئازاد، سەربەست، ڕێدراو.

**مُرَخَّم:** چتێکە دواییەکەی بڕابێ. کلک بڕاو.

**مرجى:** خاو، سست کەرەوە.

**مِرداس:** سەر، بەردکوت، بەردێکە لە چاڵاوێی باوێژن تا بزانن ئاوی تێدایە یانا.

**مردَّد:** ١- هاوچرە ٢- دوودڵ، نیگەران، سەرگەردان.

**مردود:** وەرنەگیراو، گێڕاوەوە، خول پێ دراوەوە.

**مرزبان (ە):** مەرزەبان، ناوی فەرمانڕەوایێکی کورد بووە.

**المرزة:** چەڵتووکجار، مەرەرە، شالێکا.

**مرزوق:** ڕۆزی پێدراو، بەهرەمەند.

**مَرِس:** کارکردە، شارەزای کاروشەڕ.

**مَرس:** خووساندنی دەرمان لە ئاوێ و بەدەستی و یا بەچتێکی تاواندنەوە، ساوینەوە، سوونەوە.

**مرساء:** بڕوانە (**مرسى**).

**مرساة (ج) مراسٍ:** لەنگەری گەمێ.

**مرسَّب:** نیشتوو.

**مرسح:** کەوانە، کەڤانە، سەماگە، هەڵبەڕگە.

**مرسل (م) مرسلة:** نێرەر، پەیامنێر، بەرێکار.

**مُرسَل:** ناردراو، نێرراو، ناردرای، نارپاگ

**مَرسم:** نیگارگە

**مرسوم (ج) مراسيم:** شێوە، نیشانەکراو، دروشم، لێدراو فەرمان، دەستوور، شوێن، فەرمانێکە لەلایەن فەرمانڕەوایێکەوە نووسرابێ

**- المرسوم السلطاني:** فەرمانی شاهانە

**مرسى:** لەنگەرگە، لەنگەرگا، پندەر.

**مَرش:** ڕووشاندن، ڕنین، زەوییەکە بارانە ڕووشاندبێتی

**مرشة الماء او الدواء:** ڕشێنە

**مِرشة:** ئاوپاش

**مرشح (للانتخاب):** ناودێر، نامزەد

**مرشَّح:** ناوهاتوو، نێو لێنراو، پاڵێوراو

**مرشد:** ڕابەر، ڕێبەر.

**مرصَد:** کەمینکە، تەماشاگە، کۆڵێتکا، ڕوونگە، چاوەڕێگە، کالیتکا، ڕوانگە، دیارگا، ناسۆگە، کالیتکار، کولیتکا

**- مرصَد الصيد:** بازگە، پەیجۆر، نۆڕینک

**مِرصاد:** ڕی، ڕێگا، ڕیگە، کەمینگا، تێپەڕگە

**مرشد:** ڕابەر، ڕێبەر، ڕێ نیشاندەر، ڕێ نوێن، ڕێ پێشاندەر.

**مرصَّع:** سەردلکری، گەوهەربەند، زێڕن، زێڕین، داوەنیشان، گەوهەرنیشان، ڕازاوەوە.

**مرصوص:** قایم، پاڵ وێکدراو، قایم دامەزراو، یەک گرتوو.

**مرض (ج) امراض:** نەخۆش، دەرد، هۆ، ئاهۆ، ناساخی، نەساخی، نەوەش، کرمکیس.

**- مرض إرثي:** نەخۆشی پشتی.

**- مرض الافرنجي:** ئاتەشەک.

**- مرض جلدي:** خارشت، خورشت، خارشتی، پیستی.

**- مرض الحبلي من الحمل:** نەبیرانی، ژانی منداڵ بوونی.

**- مرض زهري:** کفتی، ئاتەشەک، فەرەنگی.

**- مرض ساري:** دوم، پەتا، پەتۆ.

**- مرض السرطان:** شێریەنجە، خرچەنگ، قرژاڵە، جوولبڕ، گرتەکوو، کەوگیرە، چنگار.

- **مرض السفليس:** كفتي، ئاتەشەک، فەرەنگی، نەخۆشی فەرەنگی.
- **مرض السكر:** نەخۆشی شەکری، نەخۆشی قەندی.
- **مرض السلّ:** دەخەز، دیق، دەردەباریکە، وەرەم، سیل.
- **مرض السنّ:** نەخۆشی ددان.
- **مرض السوداء:** نەخۆشی سەودا، والامەنی.
- **مرض السیلان:** سووزەنەک.
- **مرض الشدقین:** لخاوەبرکە.
- **مرض الصرع:** فێ، فێ لێ هاتن، خوو، ئاهۆ، دەردەکورتان.
- **مرض الصفّار:** زەردوویی، زەرتک.
- **مرض الطحال:** نەخۆشی سپڵ، تەین و لەیان، تیرولیمان.
- **مرض الطیور:** دانکە.
- **امراض العظام:** نەخۆشیانی ئێسک.
- **مرض العین:** چاوئێش، چاوکولی.
- **مرض الفالج:** شەپلە.
- **مرض فتاك:** نەخۆشی سندان.
- **مرض قتّال (قاتل):** نەخۆشی کوژندە.
- **مرض الکساح:** نەخۆشی ئێسکی.
- **امراض المتوطنة:** نەخۆشیانی نیشتەجێیی.

**مرض مزمن:** نەخۆشی کۆنینە، دەردی کاری، دەردی کوژندە، دەردی بێ دەرمان، ژاری، نەخۆشی کۆن.
- **مرض المعدي:** نەخۆشی پێ درێژ، نەخۆشی تەشەنەکار.
- **مرض المعدة:** نەخۆشی چیکلدانە.
- **مرض مهلك:** نەخۆشی کوژندە.
- **الامراض النباتیة:** نەخۆشییەکانی شیناوەردی.
- **تشخیص المرض:** نەخۆشی دۆزینەوە، لە نەخۆشی سەردەرکردن
- **عودة المرض:** هەڵدانەوەی نەخۆشی.

**مرضاة:** خۆشحاڵی، قایلی.

**مرضعة:** تایەن، مەمک دایەن، شیردەر، دایان، منداڵەبەر، دایێن، تایێن.
- **مهنة المرضعة:** دایەنی، تایەنی.

**مرضی:** پەسند، پەسندکراو.

**المرط:** بەرە، رایێخ.

**مرطوب:** شێدار، شەدار، هێمن، نمێن، نماوی، پاراو، نەمێن، نیمدار، نمدار، نموونک، زەوونج.

**مرعب:** ترسێن، ترسێنەر، بەسام، سامدار، بەترس.

**مرعز (ە):** ١- بزنە مەرەز ٢- مەرەزە مەرز، مووی نەرمی بزنان

**مرعش:** ١- کۆتری سپی تەقڵەباز، ٢- ناوی شارێکی کوردانە کەوتۆتە باکووری کوردستان و دیل و ئیخسیری ژێر دەستی تورکە مغوولزادەکانە.

**مرعوب:** ترساو، ترسێنراو.

**مرعوف:** دارساو، خوێن لە لووت پژاو.

**مرعی (ج) مراعی:** لەوەرگا، پاوان، چێرە، چێرەگە، گوان.

**مرغوب:** پەسند، پەسندکراو، بەرچاو، خوازتراو، رووبازاری، دلگر، دلخوا، دلخواز، دلچەسپ.

**مرفأ:** بەندەر، دەرەگە، لەنگەرگە، لەنگەرگا، مینای دەریایان.

**مرفق (ج) مرافق:** ئانیشک، بەلەمرک، قوونانیسک، ئەنیشک، هەنیشک، هەرەژەنی، قوونەتیشک، ئەنیزک.

**مرفقات:** هاوپێچراو، هاوپێچ.

**مرفه:** ئاسوودە، گوێ دینج، خۆشگوزەران.

**مرفه الحال:** ئاسوودە، گوێ دینج، خۆشگوزەران.

**مرفوض:** فرێدراو، پشت تێکراو، بەجێ هێشتراو.

**مرفوع:** ١- بلندکراو، هەلگیراو، بەرزکراوەوە، ٢- بۆردار (**مضموم**) ( ُ ).

**المَرق، مرقة:** گۆشتاو، شۆرباو، شلە، شلاو، شۆروا، پیتە، خۆرشت، مەدفەنی، مەدفین، مەدفوونی.
- **مرق البربور:** شلەی برویشی، بروێشێن.
- **مرق الحصرم:** شۆرباوی قۆرە، هالاو.
- **مرق الشلغم:** ترخێنە، شەلمین، شەلەمین.
- **مرق العدس:** نیسکێنە، میژوێنە.
- **مرق اللحم:** گۆشتاو، شۆرباوی گۆشتی.
- **مرق اللفت:** شێلماو.
- **مرق اللیمون:** تاسکەبانی.
- **مرق مصنوعة من الخضروات:** لقنج.

**مرقاة:** پێ پلکانە، پێ پلیکانە.

**مَرقَب:** کەمین، کەمینگا (تەلەسکوب).

**مرقد (ج) مراقد:** ئارامگا، نوستنگە، تەختی خەوێ، گۆر.

**مرقش:** رەشباز، پلپلی، پنک پنک، گولگولی.

**مرقش اللّون:** کورکوری.

**مَرقَص:** سەماگە، هەلپەرگە، سەماگا.

**مرقط:** پنک پنک، خالخالی، پلپلی، رەشبەلەک، رەشباز، رەش و سپی تێکەلاو.

**مرقّع:** پینەچی.

**مرقَّع:** پینەکراو.

**مرقوم:** نووسراو، خەتدار، دێخدار.

**مرقومة:** نامە.

**مرقی:** بروانە (**سلم**).

**مركَب (ج) مراكب:** کەشتی، گەمێ، ولاخی سواری.

**مُركّب:** ئاوێتە، پێکهاتوو، تێکەلاو، گیراو، گیراوەوە، ناسادە، رێکخراوە، هەڤبەند، دوومل.

- **المصدر المركب:** چاوگەی ئاوێتە.
- **مركّب، مركبة:** ڕێکخەر، پێکەوەنەر، گرەوە، گیرەوە، لێکدەر، تێکەڵاوکار.
- **مركّب الأسنان:** ددانساز.
- **مركبات:** پەیوەستگەل، گیراوەگەل.
- **مركبات العضوية:** پێکهاتووە ئۆرگانییەکان.

**مركبه:** پێکەوەنەر لە (فیزیا).

**مُركّز:** ١- چەقیو، پایەدار ٢- پەیت، خەست، مەییو، گیراوەوەی تێر و پڕ و تیر.

**مركز (ج) مراكز:** ناوچە، کەوە، کورەک، ناچە، بنکە، نێوەڕاست، ناوەند، هنگ، کورک، ناچە، پونگال، نافند، مەکەن، مەیدان، هنگ، چەق، جەرگە، بنگە، سەرنقەک، قزگە، ناڤەند، نێوەڕاستی جەغزییە.

**مركز (هندسي):** بنە.

- **مأمور مركز:** کەوەگێڕ، ناوچەگێڕ.
- **مركز الاجتماعي:** بنکەی کۆمەڵایەتی.
- **مركز الثقل:** کێشگا، کێشگە، چەقی قورسایی، چەق.
- **مركز الجذب:** کێشگە، ڕاکێشگە.
- **مركز الذكاء:** مەڵبەندی زیرەکی.
- **مركز الشرطة:** ناوچەی تەنگەچەری، ناوچەی گزیران، جەرگەی شاگرد دارۆغان.
- **مركز علمي:** ناوچەی زانیاری.
- **مركز وسط:** ناوچەی ناوەندێ.
- **مركز الهندسي:** ناوچەی ئەندازەیی، ناوچەی ئەندازیاری.

**المركن (ە):** مەرکانە، دۆلە، تەسە، تەبەک.

**مركن:** تۆراغدان، تۆراغان.

**مركوب:** وڵاخی سواری.

**مرمر (ە):** مەڕمەڕ (بەرد).

**مرقّم:** پینەچی، پینەکار، ڕێکخەر.

**مركوز:** پایەدار، قایم دانراو، قایم جێ گرتوو.

**مُرمَّد:** چاوکول.

**مرموز:** پۆشراو، چتێکە لە نێوانی دوو کەساندا بەرێک (اشارة) دیاری کرابێ.

**مرموق:** بەرکەتی، بەرچاو، پێشچاو.

**مرمی:** فڕێدانگە، تووڕهەڵدانگە، ئاوێژتنگە.

**مرمی الاحباف:** شیومردە.

**مرّن:** بروانە (تمرین).

**المرن:** جیر، چیر.

**مرهم (ج) مراهم (ە):** مەلحەم، چرک، هەتوان.

**مرهون:** بارمتە، لە گرێودانراو، چتێکە لە بارمتە دانرابێ.

**مروءة، مروّة:** مرۆیەتی، پیاوەتی، جوامێری، ئەمەگداری، ئەمەگ، پیاگی، جامێری، دادمەردی، مەردایەتی، مەردی، مرۆڤایەتی، مێردی، مێری، دڵنەرمی.

**مروّج:** وەبرەوخەر، برەوپێدەر، وەباوخەر.

**مروحة (ج) مراوح:** باوەشێن، باژەن، باوەشینک، باڕووشە، باڕۆشە، (پانکە).

- **مروحة صغيرة:** باوەشینک.
- **مروحة كهربائية:** پانکە، باوەشێنی کارەبایی.

**مروخ:** ئەوەیە کە لەشی مرۆی پێ دەهەنوون و چەور دەکەن.

**مرود (ج) مراود:** لە (رود)دا بیدۆزەوە.

**مرور:** ڕابردن، تێپەڕین، بوورین، تێکشان، ویاران، ویەردەن، بورهاتن، بوورینۆ، پیاخشان، تەورین، دابوورین، ڕەتبوون، ڕابردن، ڕەو، کشان، ڕەدبوون.

**مرؤوس:** کارمەند، ژێردەست.

**مروّض:** باخچەوان، لە کار دەرهاتوو، ڕام، باخ و باخچەدار.

**مروّع:** تۆقێنەر، زەهلەبەر، ترسێنەر.

**مروّق:** پاڵێوەر، ڕوونکەرەوە.

**مروَّق:** پاڵێوراو، ڕوونکراوەوە.

**مرونة:** نەرمی، چیری، پێز.

**المرونة (في الفيزياء):** جیری، چیری.

**مروي:** گێرەوە، ئەو کەسی چیرۆک یا مێژوو و باسی ئەم و ئەو بگێڕێتەوە.

**مريئ (ج) مروء:** ١- سوورێنچک، سیرۆچکە، سوورچک، ترترۆک، سیرۆچک، ئووربەلیشک، بابەلیشک، سۆرسۆرک، سوورناتک، سووریناسک، سوورێنە، بۆری خواردنێیە ٢- ڕەوا، نۆشی گیان، گوارا.

**مريب:** گومانگر، گومانکار، دوودڵ، نیگەران، گوماندار، بێ ئیپ و زیپ.

**مريخ:** بارام، بەهرام، یەکێکە لە ئەستێرە گەڕۆکەکان و لە هەموانیش لە ڕۆژ نزیکترە.

**مَرِيد (ج) مرداء:** نافەرمان، سەرکێش، شەڕفرۆش.

**مُريد:** داخواز، لاگر، خواستەر، ویستەر، بخواز، خوازۆک، دڵسۆز.

**مريض (ج) مرضى:** نەخۆش، ناساز، ساخ، نەوەش، بێمار، دەردناک، دەردمەند، نەساخ.

- **استفسار احوال المريض وغيره:** لێپرسین.
- **صوت المريض:** نەقەنەق، نکەنک.

**المَرِيق:** قاخلێ، کاژێڵە، کاخلێ (گیایە).

**مرين:** قایم، چڕ، چیر.

**مَزّ الشي مزّاً (ە):** مژتن، مژین.

**مُزّ، مزّة (ە):** مزر، مەیخۆش، مز، مەزەدار، ترش و شیرین، مەیخۆش.

**مز:** ئەندازە، زۆری.

**مزابنة:** برِیە، گۆترە، تەخمین، (لەکاتی کرِین و فرۆشتن).

**مزاد:** مەزات.

**مزاج:** ١- سرشت، خوو، ئەدا، کەنشت ٢- ئەوەیە کە چتێکی تری تێکەڵ کرابێ.

**- مزاج البدن:** ئەوەیە کە لەگەڵ لەش تێکەڵ کرابێ وەکو خوو و رِەوشت.

**- حديدي المزاج:** مەرِس، قەڵس، توورِە.

**- صحيح المزاج:** تەندروست، ساخ، خۆش، لەش باش.

**مزاح ومزاحة:** گەمە، گەپ، گاڵتە، فشە، کایە، تیتاڵی، گەپ بەزار، شۆخی، هەنەک، یاری، قەوسە، قەرف، فشقیات، گەمەوگاڵتە، شۆخی، گۆلەز.

**مزاح:** لە (فیزیا)دا لادراو.

**مزّاح:** گاڵتەکار، گاڵتەچی، زۆر گەمەکار.

**مُزاحم:** شەرئێشەر، سەرئێشەدەر، ئازاردەر، مێمڵ، رِەنجدەر.

**مَزاحم:** هۆ و مایەی ئازار و سەرئێشە.

**مزاحمة:** ئازاردان، سەرێشاندن.

**مَزاد:** هەراج، پترکردنی نرخی چتێکی.

**- مَزاد علني:** هەراجی ئاشکرا

**مزادة:** هەمبانە، تۆشەبەر.

**مزار:** دیدەنیگا، گۆرِ، ئارامگا، گڵکۆ.

**مزارع:** چێن، زەوی چێن، دێهاتی، تۆوچێن، فەلەخوێ، وەشێنەر، تۆم چین، کاڵ، خەنیوە، کشتیار، تۆو وەشێن.

**- مزارع حكومية:** میرەکێل.

**مزارعة:** پێکەوە کشتوکاڵ کردن.

**مزاع:** برِوانە (**قنفذ**).

**مزاولة:** لە فەرمانێکی کارکردن، دەست بەکارکردن.

**مزاوجة:** پێکەوە تێکەڵاوی کردن، هاوسەرێتی یەکتری کردن، هاوسەنیری.

**مزايد:** زۆرکار، زۆرگر.

**مزايدة:** نرخی کەلوپەلی لە یەکتری پترکردن، لەسەر یەکتری پترکردن، هەراج، زۆرگری.

**مزبر:** دابەستە، دابەستوو، کوشتی.

**المزبر:** قەلەم، پێنووس، خامە.

**مزبلة (ج) مزابل:** سرانگۆلک، سەرگوویلک، سەرانگوویلک، گووفەک، سەرنوویلک، گڵەخانێ، گەمارگە، سەرگۆ، سێرکووە، بنگ، گیفۆک، کیووک، سەرلووینک، سەرینگولان، خووەلێدانک، کۆرِیناخ، زبلگە، پەلک، ئاریدانک، کرسگە، زبڵدان.

**مزبور:** گۆرِین، تایین، باسکراو، نێوبراو، گولقار، یارۆ، کابرا، هەرامە، وانێک، پێژنا، ناوهاتوو، نووسراو.

**مزج:** تێکەڵاوکردن، کەملاندن، بەرناڤدان، جە مجقاندن.

**مزجاة:** چتی کەم و سووک.

**مزح:** گەمەو گەپدان.

**مُزخرف:** بەچت فریودەر رِازاوەوە، وتەی بێ سوود و نارِاست درۆیەکە وەکو وتەی رِاست رِازابێتەوە.

**مزدحِم:** لە (ازدحام) بیدۆزەوە.

**مزدحَم:** قەدەغە، هەزارەزیلە، ژلووقیاگ، گەلەکۆمەگی، جەنجاڵ، کەڵەکە.

**مزدهر:** گەش، خەملیو.

**مزدوج:** هاوجووت، تێکەڵاو.

**مزراب (ج) مزاريب:** ناودان، لووساوک، سوولاوک، مەرزم، مەزرِووب، بۆختک، پلوورە، پلووسک، شرک، سوولی، سوولک، چەمبلوونک.

**مزراح المغزل:** سەری تەشی، سەردووک.

**مزراق:** رِمب، نێزەی سووک.

**مزدوج:** هاوجووت.

**مزرعة (ج) مزارع:** کێڵگە، مووچە، مەزرا، چاندگە، رِواندنگە، دەشت، زەوی زار، زەوی و زار.

**- مزرعة محصودة:** فرێزە، کشتوکاڵی درواوەوە.

**مزروع (ج) مزروعات:** چێنراو، کردار، چاندراو، داچێنراو، وەشیاگ، کشتوکاڵ، کشتوکێل، شیناوەردی، شینایی، فرقاندی.

**- مزروع بدوياً:** دەستچێن.

**- مزروعات خريفية قبل موسم المطر:** هیشکاوز، هیشکاوس.

**- مزروعات الصناعية:** چاندەمەنی پیشەسازی.

**- مزروعات الصيفية:** هاوینە چێن.

**- مزروعات المشتتة:** فرِک.

**مزركش (ە):** زێرِکێش، زێرِپۆش.

**مزريج:** قۆرِ قۆرِە.

**مزعج:** جارِسکار، بێزارکار.

**مزعفر:** بەزەعفەران بۆنخۆش و رِەنگ کراو و رِازاوەوە، زەرد، خۆراکێکە.

**مزعَم:** شوێنێکە قرمی لێ خۆشکرابێ و جێ برِوا نەبێ.

**مزعوم:** داتاشراو، بەگومان دروستکراو.

**مزّق مزقاً:** درِاندن، پارچەپارچەکردن، هلقرتاندن، ڤەرساندن، زڤارکرن، چرِاندن، جیراندن، دەنواندن، درِین، دادرِین، تلێشاندن، شرِکردن.

**مزلاج:** رِێزە، ئاڵقەرِێز.

**مَزلَة (ج) مزال:** خلیسکگە، شوێنی خلیسک و خلیسکێنێ.

**مزلقة:** شوێنێکە داو و تەپکە و یا تەڵەی لێ دادەنێنەوە.

**- مزلقة علی الثلوج:** خێچک.

**مزمار (ج) مزامیر:** بلوێر، بلوور، لوولێ، هەڤان، زڕنە، شمشاڵ، شمشاد، فیقە، نەی.

**- قصبة المزمار:** دەسکی زوڕنای.

**- لسان المزمار:** پیکی زوڕنای.

**مُزَمَّل:** لە کراس و یا لە بەڕەوە پێچراوەوە.

**مُزَن:** خوو و ڕەوشت.

**مزمن:** کۆن، کۆنینە، فرەماگ، درێژخایان.

**مزنة:** بارانە، هەوری سپی.

**مزهرية:** گوڵدان، گوڵدانک، ئینجانە، هنجان، هنجانە.

**مزن:** هەور، هەوری پڕ ئاو.

**مزوّج:** ژندار، خاوەندژن.

**مزود و مزاد:** هەمبانە، زاددان، تۆشەدان.

**مزوِّر، مزورة:** لە (تزویر) بیدۆزەوە.

**مُزَوَّر:** ساختە، داڕشتە.

**مزولة (ج) مزاول:** کات نوێن، نیوەڕۆنوێن، کاتژمێری بەر هەتاوییە کە بەهۆی سێبەری ئامرازی سەرییەوە نیوەڕۆیە دیاری دەکرێ.

**مزية (ج) مزايا:** بەسەردا هەبوون، لەلایەن و جوانی و نرخداری و ئازاریی و گەورەییەوە.

**- ذو مزايا:** هونەرمەند، بەهونەر، بەزاخ.

**- فاقد المزايا:** بێ زاخ.

**مزيج:** ئاوێتە، ئامێتە، تێکەڵاو.

**مزيد:** پتری.

**مزيّف:** پارەی قەڵب، پووڵی ساختە، سکەی ساختە.

**- مُزيِّف النقود:** قەڵبەژەن، سکەی ساختە لێدەر.

**مزيل:** لابەر، وەلابەر، ڕاکر، لەناوبەر.

**مزيَّن:** ڕازاوەوە، خەملیو.

**مزيِّن:** ڕازێنەوە، خەملێن.

**مس مساً:** دەست لێدان، سوون، دەست لێ هەڵسوون، دەست پێداهێنان، تووشبوون، پێگەیشتن.

**مساء (ج) امسية:** ١- هێوارە، ئێوارێ، شێوم، شیم، ویرەگا، هێڤار، شام، هەنگۆر ٢- سەرەتای شەوێ.

**- مساء الغد:** سبەی شەوێ.

**- مساء بعد الغد:** دووسبەی شەوێ.

**- مساء الخير:** ئێوارەباش، ئێوارە خووەش، ئێڤارخووەش، باشەڤار.

**- هذا المساء:** ئەم ئێوارەیە

**مسابقة:** بڕوانە (**سباق**).

**مساجلة:** وتووێژی دوو یا چەندین کەسانە بەهەڵبەست لەگەڵ یەکتری.

**مسّاح:** زەمین پێم، پێوەر، زەوی پێو، زەمین بێن، ئەو کەسەیە زەوی و زار و خانووبەرە و باخ و باخچە و ئیتر بپێوێ.

**مساحة:** پانایی، ڕووبەر، زانیارێکە باسی چەند و چۆنی دێخان دەکا.

**مسّاحة:** تەختە سڕ، خەتکووژەوە، جیل.

**مساحة:** زەوی پێوان.

**مساحة:** ڕووپێوی، پێوەری.

**- مساحة الجانبين:** ڕووبەری ڕووی لایەنەکانی، ڕووبەری تەنیشت.

**- مساحة الحجمية:** ڕووبەری قەبارە

**- مساحة سطحية:** ڕووبەری ڕوو، ڕووبەری ڕووکار.

**- مساحة الكليّة:** ڕووبەری هەموو ڕووەکان..

**- مديرية امور المساحة:** بەڕێوەبەرایەتی کاروباری پێوان.

**- مديرية المساحة العامة:** بەڕێوەبەرایەتی پێوانی گشتی.

**مسّاح:** پێوەر.

**- المساحة السطحية:** ڕووبەری ڕوویی.

**- المساحة الحجمية:** ڕووبەری جۆلایی.

**مساد:** خیگەی ڕۆن و هەنگوین.

**مساداة:** گوێزان، مێشان.

**مسادن:** پاسەوانی گۆڕستان.

**مسار:** ڕێڕەو، ڕێباز.

**مسارعة:** لە تاڵووکە لێک کردنێ پێش یەکتری کەوتن.

**مساس:** دەست لێدان.

**مسّاس:** دەست لێدەر.

**مساعد:** بڕوانە (**ساعد مساعدة**).

**- مساعد الفقراء:** ڕووگر، هەژارپەروەر.

**مساعي:** بڕوانە (**مسعى**).

**مسافة:** ماوە، ماودا، نێوان، مەیدان، دووراقە، یەکەر، ناوەند، مەودا، ڕۆژ، دوورانە، دووراهی، دوورایی، دوور، ڕووبەر، دووری، درێژی، مەیدان.

**- مسافة الغوث:** ماوەیێکە هاوار و بانگی لێ ببیسترێ.

**- مسافة القصر:** دوو قۆناخە ڕێ.

**- المسافة المقطوعة:** ماوەی بڕاو، دووری بڕاو، دووری کورتکراوەوە.

**مسافحة:** داوێن پیسکردن، خواردەیی کردن.

**مسافر:** ڕاڕەو، ڕیوینگ، ڕێوی، ڕێڤینگ، ڕێبوار، ڕایی، ڕاویار، ڕاڕۆ، ڕۆیار، ڕێڕەو، ڕێڕۆ، ڕیڤی، ڕێوی، کۆچەر، کۆچکار، ڕوویی، ڕێبگار، نوغرڕار، ڕەوەن، ڕەوەند، ڕابگار، ڕەوونە، ڕێبار، ڕایوار، ڕێوار.

**مسافرة:** رارەوی، کۆچکاری، ڕێبوار.

**مساك:** گرک

**مسئلة (ج) مسائل:** پرس، پرسیار، کاروبار، فەرمان، ئیش.

**المسالك التنفسية:** ڕێبازی پشوودان.

**مسالم:** ئاشتیخواز، خۆشرەفتار.

**مسالمة:** ئاشتیخوازی، خۆشرەفتاری.

**مسام:** کون، کونۆڵە، کونیچکە، کونووچکە، وردەکون، کونە وردیلەکانی پێشی کونیلە.

**مسامع:** گوێ پێنەدراو، خراوەوە پشت گوێ، سەرپاس.

**مسامح:** چاو لێ پۆش، هێل، هەڵبوێر، لێ بوور، لێ بووردەو، هشازا، سەرپاس، لێ بوورەر.

**مسامحة:** هێلان، لێ بووردن، چاوپۆش، لێ خۆشبوون، دەقساندن، بەخشین.

**مسامرة:** بڕوانە (**سمرة**).

**مسامي:** کونووچکەدار، کونیلەدار.

**مساند:** پشتگر، پشتگیر، پشتیوان.

**مساندة:** داکۆکی، پشتگرتن، پشتیوانی کردن.

**مسانهة:** ساڵپەر، ساڵ نەساڵ، ساڵ ناوەر، بۆ ڕووەکێکی بەکار دێنرێ کە ساڵێ بەر بێنێ ساڵێ نا.

**مساهر:** شەوبێدار.

**مساهرة:** شەوبێداری، شەوی پێکەوە بەبێداری ڕابواردن

**مساهلة:** ئاسانی و نەرمی نواندن.

**مساهم:** بەشدار، هاوبەش، مووچەبەر.

**مساهمة:** بەشداری، مووچەبەری، هاوبەشی.

**مساوٍ:** بەرابەر، بەقەدیەکتری، هەڤروو، هاوتەراز، هاوشان، هاولف، هەڤسەر، یەکسان، هەڤبەر، پێکەڵپێک، بەرانبەر، هاوسەنگ، هەمبەر، تەنگال، بەردیلک، هاوسەنگ.

**مساواة:** یەکسانی، بەرانبەری، وەکهەڤی، پێکەڵپێکی، یەکی، سەنگا.

**مسئول:** بەرپرسیار، لێپرسراو.

**مسئولية:** بەرپرسیاری، مل گری، لە ملی خۆ گرتی، لێپرسراوی

**مساومة:** لە بابەت نرخەوە لێکتر پرسین، بازاڕ و سەوداکردن، چەند لێدان.

**مساوي:** بڕوانە (**مساوٍ**).

**مساويء:** کردار و وتەی ناشیرین و گەند.

**مسبِّب:** هۆ، هوسار، مایەی هۆ.

**مسبح (ج) مسابح:** مەلەگە، مەلەکا.

**مسبِّح:** ئەوکەسەیە بەپاکی یادی خودای بکات.

**مسبحة:** بڕوانە (**سبحة**).

**مسبر:** میل.

**مسبَّع:** حەوت لا.

**مسبعة:** شوێنێکە جانەوەرانی دڕندەی زۆربێ.

**مسبك (ج) مسابك:** ڕێژگە، دارێژگە، دەریچە.

**مسبوق:** پێشکەوتوو، پێشوو، پێشووتر، ڕابردوو.

**مسبوك:** دارژاو، دارێژراو.

**مُستَبعَد:** دوور، دووری خواز، چتێکە لە دوورەوە دیاربێ.

**مستأجر:** کرێگرتە، بەکرێگر، تەفاریک.

**مستئصل (مستأصل):** لە ڕەگ و پووکەوە دەرهاتوو، بنبڕ، ڕیشەبڕ، بێخ بڕ، بنەبڕ.

**مستأنس:** هۆگر، کەوی، ڕام، ماڵی، گرۆ.

**مستأنف:** گلەوگازاندە دووپاتەکەرەوە بەسەرگرەوە، پێداچووەوە.

**مستبد:** لە (استبداد) بیدۆزەوە.

**مُستَبشِر:** شادمان، مزگێنیدەر.

**مستبصِر:** کەسێکە بیەوێ کارێکی ئاشکرا بکات، خاوەند بیرو تێڕامان.

**مستثني:** لە (**استثناء**) بیدۆزەوە.

**مستجاب:** وەڵام دراوەوە.

**مستجد:** تازە پێگەیشتوو، کەم شارەزا، تازەقەڵا، نوێکار، ناشی، تازەتێوەچوو، تازەکوورە.

**مستجدي:** سوالکەر، گەدا، دەرۆزەکار، پارسەک، خوازۆک، لەتەچن، دەرکودۆر.

**مستحب:** شایانی خۆشەویستی، باش و پەسندکراو، خۆشویستراو.

**- غير مستحب:** خۆش لێ نەهاتوو، ناپەسەند.

**مستحدث:** تازە پەیدابوو.

**مستحسن:** چاک و پەسند، بەچاک زانین، ئافەرین لێ کردن، تەتە، ڕا لێ بوون.

**مستحضر:** ئامادەکار، کەسێکە داوای ئامادەبوونی کرابێ، ئاگادار، بەئاگا.

**مستحكم:** قایم، پتەو.

**مستحفظ:** لە یادگر، پارێزەر.

**مستحق:** شایان، لێوەشاوەوە.

**مستحلب:** دۆشیدەنی، دووشا.

**مستتر:** پۆشراو، پەنهان.

**مُستَتِم:** تەواو، داوای تەواوکار.

**مستثمر:** بەرهەم وەرگر.

**مستجلب:** کێشەر، داوای کێشانکردن.

**مُستَجمع:** کۆکەرەوە، کۆ، تەواو، کەسێکە بەهەموو چتێک و مەبەستی خۆی گەیشتبێ.

**مستجيز:** دەستوورخواز.

**مسترد:** دراوەوە، وەرگیراوەوە.
**مسترضع:** شیرەخۆرە، خواستەری شیردەر.
**مسترق:** بێ تین. کەم و کورِیدار.
**مستحي:** بەشەرم، شەرمێون، ڕووگیر، ڕوودەربایس.
**مستحيل:** دوور، لە نەبووان، هیچ نابێ.
**مستخبر:** وەلام وەرگر، وەلامپرس.
**متخلم:** لە (**استخدام**)دا بیدۆزەوە.
**مسخرخ:** دەرهێنراو.
**مستخرج:** دەرهێنەر.
**مستخف:** بەسووک تەماشاکراو.
**مستخلص:** ڕایی، ئازاد، ڕزگار.
**مستدام:** پایەدار.
**مستدبر:** سەرنجدەری ئەنجامی کار.
**مستدرك:** تێگەییو، پەی پێ بردوو، دەستکەوتوو، ئامادە.
**مستدعي:** پەلاتەر، ویستەر، داواکار.
**مستدلّ:** داواکاری بەلگە، بەلگەخواز.
**مستدير:** خڕ، گرد.
**مستّر:** داپۆشەر، پەنهانک.
**مستزاد:** پترکراو، لە ڕاوێژی زانیاری (**بديع**)دا هەلبەستێکە لە دوایی هەر پارچە (**مصراع**)یکی چەند وشەیێکی لە کێشی خۆی پتر بهێننەوە.
**مُستَسعد:** کەسێکە خۆشبین بێ، بەختیاری خواز.
**مستسقي:** ئاوبەند، کەسێکە ئاوبەند بێ، نەخۆشییێکە لە زگیدا ئاوی زەرد کۆ بوو بێتەوە.
**مستسلم:** خۆبەدەستەوەدەر.
**مستسهل:** پیس، گوواوی.
**مستشار:** ڕاوێژگەر، مامۆتک، پرس پێکراو، ڕاوێژکار.
**مستشرف:** بەرزهەلکەوتوو، دەسـتـەلاتدار، کەسێکە چاوی بڕیبێتە چتێکی .
مستشرق: ڕۆژهەلاتییەوان، ڕۆژهەلاتی ناس، خاوەرناس.
**مستشفى:** نەخۆشخانە، بیمارخانە، بیمارستـان، نەخۆشگە، مارستان.
– **مستشفى الاطفال:** نەخۆشخانەی منداڵان.
– **مستشفى الامراض الصدرية:** نەخۆشخانەی سینگ.
– **مستشفى الامراض العقلية:** نەخۆشخانەی هۆشیاری.
– **مستشفى العزل:** نەخۆشخانەی کلا، (بەولاوە).
– **مستشفى المجانين:** شێتخانە.
**مستشير:** ڕاوێژخواز.
**مستضعف:** بەلاواز لە پێنووسدراو، سست، گێل.
**مستضيء:** ڕووناکی خواز.

**مستطاب:** پاک و خاوێن، خۆشهاتوو.
**مستطرف:** تازە، نووێ، سەیر و واق وڕهێنەر.
**مستطعم:** دانەخۆرە، چەشەخۆرە.
**مستطلع:** کلک هەلگر، دوو هەلگر (بۆ ئەسپ).
**مستطيع:** توانا، دەسـتـەلاتدار، بەدەست و دوو، دەولەمەند، دەربەر، بەرگەگر.
– **غير مستطيع:** بێ دەستەلات، دەرنەبەر، بەرگەنەگر.
**مستطيل:** درێژکۆلە، لاکێشی، لاکێشە، درێژووکە، درێژووکەی چوارگۆشە، درێژووکانێ.
**مستظرف:** جوان، کەسێکە جوان و شۆخ هەلکەوتبێ.
**مستظل:** سایەنشین.
**مستظهر:** یارمەتی خواز، پشتویەناخواز.
**مستعار:** خواستراوەوە، دەستەوا، خوازتەمەنی.
**مستعان:** کەسێکە یارمەتی لێ خواسترابێتەوە.
**مستعبد:** بەندەگر.
**مستعجَل:** لە (**استعجال**) بیدۆزەوە، خێرا.
**مستعجَل جداً:** زۆربەپەلە، بەهەلەداوان، لەزکین.
**مستـعد:** ساز، ئامادە، لەبار، گەلالە، تەیار، کەمەربەستە، پەرداخ، ئەیقەز.
**مستعر:** خوازەرەوە، مالخوازەرەوە.
**مستعرَب:** بۆتە عەرەب، کەسێکە لاسایی عەرەبانی کردبێتەوە.
**مستعرب، مستعربة:** ئەو کەسەیە ببێتە عەرەب، ئەو کەسەیە لاسایی عەرەبان بکاتەوە، کەسێکە ناو عەرەبانەوە و بووبێتە عەرەب.
**مستَعصم:** پەنابەر، دەست لێدەر.
**مستعفي:** چاوپۆشی خواز، کەسێکە لە کارو فەرمان گۆشەگیری بخوازێ.
**مستعمر:** لە (**استعمار**)دا بیدۆزەوە.
**مستعمِل:** بەکاربەر.
**مستعمَل:** بەکاربراو.
**مستعير:** بەدەستەوا خوازەرەوە.
**مستعين:** یارمەتی خواز.
**مستغاث:** کەسێکە هاواری برابێتە لا.
**مستـعرِب:** کۆکم، بەسـەیر زان، سەرگەردان و سـەرسـوڕماوی هێنەر.
**مستغَرب:** سەیر، سەرسووڕماو.
**مستغرق:** سەرگەرم، تێوەچوو، خایەنراو.
**المستغرقة:** خایەنراو.
**مستغفر:** داواکاری بەخشین، کەسێکیشە پەشیمانی بکێشێ.
**مستغِل:** داگیرکار، بەکارهێنەر.

**مستغلة:** بەکارهێنراو، دەست بەسەرداگیراو.

**مستغني:** دەوڵەمەند، بێ نیاز.

**مستغيث:** یارمەتی خواز، کەسێکە داوای بەهاناگەیشتنێ بکات

**مستفاد:** سوود لێ وەرگیراو، ئاشکرا و دیارکراو.

**مستفر:** ڕاچەنیو.

**مستفرك:** بڕوانە (فریک).

**مستفسر:** لێپرس، پرسەر، پرسکار، وەڵام پرس.

**مستفيد:** سوودمەند، پڕێژ.

**مستفيض:** کەسێکە داوای بەهرو بەخشش بکات.

**مستقبح:** ناشیرین و خراو.

**مستقبل:** لە (**استقبال**) بیدۆزەوە.

**المستقبلة:** وەرگر لە (فیزیا).

**مستقر:** لە (**استقرار**) بیدۆزەوە.

**مستقل:** لە (**استقلال**) بیدۆزەوە.

**مستقيم:** لە (**استقامة**) بیدۆزەوە.

- **غير مستقم:** ناڕاست، نادروست.

- **المستقيم المماس:** هێڵی لێکەوت.

- **مستيقم السلوك:** ڕاستڕۆ، ڕاستکار.

- **المستقيم المتغير:** هێڵی بێ بار.

- **المستقيم المتوسط:** هێڵی ناوەند.

**المستيقمات المتوازية الثلاث:** سێ تەریبە هێڵ.

**مستقيماً:** یەکسەر، ڕاست و ڕەوان.

**مستكبر:** بەهەوا و فیز، خۆپەرست.

**مستكره:** ناپەسند، بێزوبۆلێکراو.

**مستل:** دەرهاتوو.

**مستلذ:** کەسێکە چتی خۆش و تامدار بخوازی.

**مستلم:** وەرگر.

**مستلزم:** ئەوەی کە پێویستی چتێکی ترە.

**مستلقي:** لەسەر پشت ڕاکشاو.

**مستمر:** لە سەرڕۆ، هەمیشەیی، درێژەدار.

**مستمراً:** هەمیشە، بەبێ بڕانەوە، پەیداپەی، پێدە، لێکدالێکدا.

**مستمسك (ج) مستمسكات:** لە (**استمساك**)دا بیدۆزەوە.

**مستملح:** بەتام، خوێدار.

**مستمع (ج) مستمعين:** گوێدێر، گوێدەر، گوێگر، بیستەر، گوێڕایەڵ.

**مستملك:** داگیرکار، کەسێکە دەستی بەسەر سامانێکی داگرتبێ

**مستملكه:** ئەوەیە کە کەوتبێتە ژێر دەستەوە.

**مستنبط:** دەرهێنەری چتێک لە چتێکی تر، لەمەبەس گەیشتوو بەهۆی زیرەکی و تێکۆشین و سەلیقەی خۆی.

**مستنجد:** یارمەتیخواز، ئازا، توانا.

**مستنجش:** بڕوانە (**مثور**).

**مستند (ج) مستندات:** لە (**استناد**)دا بیدۆزەوە، پاڵگە، بەڵگە، پاڵپشت.

- **مستند للجدار:** گوڵتە.

- **مستند اليه:** پاڵپێوەدراو.

**مستنسخ:** ڕوونووسەر، ڕوونووسیار، ڕوونووس، لەبەر نووسەوە، ڕوونڤیس.

**مستنصر:** یارمەتیخواز.

**مستنطق:** لێپرس، پرسیارکار، پرسەر.

**مستنقذ:** ڕزگارکار.

**مستنقع:** زێ، زوهۆر، زەنک، ئاوەزێ، زەنک، زڵقیاگ.

**مستنكر:** لالووت، لووتەلا.

**مستنكف:** گۆشەگیر، کەنارەگیر.

**مستنير:** ڕەوشەن بوو، ڕووناکیخواز.

**مستهام:** سەرگەردان.

**مستهان:** کەنەفت، بێچارە.

**مستهجن:** ناشیرین، ناپەسند.

**مستهزء:** گەمە پێکار، فشەکار.

**مستهل:** مانگی نوێ کە دەردەکەوێ، ڕووی گەش لەبەر شادمانی، هەوری بەبارش و سەرەتای بارانی وێ، فیڕن.

**مستهلك:** لەناوبەر، بەکاربەر.

**مستهلَك:** لەناوبراو، لەکارکەوتوو، تێچوو، زەبوون.

**مستوجب:** شیاو، شایان، لێوەشاوەوە.

**مستودَع:** ١- ئەنبار، عەمبار، جێگایەکە چتەکی تێدا هەڵگیرێ و تاقەت کرێ ٢- منداڵدانی ناو زگی ئافرەتان.

**مستودَع الماء:** ئەنباراو، عەنباراو.

**مستودِع:** کەسێکە چتی بەبارمتە و یا بەتەلپ (**أمانة**) لە جێگایەکی و یا لەلای کەسێکی دابنێ.

**مستور:** پەردەپۆش، داپۆشراو، پۆشراو، نەکەپووز، تانک، شلیماتک، شاریاگەوە.

**مستورد:** کەلوپەل هێنەر، ماڵ و سامان لە دەرەوە خواز.

**مستوردة (أموال):** هاوردە.

**مستوصف طبي:** تیمارخانە.

**مستوصف متنقل:** تیمارخانەی گەڕۆک.

**مستوطن:** نیشتەجێ.

**مستوفي:** ماف وەرگر.

**مستولي:** داگیرکار، چیرە، زاڵ، سەرکەوتوو.

**مستولى:** داگیرکراو.

**مستوى:** ڕاستایی، هاماری، خشت، تەخت، ئاست، بەرانبەر، پایە، ڕێک، ڕاست و ڕێک، ڕاست و دروست، ڕێکار، پلە.

- **مستوى البحر:** ئاستی دەریا.
- **مستوى الاختبار:** ئاستی تاقی کردنەوە.
- **مستوى الذكاء:** ئاستی زیرەکی.
- **مستوى الطالب:** پلەی قوتابی، ئاستی قوتابی.
- - **مستوى الماء:** پلەی ئاو.
- **مستوى المعيشة:** پلەی گوزەران.
- **مستوى النهر:** ئاستی زێ و ڕووباران.

**مسجد (ج) مساجد:** مزگەوت، مزگی، پەرستگە، پەرستنگە، کڕنۆشگە، کڕنۆشگا، مزگەفت، ماڵاخودێ، مزگت، نوێژگە، هۆرمزگان.
- **مسجد الحرام:** کابە (کەعبە).

**مسجّع:** وتە و ئاخۆتنی پاشبەندار.
**مسجِّل:** تۆمارەوەر، تۆمارکار.
**مسجَّل:** تۆمارکراو، دووسەرە، پێ ئەسپێرراو.
- **مسجِّل العام:** تۆمارکاری گشتی.

**مسجلة:** دەنگ وەرگر، تۆمارکار.
**مسجود:** کڕنۆش بۆ براو.
**مسجور:** پڕ و لێوڕێژ، دەریای پڕ ئاو، شیری پڕ ئاو، مرواری بەرستەوەکراو.
**مسجون:** بڕوانە (سجين).
**المسح:** ئەستڕین، کوژاندنەوە، ڕەشکردنەوە، پاک کردنەوە، سڕینەوە، سڕاندنەوە، خشکان، سڕین، سڕدن، سڕینەوە، لابردن.
**مسح الارض:** زەوی پێوان، ئەرپێڤانی، ڕووپێوکردن
- **مسح طبيّ:** بەسەرکردنەوەی پزشکی

**مسحاة:** بێڵی دار، پارو.
- **مسحاة خشبية:** بێڵی دار.
- **خشبة المسحاة:** کلکە بێڵ

**مسحق:** هاڕراو، وردوخاشکراو.
**مسحور:** جادوو لێکراو، تەفرەدراو.
**مسحوق:** لە (السحق)دا بیدۆزەوە، تۆز، هاڕراوە.
- **مسحوق الخبز:** سۆدەی نانی.
- **مسحوق الذهب:** زێرکفت.
- **مسحوق الشيء تماماً:** هاڕین، قرچەشکێن.
- **مسحوق الصّب:** هاڕراوەی دارژتن.
- **مسحوق القاصر:** هاڕراوەی ڕەنگبوێر.

**مسخَّر:** ڕام، کەوی، ماڵی، دەستەمۆ، ملکەچ.
**مسخرة:** سوویار، قەشمەری، قەشمەرجار، تیزەجاڕ، تیزەزارۆک، ئاواوۆک، پەند، تیتاڵی.
**مسخِّن:** گەرمکار، تینەدەر.
**مسداد:** پشک.

**مسدس:** دەمانچە، دەبانچە، شەش ئاگر، شەش لوولە، وەروەر. حەفت تیر، حەوت تیر، دەمانچە، شەش لا، شەش گۆشە. شەش سووچ.
- **مصلع المسدس والهنادق:** جەخسی.

**مسدود:** بەستراو، داخراو، تنووقاو.
**مسدول:** شۆڕ، شۆڕبووەوە.
**مسرة (ج) مسرات:** شادمانی، کەیفخۆشی، شادی، شایی، ساڵغی، دڵخۆشی، بسکە، دەماخ، دڵشادی، شەوق.
**مَسرجة:** چرادان، شەمدان، مۆمدان.
**مَسرج:** جێگەی زین پێداکردنێ، زینگیر سینگێکە زینی پێدا دەکرێ.
**مسرجة:** چراخان.
**مَسرح (ج) مسارح:** ١- لەوەڕگە، خارا، چێرەگە ٢- تەماشاخانە، کەڤانە، هەڵپەڕگە، (شانۆ)، چراخان، چراگە، سەماگە.
**مسرح:** شانە و چتێکی وایە پرچ و کاکۆڵی پێ دابێنن.
**مسرحية:** تەماشانامە، دەوور، پیس.
**مسرد:** درێشە، درەوشە.
**مسرع:** بەتاڵووکە، بەپەلە، هەڵەناوا، بەلەز
- **مسرع في المشي:** خۆشڕۆ، تیژڕۆ.

**مسرف:** لە (اسراف)دا بیدۆزەوە.
**مسرور:** لە (سرور)دا بیدۆزەوە.
**مسروق:** دزراو.
**مسری:** تەنێنەوە، گرەوە، ورمێ، نەخۆشی پێدرێژ.
**مسطح:** پان و ڕێک، سەربان کراو، داستای، سەربان داپۆشراو، هاماری، تەخت، خشت.
**مُسَطَّر:** نووسراو، قاقەزی دێغ کراو.
**مسطرة (ج) مساطر:** ڕاستە، ڕاستەک، ڕاسە، خەتکێش، ڕاستۆکە.
**مسطور:** خەتکێشراو، نووسراو.
**المسع:** کزەبا، زریان.
**مسعار (ج) مساعير:** سەرەبزووت، سەلکەبزووت، چزلووسک، کۆتەرە.
**مُسعِر:** شەڕ هەڵایسێن.
**مسعَر:** کەفچە.
**مسعر:** بلۆسک، مرازێکی ئاسنە لە ئاشی ئاوی بەکاردەبرێ.
**مَسعر:** کۆڵۆوەژ، بەراگر، کۆلەوەژ، کالۆری.
**مَسعود:** بڕوانە (سعید).
**مسعور:** هار، گەرم، مرۆی دێوانە و گەرما لێدراو و تینوو، کەسێکە زۆر چاوی لە دووی خواردن بێ ئەگەرچی زگیشی بای کردبێ.

**مسعى (ج) مساعي:** هەوڵ، خەبات، تێکۆشین، هەوڵ و تەقەلا.
**مسقاط:** بەراوێژ، بەراوێژنوو، بەرخەر.
**مسقط:** کەوتگا، کەوتگە، کەوتنگە، هەڵدێر.
- **مسقط الرأس:** شوێنەزا، زێد، زایینگە، مەڵبەند.
**مسقط (في الفيزياء):** کەوتگا.
- **مسقط الماء:** ڕێژگە، تاڤگە.
**مسقف:** دارەڕای سەربانکراو، سەربان داپۆشراو.
**المسقي:** بەراو، ئاوەنیا، ئاوی، ئاویە، ئاویژە، پاراو.
**الاراضي المسقية:** ئاویژە، زەویانی بەراو.
**مسك (ة):** مسک، مشک، چێتێکی بۆنخۆشە.
**مَسك:** ١- گرتن، گرتەی ٢- پەنابردن، خۆ پێوە هەڵاوەسین.
- **خشبة المسك:** نێرەژەن.
- **كثير المسك:** کرک.
- **إمسك:** بگرە، ها، هانێ.
**مَسكب:** ڕێژگە.
**المسكة:** کەرە، ڕۆنی کەرە.
**مُسَكِّر:** مەستی هێنەر، هۆشبڕ.
**مسكر:** شەکراو.
**مسكِّن:** دامرکێن، دامرکێنەر، ئارامیدەر، دەرددامرکێن.
**مسكن (ج) مساكن:** دانیشتگە، مەڵبەند، مەڵبەن، زێد، لان، ماڵ، شێنی، یاگە، مەڵوەند، نیشتگە، دالدە، نەوا، مەڵوەن.
**مسكوب:** ڕژاو، ڕێژراو.
**مسكوك:** لە سکەدراو، پووڵی لێدراو.
**مسكون:** دانیشتوو، دانیشتگە، جێگایەکە شوێنی دانیشتن بێ.
**مسكين (ج) مساكين:** بڕوانە (فقير).
**المسلاة:** سینەما.
**مسلاخ:** کراسەمارانە، توێژی، ماری، کیفی ماری.
**مسلّة (ج) مسلات:** سووژن، شووژن، گوندووش، گوچەوەنی، برووژن، جەواڵدروو، گوونووش، گنۆژ، پزووژن، جاڵدووز، گندۆش.
**مسلخ:** شوێنی کەوڵکردن، سەلاقخانە.
**مسلّط:** چیرە، زاڵ، دەستەڵاتدار.
**مسلفة:** ماڵە، مۆڵە، شڤنە، شنکینی، ماڵوو.
**مسلك (ج) مسالك:** ئایین، خوو و ڕەفتار، ڕۆیشتنگە، ڕێ و شوێن، ڕێ، ڕێگا، شێوە، ڕەوشت.
**مسلم:** مسوڵمان، مل کەچ، وەدووی ئایینی ئیسلام کەوتوو.
**مسلم:** سووتخۆر، مردەخۆر.
**مسلوب:** تالانکراو، داڕنراو، ڕووتکراو.
**مسلوق:** کوڵاو، پژاو، پەلوول.
**مسلول:** دیقدار، دەخەزدار، دەردەباریکەدار، سنگژاری، سییار، سیلدار.

**مسلّي:** دڵدەرەوە، دڵخۆشکەرەوە، خەمبەر.
**مسمار (ج) مسامير (ة):** بزمار، بسمار، مێترەباز.
- **مسمار الرجل:** مێخەکە، بزماری پێ.
- **مسمار القدم:** مێخەکە، بزماری پێ.
- **مسمار محوي:** بورغی، بورغوو.
**مَسمَع (ج) مسامع:** گوێ، گوێچکە، بیستنگە.
**مسمّن:** چەورکراو، قەڵەوکراو.
**مسماك:** کەپر، سابات، داڵیت، داڵووت، کەپری مێوان، چەفتە، چێتوبەس، داربەس.
**مسموع:** بیستراو، ژنەوتراو، ژنەوراو.
**مسموك:** بڕوانە (مسماك).
**مسموم:** ژەهراوی، ژاراوی، ژەهر خواردوو، ژەهرین، دەرمانخواردوو، دەرمانداوکراو.
**مسمى (ج) مسماة:** نێوبراو، ناوبراو، نێونراو، تایین، گۆرین، باسکراو، پێژنا، هەرەمە، وانیک، هێن، ناولێ نراو.
**مُسِنّ:** بەتەمەن، پیر، کۆنە پیاو، پیار، داکەوتوو.
**مِسَنّ:** هەسان، سان، سەوتان، هەستان، بەردەساو.
**مُسِنَّة:** نێنگوێنی دوو ساڵانەیە.
**مَسنَد (ج) مساند:** دیرەک، پشتەک.
**مُسنِد:** ڕاگر.
**مُسنَد:** پاڵدراو، هەڵپەسێراو، هەڵپەسێرراو.
- **مُسنَد اليه:** پاڵپشت.
- **مُسنَد كامل:** پاڵدراوی تەواو.
- **مُسنَد ناقص:** پاڵدراوی ناتەواو.
**مسنّن:** ساوراو، تیژکراو.
**مسنِّن:** ددانساز، تیژکار.
**مسهل:** دەرمانی ڕەوانی، ڕەوان، زگچووێن.
**مسواة:** ڕەندی دارتاشان.
**مسواك (ة)** ١- پووش و چیلکەی ددان ئاژنینەوە، سیواک (لە سوونەوەیە)، ددانشۆر، فلچەی ددان شوشتنی، فرچە، دیان پاکەوکەر ٢- گوێنی، گێنی، گینۆ.
**مسودة:** ڕەشەک، ڕوونووس، ڕوونڤیس، سەواد، ڕوونویس، ڕوونویشت.
**مسور:** جێگای بازنە، بازند، مەچەک، زواندە.
**مسوس:** کرمێ، کرماوی، کرمن.
**مسؤول:** بەرپرس، پێناودار، بەرپرسیار، لێپرسراو، وەباڵ بەستۆ
**المسؤولية:** ئۆباڵ، لەملێ، پێناوداری، گێچەڵ، لێپرسراوی، وەباڵ، ئازربیان، بەرپاری، لێپرسینەوە، پێناوداری، بەرپرسیاری، بەرپرسی.
- **الشعور بالمسؤولية:** هەست بەبەرپرسیاری کردن، هەست بەلێپرسینەوە کردن.

**عدم المسؤولية:** بەرسووکی، بارسڤکی.

**- عديم المسؤولية:** بارسووک، بارسڤک.

**مسيح:** ١- کەسێکە بەرۆنی پیرۆز هەنوابێ ٢- پارچەپێک لە زێو و زێڕ ٣- زۆرپەڕ ٤- زۆرگەڕۆک ٥- ناوبانگی عیسا پێغەمبەرییە (د).

**مسيحي:** فەلە، فەلەھ، دیان.

**مسيحي الاصل:** بنەفەلە، بندیان.

**المسيحية:** فەلەییتی، دیانی، کێلۆ، ئایینی عیسایی.

**مسيء:** بەدکار.

**مسيخة:** مالی سواخێ، هەریی.

**مسير:** ١- ڕاگە، ڕێواز، ڕێباز، شوێنی پێدا ڕۆیشتن ٢- کاراژ (کاراج) شێلگر.

**مسيطر:** زاڵ، جڵەوکێش، قەڵەمڕۆ، چیرە، دەستەڵاتدار، توانا، دەستەڵاتدار.

**مسيعة:** مالەی سواخێیە، هەریی.

**مسيف:** کوڕمردوو، زگسووتاو.

**مسيل:** لافاوگە، سێلاوگە، سێلکا، کەند، کەندەڵان، ناوەڕۆ.

**مشّاء:** ١- کەسێکە زۆر بەرێگایەدا بڕوات ٢- پاشدوو، دووڕوو

**مشابه:** هاوتا، وێچوو، لێکردوو.

**مشابهة:** وێچوون، لێکردن.

**مشاة:** پیادە، بەیار، پەیادە.

**مشاجرة:** پیلە، بەربەرەکانی، داروگیر، قڕە، جەنگ، شەڕ، دنگەشە.

**مُشار:** ڕبک (**اشارة**) کراو.

**مشارك:** بەشدار، هاوبەش

**- المشارك في السر:** هاوڕاز، هامڕاز.

**- المشارك في اللغة:** هاوزمان.

**مشاركة:** بەشداری، هاوبەشی، نیوەکاری.

**- المشاركة في الحياة:** هاوسەری، هاوسەنیری، ئامسەری.

**- المشاركة في السر:** هاوڕازی، هەمرازی.

**مُشاش (ج) مشاشة:** زەوی نەرم، بنچینە، پشوو، سرووشت، خوو، نۆکەر.

**مشاط:** شانەکار، شەکار.

**مشاطة:** ١- ڕازینەوە، ڕوخسار بەهەنیە هەڵگر، ئافرەتێکە بووکێ برازێنێتەوە ٢- بەربووک، پۆرسپی، پاخەسوو

**مشاطة الصوف:** شانەی خوری

**مشاع:** ئاشکرا، بڵاو، بەش نەکراو، سامانێکە لە نێوانی دوو یا چەند کەساندا بەش نەکرابێ

**مشاعر:** هەستەکان

**مشاعرة:** هەڵبەستێن، بەربەرەکانێتی یەکتری بەهەڵبەستان کردن

**مشاغب:** ئاشووبگێر، سەربەگێچەڵ، بزوز، گێرەشێوێن، پشێوکار، گرۆز، ئاژاوەگیر، ئەڤەجان، هاروهاج

**مشاغبة:** پشێوکاری، گێرەشێوێنی، گێچەڵ و پشێوی.

**مشاغرة:** ژن بەژنە، ژن بەژن کردن، ژناوژن، ژنوازن.

**مشافهة:** ڕووبەڕوو ئاخۆتن و وتووێژ کردن.

**مشاكس:** لاسەر، بەدکار.

**مُشاكل:** وەکو، وێچوو، هاوچەشن، ناوی یەکێکە لە دەریایەکانی هەڵبەست لەسەر کێشی: فاعلاتن، مفاعیلن.

**مشام:** بۆنگە، دەماخ، کەپۆ، لووت.

**مشاهد:** بینەر، چاوپێکەوتوو.

**مشاهدة:** چاو پێکەوتن، دیتن، بینین.

**مشاهرة:** مانگانە بەمانگانە بەکرێ گرتنی کەسێکی.

**مشاور:** ڕاوێژەر، وەزیر، ڕاوێژیار، تەگبیرکار.

**مشاورة:** تەگبیر پێکردن، ڕاوێژ، واتەو ویرە.

**مشاية:** ڕەوڕەوە.

**مشايع:** وەرێخەر، کەسێکە وەدووی کەسێکی تر بکەوێ یا میوان و یا کەسێکی بەرێ بکات.

**مشايعة:** بەرێکردن، هاوکاری، بەشوێن کەسێکی ڕۆیشتن، میوان یا کەسێک بەرێ کردن.

**مُشبَع:** تێروپڕ، تێرکراو.

**مشبَك:** نێرە و مێیە لە جیاتی دوگمە بەکاردەبرێ، تۆڕدار، کونکون.

**مُشبَّه:** لێچوون، لێکردن.

**المشبه به:** لەوچوون، لەوکردن.

**مشبوه:** ئەنت و پەهت، چاڤ زوورک، بۆن لێهاتوو، چاڤ زۆرک

**مشتاق:** ئارەزوومەندی دیدار، بەتاسووخ، بەداو و دڵ، بینەکار، کەڵکەڵەدار، مرێکا.

**مشتت:** بڵاو، پەرێشان.

**مشتت الرأس:** دوودڵ، نیگەران.

**مشتبك:** ئاڵۆز و تێکالاو.

**مشتبه:** دوودڵ، نیگەران، نادیار، تێکەڵاو، دووگومان.

**مشتت:** پەرگەنە، پرش، پەرش و بلاو، پرش و پەشێو، ولاو، داخان، پرژ، تارومار، تەخشان، تەخشان و پەخشان، پەریشان، شێواو.

**مشتدّ:** سەخت، قایم، پتەو.

**مشتر:** بڕوانە (**مشتري**).

**مشترك:** دووکۆیی، دووبەشی، هاوبەشی.

**مشترَك:** هاوبەش، بەشدار، نیوەکار، هاوکار، هەڤپا، لف، هەڤبەهرە، هەڤ، هەمپا، پشت هەڤ، ناوکۆیی لە (جەبر)دا.

**المشـتـري:** ١- كـرِيار، بكڕ، سـەنيـار ٢- بەرجـيس، هۆرمـز، هۆرمزد، پەرجس. ناوی ئەستێرەيێکیيە و ناوی مـانگێکیشە ١٢٣٠ هەندی زەوییـە و لە ١٢ سـاڵاندا جـارێکی بەدەورەی خۆرێ دەگەرێ.

**مشتعل:** داگیرساو، هەڵايساو، گەش، تاييساو، ڕەوشەن

**مشتغل:** خەريک، لەگۆ، کاردار، لەکارەوەچوو، خاوەندکار.

**مشـتق (ج) مشـتـقات:** پارچەکراو، شـەق کـراو، خـورده، زاد، بەرهەم لێ دەرهێنراو.

**مشتقات:** دەرهێنراو.

**مشتقات الفعل:** پارچەکانی کردار.

**مشـتكي:** گلیـڤـان، دادخـواز، گلەيی کـار، گـازاندۆک، داخـواز، گلەمەند، گاندەکار، داواکار، کەنێ، زاڵەبەر، کومکافر.

**مشتكي عليه:** داد لەدەست کراو، گازاندە لێ کراو.

**مشتل (ج) مشاتل:** شەتڵگا، شەتڵجار، شەتڵزار، باخڵە.

**مشتمل:** داگر، گیرەوە.

**مشتهر:** ناويانگدار، بەناويانگ.

**مشتهي:** بەئیشتیا، بێزوودار، ئیشتیاکار، مگێزدار.

**مشتهيات:** ئەوانەی خوازتراونەوە و ئارەزوو کراون.

**مشتوم:** جنێو پێدراو.

**مشتي:** زستانەوار، قشلاخ.

**مشجب:** سێپایەی وێنەگرتن و چەک و ئیتر.

**مَشجر (ج) مشاجر:** دارستان، پرداروبار، لێر، لێرەوار.

**مشجَّر:** گۆڵگوڵ، گوڵگوڵی، گوڵدار، پر دارودرەخت، وەکو دار، ڕازاوەوە.

**- مشجر السپسهان:** کفرجاڕ.

**مشجِّع:** هاندەر، تاودەر، گاڵدەر.

**مشحذ:** هەسان.

**مشحط:** قايەی مێوی، داڵیت، داڵووت.

**مَشحوب:** ڕەنگ هەڵبزرکاو.

**مشحون:** پر، تژی، بارکراو، داگیراو، پرکراو.

**مشخرة:** شەغرەکێش.

**مشَخِّص:** گەورە و دیار، بژاردەکراو.

**مشخَّص:** دیارکراو، بەدی کار، بژارکار.

**مشدَّد:** ١- سەخت و قايم ٢- پیتێکە گیرە (**شدّه**)ی هەبێ.

**مشدود:** بەستراو.

**مشدوه:** کاس، وڕ.

**مشلَب:** تەوەرداس.

**مَشرب (ج) مشارب:** ١- چتێکە بەپێی ئايین بێ ئاوخۆرگە، جێگای ئاو لێ خواردنەوە. ٢- خوو، ڕەفتار، ویستی هولمان (نفس).

**مشربة:** ئاوخۆری، لێوان، جامۆڵ، شەربە.

**مشرح:** نەشتەرکار.

**مشرَّد:** بێ نەوا، دەربەدەر، پنتی.

**مشرط:** نەشتەر، نیشتەر.

**المُشرع:** یاسادانەر، دەستووردانەر.

**مشرف (ج) مشارف:** لە (**اشراف**) بیدۆزەوە.

**مشرق (ج) مشارق:** بڕوانە (**شرق**)

**مـشـرك:** گـاور، لە ئايين وەرگـەڕاو، کـەسـێکە ددان بەتاک ر تەنیایی خودای نەهێنێ.

**مشروب (ج) مشروبات:** خواردەوەمەنی، خواردنەوەمەنی

**مشروح:** کراو، ڕووناک کراوەوە، ڕاڤە

**مشروط:** پەیمان لەسەردراو، بڕیار لەسەردراو

**مشروطة:** لە (**شرط و شروط**)دا بیدۆزەوە

**مشروع (ج) مشاريع:** کارنامە، پرۆژە، گەڵاڵە، دەست پێکراو، ئەوەی کە ئايين بەرەوای بزانێ.

**المشروعات الخـيرية:** پرۆژەکـانی چاکـە، کـاردار لە کـارەوە چوو، خاوەندکار.

**مشز:** نەنگین

**مشط (ج) مشاط وامشاط:** شانە، شەه، شە، شەهک، شەرشەه

**- مشط صغير:** شەهک

**- مشط الصوف:** شانەی خوری

**- مشط القدم:** شانەی پێ، شانەی پەنجەی پێ

**- مشط اليد:** شانەی پشتی دەستی مرۆیان

**مشط مشطاً:** شەکردن، شانەکردن

**مشطور:** دووفاق

**مشع:** تیشکدەر، تیشکدەرەوە، تیشکەوەر.

**مشع:** خرماندن

**مُشعَبَذ، مشعوذ:** تەردەست، چاوبەست، فێڵباز، ساختەکار.

**مُشعر:** هەستدەر، ئاگادەر.

**مشعشع:** ڕەوشەن، درەخشان، سێبەری ڕوون و بلاو و تەنک.

**مشعل:** داگیرسێنەر، هەڵگیرسێنەر، هەڵگیرسێن، ئاگر هەڵکەر.

**مشعل النار:** ئاوورهەڵکەر.

**مَشعل (ج) مشاعل:** چرادان، ساپلیتە، سووکە چرا، قەندیل، مەخشەڵ، مەشخەڵ، ئاوورگ، ئاگردان.

**مشعوف:** کەيفخۆش، خۆشحاڵ، شەيدا، دڵبراو، شاد، دڵشاد، شادمان.

**مشعول:** هەڵکراو، پێکراو، ئاييساو، داگیرساو.

**مشغلة (ج) مشاغل:** کاروبارێکە مرۆی بەخۆوە خەریک کات و نەپەرژێتە سـەر ئیشـێکی تر، لەگۆی، سەرقاڵی، ڕەنج، ئەرک، خەریک.

- **كثرة المشاغل:** بارگرانی، سەرقاڵی.
- **كثير المشاغل الفكرية:** سەرپڕ.

**مشغول:** خەریک، لەگژ، سەرگەرم، گژوویژ، پێگرتی، خووەیی، لەزگ، سەرقاڵ، لە کارەوەچوو، بەکار، سەرجەنجاڵ، سەرگەرم

- **مشغول بكثرة المشاغل:** سەرگەرم، سەرپڕ، سەرجەنجاڵ.

**مشغولية:** پڕکاری، سەرپڕی، سەرقاڵی، پەژارە.

**مُشفق:** دڵسۆز، میهرەبان.

**مشقّة (ج) مشقات ومشاق:** ڕەنج، دەردەسەری، کێشە، مەینەت، سەخت، ئەرک، دژواری، ئازار، دوخشاری، سەخڵەتی، تاڵی.

**مشقّق:** هەڵدڕ، هەڵبڕ.

**مشقّق:** قەڵەشت قەڵەشت، ترەکاو، قەڵەشاو.

**مشقوق:** دڕاو، هەز، پارچەکراو، دڕیاو، قڵیشاو، تلیشاو، هەڵدڕاو.

**مشكاة:** ١- پیرسۆز ٢- تاقە، کولێن، خولانکە، تاقچە، دەلاقە، خەلانکە، داق، شوێنێکە چرای لەناو و یا لەسەر دابنێن.

**مشكل (ج) مشاكل:** سەخت، دژوار، گران، ئاستەم، کاری سەخت، گۆنگ، پچەڕ پچەڕ، ستەم، دوخشار.

**مشكّل:** بەقەلافەت، بەتەن و مەن.

**مشكلة (ج) مشاكل:** دژواری، سەخت، دژیا، پێسیر، کۆتەک، تێگیر، گیروگرفت، کۆلێژە.

**مشكوك:** جێگای گومان، دووبەختی، جێگای نیگەرانی.

**مشكور:** سوپاسکراو، پەسندکراو.

**مشلة:** گەردن بەس، گەردن بەند، ملبەند.

**مشلول:** شەپلە لێدراو، ڕەقیتە، ڕێنجۆ، کەسێکە دەست و لاقێکی لەکار کەوتبێ، شان، شەحتۆبووی.

**مشكوك:** خۆیەبەخت، لە گوماندا، ئەنجام نادیار.

**مشمر:** لە (شمر)دا بیدۆزەوە.

**مشمّر:** هەڵدەرەوە، قوڵ و یاداوێن هەڵکر.

**مشمئز:** بێزار، هەراسان، لۆس، وەڕەز، کەوەڕێ.

**مشمس:** خۆرەتاو.

**مشمش:** قەیسی، مژمژە، زەردەڵوو، شلانە.

**مشمش جبلي:** هلالک.

**مشمع:** میواوی، مۆماوی، مۆمین، مشەما.

**مشمول:** داگیراو، داگیرکراو، بەرکەوتوو، وەبەرکەوتوو.

**مشموم:** بۆنکراو، هەست پێکراو.

**مشنقة (ج) مشانق:** خنکاندنگە، سێدارە، قەنارە، سێ پێک، سەهیا.

**مشنوق:** خنکێنراو، خنکیاو.

**مشة:** نیشتیاکەرەوە، نیشتیادەر.

**مشهاب:** سەلکە بزووت.

**مشهد (ج) مشاهد:** ئاسوگە، کۆمەڵگە، شوێنی دەست لەملدان

**مشهود:** دیتراو، بینراو، ئامادەکراو.

**مشهور (ج) مشاهير:** نێوبانگدار، نێودار، ناڤدەنگ، خووەیناف، ناڤدار، دەنگانە، بەناو، سەروەدەر، بەناوبانگ، ناودار، دەنگینی، بەنێوبانگ، ناسراو، دەنگین، ڕەمۆ.

**مشهّي:** نیشتیادەر، ئارەزوو نیشتیا و هەوا و هەوەس هێنەر، دڵبەر، نیشتیاهێنەر، دلڤەکەر.

**مشواة:** شیشەی کەبابی.

**مشورة:** تەگبیر، ڕاوێژ، بیروڕا دەربڕین.

**مشوش:** ئاڵۆز، پەژێو، ڤێزە، چەواشە، ئاڵووز، شپریو، زڵفیاگ، داچڵەکاو، پەشێو، پشێو، تێکچوو، تێکەڵ و پێکەڵ، شل و شۆڵ، شلووق، شپرزە، ژوولیاگ، شڵەژاو، پەشێواو، شێواو، پەرێشان، گێرە.

**مشوش البال:** نیگەران، دوودڵ.

**مشوّق:** هاندەر، فیتدەر.

**مشؤوم (ج) مشائيم:** بڕوانە (شۆم و شووم).

**مشوّه:** شێواو، شڵەژاو، پەشێو.

**مشوي:** برژاو برژیاو، بریانی.

**مشي، مشية:** چوون، ڕێکەوتن، وەڕێکەوتن، ڕەوت، ڕەوانەبوون، پەیاداری، ڕێگە ڕۆیشتن.

- **المشي بدون انقطاع:** گاتەگات.
- **مشي الطفل بعد الحبو:** پێگرتن، پێ هەڵگرتنی منداڵ.
- **مشي القبج:** قندقن، ڕەوتی کەو.
- **اسلوب المشي:** شێوەی ڕۆیشتن.
- **بطيء المشي:** سست، کەمرەوت.
- **تعلم الطفل المشي:** پێگرتن، پێپەهەڵگرتنی منداڵی ساوا.
- **سرعة المشي:** تیژڕۆیی، خۆشڕۆیی.
- **سريع المشي:** تیژڕۆ، خۆشڕۆ، بەزۆک، تیژڕەوت.

**مَشي:** ڕۆیشتن، ڕێگەڕۆیین، ڕێگەبڕین.

- **مشياً على الاقدام:** بەپێ، بەپێیان.

**مشيب:** پیری و مووی سپی.

**مَشية:** پیاسەکردن.

**مَشيئة:** خوازتن، ویستن.

**مشيخة:** پیرێتی.

**مشيّد:** بڵند، بەرزکراوەوە، هەڵچنراو.

**مَشيد:** گێچکاری کراو، ئەوەی کە بەگێچ یا قسڵ سواخ درابێ.

**مشير:** ڕێک کار، تەگبیرکار.

**المشيط:** بنکر.

**مشيعة:** سەوقانی، چنگڵە.

**مشَيعة:** کوولەکەی ئاوی وشک

**مَشيمة (ج) مشائم:** ١- پسدان، پزدان، م.ندالدان، ئاوالدان، سەراو، یاوەر، یاوەری، هاوالـمندال ٢- ئەو پیستـە تەنکەیە کە لەگەڵ منداڵی دێتە دەرەوە.

**المصّ** (ە): مژین، مژتن، هەڵمژین، هەڵچنینی ئاو، ملـچاندن، مین، چلپاندن، ڤەمستن.

**مص السجّاير:** قوم لە جگەرەدان، مژ لە سیغاردان.

**مُصّلب:** ڕشکن.

**مصاب:** هەنگواو، پێکاو، گرفتار، ئەنگێوراو، تووشهاتوو، ئەنگافتراو، گیرۆدە، ئەنگۆتراو، پاگیر، گرفتار، دووچار، تێ ئالاو، بەرکەوتوو.

**- مصاب بالربو:** تەنگە نەفەس، پشووسوار، تووش بەرهەنگداری هاتوو.

**- مصاب بالروماتیزم:** بادار، ڤادار.

**- مصاب بحصر البول:** میزگیراو، میزەسرینەک.

**- مصاب بضربة الشمس:** تاوگاز، هەتاوبردوو.

**مصابرة:** هێمنی.

**مصاحب:** هاوڕێ، برادەر، هاواڵ، هەمڕا، هاوودەم، ڕێهەڤ، هەڤڕەه، هەمدەم، هاودەم، ئامتا.

**المصادر العضوية:** زیندە سەرچاوەکان، سەرچاوە ئۆرگانییەکان.

**مصادر المواد:** سەرچاوە، سەرچاوگە، زێدەر چاوگە، بنیات.

**مصادرة:** دەست بەسەر ماڵی کەسێکی داگرتن.

**مصادف:** تووشهاتوو، تووشی یەکتری هاتوو، تێکهەڵەنگووتوو، تووشیار، دووچار، ئادقە.

**مصادفة:** پێک گەیشتن، تووشی یەکتری هاتن، دووچار بوون، تووشیار بوون.

**مصادقة:** لەگەڵ کەسێکی دۆستایەتی کردن، لە ڕووی دڵپاکێتییەوە لەگەڵ کەسێکی دۆستایەتی و پەیمان بەستن.

**مصادم:** کەسێکە یا چتێکە لە یەکێکی تر هەڵەنگوێ و یالێک بدەن و لەو هەرایەدا ڕەنج و ئازارێک ڕوو بدات.

**مصادمة:** لێکدان، تێکهەڵەنگووتن، لکووماندن، بەرگی بوون.

**مصارع:** زۆرانی گر، زۆرەوانی گر، زۆرانی باز، تۆکەرانێ، تێکوەرانێ، تێرووچانک، خۆلێکدانێ، بنچەنگانێ، زۆرانێ، زۆرانبازی، زۆرمەزمێ، زورمەزمێ.

**مصارعة:** زۆرەوانی، بچەنگانێ، مل ملانێ، زۆرانێ، زۆرەبانێ،

**مُصاص:** ڕاز، نهێنی، کرۆکی چتی.

**مَصاف:** مەیدانی شەڕێ، شوێنی ڕێزبوونێ.

**مصافحة:** دەست لە دەستی یەکتری نان، دەستی یەکتری کوشین، دەسدان، چوونە دەستی یەکتری.

**مصالة:** بەشیری لێکدان، هەڵبەست کەسێکی بەبێ دەست لێدان.

**مُصالح:** ئاشتیخواز.

**مَصالح:** بەرژەوەندی، چاکە.

**مصالحة:** لەگەڵ یەکتری ڕێک کەوتن، ناکۆکی لابردن، ئاشت بوونەوە، ڕێک کەوتنەوە.

**مصاهرة:** بوونە زاوا، لەگەڵ کەسێکی خزمایەتی کردن بەژن دان و یا ژن لێ خوازتن.

**مَصب (ج) مَصابّ:** لە (صبّ)دا بیدۆزەوە.

**- مصَب الماء:** ڕێژگە.

**- مصب ماء الرص حیث یتلاقی مع الفلكه:** دۆزەقە.

**مصباح (ج) مصابیح:** چرا، لامپا، لەمپا، لالە، لەمپە.

**مصباحية:** دیان، ڕۆڵە، دانوولە، چێشتێکە بەبۆنەی دەرچوونی ددانی منداڵان لێدەنرێ.

**مصبغة:** ڕەنگرێژخانە، خمخانە.

**مصبغة النيلة:** خمخانە، هەشخانە.

**مصبوغ:** ڕەنگ کراو، ڕەنگ کریاگ.

**مَصَح:** لە (صحة)دا بیدۆزەوە.

**مصحح:** هەڵەلابەر، هەڵەبڕ، بیرازکار، وەڕاستکێڕ، بیرازەوان.

**مصحف (ج) مصاحف:** لە (صفحة)دا بیدۆزەوە.

**مصداً:** ژەنگاوی.

**مُصَحِّف:** کەسێکە لە کاتی خوێندنەوە و یا نووسینیدا چەند وشەیێکی بە بەسەرچوون و یا بەهەڵە بگۆڕێ.

**مصداق:** کەسێکە یا چتێکە کە ڕاستی گۆتنی کەسێکی تر ساخ و ڕوونکاتەوە.

**مصدر (ج) مصادر:** سەرچاوە، چاوگە، بنج و بناوان، ژێدەر، کانگا، بنیان، بنیات، ماکدەر، بنگە، چاوە، کانگە، بنگا، بن و بناوان،بنگەه، سەرچاوگە.

**مصدر العمل واصلها:** بنج و بناوان.

**المصدر المذكور سابقاً:** سەرچاوەی ناوبراو.

**مصدرة:** نارده، هەنارده.

**مصدَع:** زیرەک، زرنگ لە کاروباراندا.

**مُصدِّع:** سەرئێشەر، مایەی سەرئێشە.

**مُصدِّع الحمص:** لەتکەنۆک، لەپە.

**مصدّق:** باوەڕکار.

**مصدَّق:** باوەڕ پێکراو، باوەڕمەند.

**مُصِرّ:** پێداگر، ڕکەگر، براندۆغ، ڕقن.

**مصر (ج) امصار:** ١- تیخە، سنوور، شوورە، ٢- بە وڵاتی مصر و شاری قاهیرەش دەڵێن مصر ٣- شار، بازێڕ.

**مصر مصراً:** هەڵدۆشین، بەقامکی دۆشین، دادۆشین.

**مصراع (ج) مصاريع:** لنگە بەیتێکە، لەتکە بەیتێکە.

**مصران:** ڕیقی، ڕیڤیک، ڕۆڤی، ڕیخۆڵە، ڕیخەڵوو، ڕیخەڵۆکە، ڕۆدی، ڕووڤیسۆر، ڕووخەڵە، لیخەڕوو، پنۆر، بزوور.

**مصران الاعور:** ڕیخۆڵە کوێرە، ماسوولکە کوێرە.

**مصرِح:** درکێنەر، درکێن، پێ لێنەر.

**مصرع:** خشتە، مەیدانی کێشە و سەرێشە.

**مصرف (ج) مصارف:** چوانگە، گۆڕینگە (بانک).

**- مصرف الرهون:** گۆڕینگەی بارمتە.

**- مصرف العقاري:** چوانگەی زەوی و زار و خانووبەرە و ساختمان، گۆڕینگەی ئاقاری.

**مُصرِف:** دەست بەقرپ، دەست بڵاو، بڵاوکار، لەبەرد دەر، دەس بەردەس، دەست شڵپ، دەست بەلاڤ، پێ پانەر.

**مصروع:** فێدار، فێ لێ هاتوو، لێوەدار.

**مصروف (ج) مصاريف:** چوواو، ئەوەیە کە چوودانداراوێ و یا چووێ، بەکاربراو، ڕەنێوهێنراو، دەرچوون.

**مصطاف:** هاوێنەخۆر، هاوینەوەر.

**مَصطبة:** سەکۆ، کورسی، سندانی ئاسنگەران، میخ سندان، زندان، زنان، سدان، سندیان.

**مصطفى:** بژاردە، هەڵبژێردراو، هەڵبژاردە.

**مصطلح، مصطلحات:** زاراوە، زاراڤ.

**مصطنع:** داتاشراو، دەستکرد.

**مصعب (ج) مصاعب:** سەخت، گرفتاری.

**مُصعَب:** نێرە ئەسپێکە هێشتا سواری نەدابێ و نەخرابێتە ژێر بارەوە.

**مَصعد:** ڕەوانی، سەرخەر، بڵندکار.

**مصغّر:** گچکە کراوەوە.

**مصغي:** گوێدەر.

**مَصف:** شوێنی ڕیز و تیپ بەستن.

**مصفاة:** لە (تصفية و صفي) بیدۆزەوە.

**مصفّر:** لە (صفر صفراً) بیدۆزەوە.

**مصفور:** بڕوانە (صفير).

**مصفور المدور:** مارانی.

**مُصفّى:** پالاوتە، پالافتە، پالافتراو، پاڵێوراو، پاڵراو، پالاوتراو، پاک و خاوێن.

**مَصفى (ج) مصافي:** پالاوتگە، پالافتگە، پاڵنتگە.

**مصقّل:** مشت و ماڵدراو.

**مصقلة:** لە (صقل)دا بیدۆزەوە.

**مصقول:** مشت و ماڵدراو، مشت و ماڵکراو، ڕەونەقدارکراو، زاخاودراو.

**مصكوك (ج) مصكوكات:** لە سکەدراو (پووڵ).

**مصل:** ماک.

**مصل الدم:** ماکی خوێن، زەرداوی خوێن (پلازما).

**مصلّح:** چاک کەرەوە، بیرازکار، بیرازەر،، بیرازەوان.

**مصلح:** ناوبژیکار، ئاشتیکار، ئاشت کەرەوە.

**مصلحة (ج) مصالح:** بڕوانە **صلاح**.

**- مصلحة المبايعات:** بەرژەوەندی بازارگەری، بازارداری.

**مصلوب:** خنکاو، هەڵاوسراو، لە سێدارەدراو.

**مصلصل:** زرینگاوەوە، زرنگیان.

**مَصلى:** نوێژگە، مزگەوت.

**مصلي:** نوێژکار.

**مصمّم:** بڕیارکار، بڕیاردەر، هەرێکار.

**مصنع (ج) مصانع:** کارگە، کارخانە، دەسگا، دەستگا، دەزگا.

**مصنّف:** ١- ڕێزکار، چین بەند، دەستە بەندی کار ٢- دانەر، پەرتووک دانەر.

**مصنوع:** دروستکراو، کراو، کردە، ساختە چێکری.

**- مصنوع يدوي:** دەستکرد، دەسکر، دەست چێکری، دەسکار.

**- المصنوعات الشخصية:** خۆکرد.

**مصنوعي:** ساختەگی، دەسی، دەشرەن، دەسهەڵبەس.

**مصوّب:** بەچاک زانراو، قۆڵ لەسەر کێشراو.

**مصوته:** دەنگدەر.

**مصوّت:** بانگکار، گازکار، دەنگدەر.

**مصوّر:** وێنەگر، وێنەکێش.

**مصون:** پارێزراو، نۆبەت لێ کێشراو.

**مصيب:** ئەنگێوە، ڕاستکار، ڕاستبێژ، ئەنگێو، نیشاندار.

**- أنت مصيب:** تۆ ڕاست دەکەی.

**مصيبة (ج) مصائب:** مەینەت، وەیشوومە، کارەسات، پەتەر، ئاسیو، چەل، شوورەت، پەند، قۆرت، کەڵەمە، رووشە، گێچەڵ، تەڵەزگە، وەی، گەزەنە، گرداو، ئاپۆرە، مەخسەرە.

**مصيد (ج) مصائد:** لە (صيد)دا بیدۆزەوە.

**مَصير (ج) مصران:** ڕیخۆڵە، پزوور، ڕیڤی، ڕیخەڵۆک، ڕیخەڵوو، ڕۆدی، ڕووڤیسۆر، ڕووخەڵە، ڕنێوی، لیخەڕوو، پنسۆر.

**مصير:** ئەنجام، چارەنووس، دوایی کار.

**مصيف (ج) مصائف:** هاوینەهەوار، هاوینگە، زۆزان، هاڤینگە، وار، بانەمەڕ، کوێستان، ئێلاخ، هەوارگە، بانە، خوەشوار، شوونوار، کویسان، کێووستان، هاوینگا.

**مض:** بۆڵە، پرتە، کوتە، ورتە.

**مضاجعة:** هاوسەنیری، پێکەوەنوستن.

**مضاحكة:** پێکەوە پێکەنین و فیق و هۆڕکردن، پێک پێکەنین.

**مضاد:** دژ، نەیار، جیاواز، لێک جیاواز.

**مضاد الحياة:** دژە ژیان.
**مضادات الحياة:** دژیان، (دژە ژیان).
**مضادة:** دژی یەکتری جوولانەوە.
**مَضارّ:** بروانە (**مضرة**).
**مضارب:** لێدەر، لێکدەر، بکوێ، ژەن.
**مضاربة:** لێکدان، شەڕەبۆنێ.
**مضارع:** وێچوو، وەکو، کردارێکە سەردەمی ئێستا و دوارۆژ نیشان بدات، ناوی یەکێکیشە لە دەریایانی هەڵبەست، لەسەر کێشی **مفاعیلن فاعلاتن مفاعیلن.**
**مضاف:** تێوەدەر، پالڤدار، وەپالدەر.
**- مضاف اليه:** وەپالدراو، پالڤدێر.
**مضاعف:** لە (**ضعف**)، (**ضعاف**)دا بیدۆزەوە.
**- المضاعف المشترك:** چەند جارەی هاوبەش.
**مضاعفة:** دوو چەندانە کردن.
**المضاعفات (للامراض):** ماک لێ پیسکردن، درژانگ، ماکەکان لێ پیسکردن.
**المضايقة:** سەختگیری کردن، تەنگاوکردن، درێخی، درێغی، کۆتایی.
**- المضايقة في الدين وغيره:** هەڵچنین.
**مضبطة (ج) مضابط:** هەڵنامە، بڕیارنامە.
**مضبوط:** ڕاست و دروست کراو، پارێزراو، باش ڕێکخراو.
**مضجع (ج) مضاجع:** خەوگە، نارامگە، گۆڕ، کلکۆ.
**مَضح:** لێگرتن، تانەلێدان، تانووت لێدان.
**مُضحك:** وەپێکەنین خەر، بەسخەل، لیڤۆک، زڕتەک.
**مضحكة:** تیزە زاڕۆک، لێپۆکی، ئاواوۆکی، کۆسەوەوی، کۆسەبووکە، لیڤۆک، قەرف، لێپووک.
**مضخة:** ١- فیچقەی ئاو پێ ئاوێژتنێیە ٢- ترومپا، تیرۆچکە، فیقژن، ئاوپاش، خوڕ، فیسقە، ئاوفرین، ئاوپژێن، فیشقە.
**- مضخة الكابسة:** ترومپای پالپێوەنەر، پەستۆک.
**- مَضخة الماصة:** ترومپای مژۆک.
**- مَضخة ماصّة كابسة:** ترومپای مژۆکی پەستۆک.
**مُضِر:** زیاندەر، زیانەخەڕۆ، زیانکار، زیانگەیێن.
**مضراب:** مرازێکی گچکەی کانییە تاری پێ لێدەدرێ.
**مَضرب:** لێدانگە.
**- مضرب الريح:** باگر، بەربا.
**- مضرب الشمس:** بەرهەتاو، بەربەرۆچکە.
**- مضرب الصاعقة:** شمشە.
**مضرة (ج) مَضارّ:** زیان، بەپێچەوانەی قازانج.
**مضرس:** ددانەدار، لە گێچەڵ و کێشەوە چوو.
**مضروب:** لێدراو، کوتراو.
**مضروب فيه:** ژمارەیێکە لە ژمارەیێکی تر درابێ.
**مضروب (في الحساب):** لێدراو، لێکدراو.
**مضروب الشمس:** تاوگاز.
**المضربة:** دۆکولیو، دۆخەوە.
**مضض:** ورتە، ورتە ورت، پرتە، پرتەپرت.
**مضطجع:** قوونەو تلوور کەوتوو.
**مضطر:** ناچار، بێچارە، شڕ، ناجەسە.
**مضطرب:** لە (**اضطراب**)دا بیدۆزەوە.
**مضطهد:** چەوساوەوە، ژێر چەپۆکە، ژێر چەپەلۆک.
**مُضعف:** ١- دووتا ٢- سستکار، بێ هێزکار، لە هێزخەر.
**مُضعَف المعنوية:** جەرگبڕ.
**المضغ:** جوون، جووین، جاکاندن، جووتن، جایین، جاوین، هلپچاندن، هلپەکین.
**مضغ الكلام قبل التلفظ:** گلماندن، قسە زۆر دەرنەبڕین و جوونەوە.
**مُضغة (ج) مضغ:** گۆشت پارە.
**مَضغة:** زارجوو، پارچە خۆراکێکە لەناو زاری بجووڕێ، دەمەجاو.
**مضغوط:** پەستراو، پەستێوراو.
**مُضلّ:** تەفرەدەر، لە خشتەبەر، گومراهکار، سەر لێشێوێن.
**- المُضلّع:** پەلپەل، پەلپەلاوی، چەندلا، لادار.
**- المضلّع المحدّب:** چەند لای قۆقز.
**- المضلّع المقعر:** چەند لای ناو چاڵ.
**- المضلّع المنتظم:** چەند لای ڕێکوپێک.
**مضمار:** مەیدانی ئەسپ غاردانێ، شوێنی هەرە دوایییە کە ئەسپ لە پێشبرکەدا دەبێ بیگاتێ. (شار).
**مضمحل:** لە (**اضمحلال**)دا بیدۆزەوە.
**مضمدٌ:** لە (تضمید)دا بیدۆزەوە.
**مضمر:** داپۆشراو، بەدڵ نەسپێرراو.
**مضمض ومضمضة:** ئاو یا دەرمان لە زار وەردان، زار شوشتن.
**مضموم:** کۆکراوەوە، وشەیێکە کە بۆری هەبێ، بۆردار.
**مضمضة:** دەنگی مار و هی ترە.
**مضمون (ج) مضامين:** لەناوەوە پێچراو، واتا، مەبەس.
**مضى مضواً ومضياً:** ڕۆیشتن، ڕابردن، تێپەڕین، بوورین، ویاران.
**- فيما مضى:** لەمەوبەر، لەوەپێش.
**مضيء:** ڕووناکی دەر، تیشکدەر، ڕۆشناییدەر.
**مضي:** بۆڵە، بۆڵەبۆڵ، وەرتە، ورتەورت، پرتە، پرتەپرت، پسە.
**المضي المتكرر:** پرتەپرت، پسەپس، پستەپست، بۆڵەبۆڵ، ورتەورت.
**مضياف:** نان بدە، دەست بلاو.

**مضيرة:** دۆكولێو، دۆخەوا.

**مضيف:** قۆناخ، كۆچك، میوانگە، میوانخانە، مێمانخانە، دیوان.

**مضيفة:** دیوان.

**مضيق (ج) مضايق:** ١- دەروەند، دەربەند، دەربەن، خرتەنگ، تەنگەبەر، گەروو، تەنگە، دەربەند، گەری، گەلی، دەرەوەت ٢- بەشە دەریایەكیشە كەوتبێتە نێوانی دوو پارچە خاكانەوە، خرتەنگ، دەرفۆك، دەرە، دەرەوەند.

**المضيق بين البحرين:** درگە، درنال، كانال.

**المضيق بين الجبلين:** دەربەند، گەلی، دەرە.

**مضيقة (ج) مضائق:** تەنگەبەر، تەنگایی، شوێنی تەنگ.

**المطابقات الحسابية:** هاوجووتە ژمێرییەكان.

**مط مطاً:** كێشان، ڕاكێشان.

**مطابق:** یەكچین، هاوتا، هاوچەشن، بەرانبەر، ڕێككەوتوو.

**مطابقة:** بەرانبەری، پێككرتن.

**مَطار:** فرگە، بالافرگە، فرۆكەخانە، بالافرخانە.

**مطارد:** ڕارفێن، ڕاونەر، ڕاونێر.

**مطاردة:** بڕوانە (**الطرد**).

**مطارق بخارية:** هەڵمە چەكوچ.

**مطاط:** جیل، جیر، لاستیك.

**مطاط الصلب:** لاستیكی پتەو، جیلی.

**مطاطي:** جیلی، جیری، لاستیك.

**مطاع:** گوێ پێدراو، ڕاژە كراو، كەسێكە مەردوم گوێدێری بكەن.

**مطاعمة:** ماچ و مووچ.

**مطاف:** سووڕانگە، خولگە، شوێنێكە مرۆ بەدەورەیدا بخولێتەوە.

**مطالب:** داخواز، ویستەر.

**مطالبة:** داخوازی، ویست، داوای قەرز و مافكردن.

**مطالع:** سەرنجدەر، خوێنەر، ئاگادار.

**مطالعة:** ئاگاداری، سەرنجدان، خوێندنەوە.

**مطالعة الكتاب:** سەرنجدان، پەڕتووك خوێندنەوە.

**مطاوع:** گوێدێر، گوێ لەمست، كارتێكەر.

**مطاوع للحرارة:** گەرمی كارتێكەر.

**مطاوعة:** گوێدێری، گوێ لە مستی.

**- غير مطاوع للحرارة:** گەرمی كار تێ نەكەر.

**- عديم المطاوعة:** لابار، لاسار، بێ گوێ.

**مطاوي:** ئالقاوی و ئالۆز وەكو دەزوو و ڕستە و ڕیخۆلە.

**مطايبة:** ڕووخۆش و خۆش ڕابواردن.

**مَطب:** پزشكخانە.

**مطبخ (ج) مطابخ:** مدبەق، ئاشپەزخانە، چێشتخانە، كوانوو، ئاشگە، سەرتەنوور، ئاشتخانە، چێشتكە.

**مطبعة (ج) مطابع:** چاپخانە، مەزركە، مەزرەكە.

**مطبعة كردستان:** چاپخانەی كوردستان.

**المطبّقة، مطبّق:** گرانەتا، كەوتوویی، كەفتەیی، نەخۆشی سووریژەیە كە تای سەختی هەیە، تێكەوە پێچراو، لەسەر یەكتری دانراو، یەك لە ناو یەكتری نراو، سەرپۆشدار، شەو و ڕۆژی، سەردەمر، بەبێ پسانەوە.

**مطبوخ:** كولاو، لێنراو، پەهتی.

**- غير مطبوخ:** نەكولاو، كال، خاو، چێشتی نە لێ نراو. چێشتی نەكولاو.

**مطبوع:** چاپكراو، پەسندكراو.

**مطبوع:** ڕووكاری دەرەوە، سەریلكی.

**مَطحن (ج) مطاحن:** ئاش، ئاساو، ئاسیاو، هاڕ، هاڕەڕ.

**مطحون:** هاڕڕاو، هاڕدراو، هێڕدراو.

**مُطِرّ:** فڕندە، فڕێن.

**مطر مطراً:** بارین، ڤارین، وارین.

**مطر (ج) امطار:** واران، بارانە، ساران، ڤاران.

**مطر اثناء ظهور الشمس:** گورگەزێ.

**المطر بغزارة:** بڕوانە (هطول المطر بغزارة).

**امطار خفيفة:** نەرمە بارانە، نمە بارانە، وەشت.

**المطر الشديد:** بارانەی سەخت، لەنگێزە.

**المطر العاصف:** بۆران، باو باران.

**المطر الغزير:** لێزمە، ڕێژنە بارانە.

**المطر المصاحب مع الرياح:** وەشت، وەشەن، باڕش، باڕفت.

**المطر المصحوب بالثلج:** شلێوە، ژێل.

**الامطار الموسمية:** كژە بارانە.

**المطر الوابل:** لێنگێزە، هووڕم، خوڕڕەمە بارانە.

**انقطاع المطر:** هەڵبرینگان، هەڵبرینگاندن، هەڵبڕكان، بارانەبڕان، باران بڕان.

**- رزان المطر:** نمە بارانە.

**- عودة المطر:** دادانەوەی باران.

**- فترة بين المطرين:** كژ.

**- فقاعة المطر:** قەپووچكەی بارانە.

**- ماء المطر:** باراناو، واراناو.

**- نزول المطر:** بارین، وارین.

**- هطول المطر:** بارین، ڤارین، وارین.

**- هطول المطر بغزارة:** بەلێزمە باران بارین.

**- هطول المطر والثلج معاً:** شلێوە، لێلاف.

**مُطِرّ:** ئاودار، تەڕوتازە.

**مطران:** سەرۆكی قەشانە.

**مطرب:** سازندە، چاوەش، خۆشاواز، خۆشبێژ، ئاوازە خوان، بەزمساز، ئاهەنگگێڕ.

**مَطرح (ج) مطارح:** فڕێدانگە، شوێنی، لێ فڕێدانێ.
**مطرَد:** نێزەی کورت.
**مَطرَف:** چاوترووکێنەر.
**مطرق (ج) مطارق:** کوتکی ئاسنی بەردشکاندنییە، پەیاخ، چۆماخ، کاشۆ، کوتەک، ماوەر، مێکوت.
**مطرق کبیر:** کووتێن.
**مطرقة:** چەکوچ.
**مطروح:** فڕێدراو، دەرکراو.
**مطروحاً منه:** لێی دەربچێت.
**مطرود:** دەرکراو، ڕاونراو.
**مطعم (ج) مطاعم:** چێشتخانە، شێوەخانە، ئاشخانە، ئاشگە، چێشتگە.
**مُطعم:** خۆراکدەر، نامدەر، نان بدە
**مطعَّم:** کوتراو، پەیوەندکراو، موتربیەکراو.
**مُطعم:** دانەخۆرە، چەشە.
**مطعوم:** ١- چێژتراو، خواردن دەرخواردراو ٢- مایە و ماکی خرۆێرکە ٣- پەیوەندکراو، فەتروونە، موتربیەکراو.
**مطعون:** لێدراو، تانووت لێدراو، سەرزەنشکراو، تانەلێدراو.
**مطفأة:** مرازی ئاگر کوژاندنەوە.
**مَطفيء:** لە (**إطفاء**)دا بیدۆزەوە.
**مطلاء:** ڕووکێش کراو، ئاوەزێڕکراو، ڕووکەش، دیە، ڕوومالّ.
**مطلَب (ج) مطالب:** ویست، ئارەزوو، خـــوازتەمــــەنی، ویستەمەنی.
**مَطلَع (ج) مطالع:** دەرگە، دەرکەوتگە.
**مَطلَع الشمس:** ١- ڕۆژهەلات .٢- یەکەمین شیعری غەزەل یا چامەیە
**مُطلع:** ئاگادار، بەئاگا، شارەزا، چاودێر، پەی بەر.
- **غیر مُطلع:** ناشارەزا.
**مطلق:** ئازادکار، بەردەر، بەرەلاکار، پەتی، سادە، ڕاست.
**مُطلَق:** ئازاد، بەرەلاکراو، ڕایی.
**مُطلَق التصرف:** سەربەست، تەرخان، دەست بەردایی.
**مُطلَق السراح:** بەردراو، ئازاد کراو، بەرداری.
**مُطلَق العنان:** خۆسەر، ئازاد، سەرگەردان.
**مطلقاً:** هیچ، بەهیچ جۆرێک، هیچ کاتێک.
**مطلَقة:** ئازاد و بەرەلاکراو، ژێبەردای، تەلاقدراو
**مطلمة:** لە (**طلمة**)دا بیدۆزەوە.
**مَطلمة:** فەرشە، پنە، خوانە، خانک، ڕیکە.
**مطلوب (ج) مطالب:** لە (**طلب**)دا بیدۆزەوە.
**مطلوب اثباته:** داواکراو.
**مطلّی:** بڕوانە (**مطلاء**).

**مطمئن:** لە (**اطمئنان**)دا بیدۆزەوە.
**مطمح:** جێگایەکە قرمی لێ خۆشکرێ و چاوی تێ ببڕێ
**مَطمع (ج) مطامع:** چاوتێ برگە، ئەوەیە کە قرمی لێ خۆشکرێ
**مطمورة (ج) مطامیر:** ١- چالەگەنم، زیندان ٢- ژێرخانی دەخلّ و دانەوێڵە.
**مطموس:** ناپەیدا، نادیار، گوم، ون، دوورکەوتووەوە. نابینا.
**مُطهِّر:** خاوێنکەرەوە، پاکەرەوە.
**مطهَّر:** پاک، خاوێن، بێ پەڵە.
**مطوِّف:** ئەو کەسەیە دیدەنی شوێنانی پاک و ئایینی بەخەڵکی نیشان بدات.
**مطوَّق:** تۆقدار.
**مطوقة:** کۆتری تۆقدار.
**مطوَّل:** درێژ، درێژە پێدراو.
**مطوي:** پێچـراو، پێچـراوەوە، لوولە کـراو، نوشـتـاوەوە، هەڵپێچراو.
**مطیِّب:** بۆنخۆشکار.
**المطیَّة:** ولاخ.
**مَطِر:** بارانەدیتوو، بارانە خواردوو.
**مطیِّر:** فڕتێن، هەڵفڕێن.
**مطیع:** لە (**اطاعة**)دا بیدۆزەوە.
**غیر مطیع:** لە (**اطاعة**)دا بیدۆزەوە.
**مظاهر:** ڕواڵەتکار، پارێزەر، یاریکار.
**مظاهرة:** گەلەکۆمە، ئێلـجاری، خۆپێشاندان، خلوو، خرتوول، هاوپشـتیوانی کردن، یارمەتی یەکتری دان، پشتی یەکتری گرتن، وێ نیشاندای.
**مظفر:** سەرکەوتوو، پیرۆزی دەستکەوتوو.
**مظل:** سێبەردار، سایەدار.
**مظلات الهبوط:** چەتری هاتنەخوار، (پاراشوت).
**مظلَّة (ج) مظلات:** خـێـوەت، چادری گـەورە، سـەیوان، چەتر، سایەوان، سایەبان.
**مظلم:** تاریک.
**مظلمة (ج) مظالم:** ئەوەیە کە بە زۆر کەسێکی ئەستێنرابێ.
**مظلوم:** زۆر لێکراو، کـڵـۆڵ، سـتـەمـبـار، بێـچـارە، تەپەسـەرا، پەیووک.
**مظمئی:** دێمەزار، دێمەڕۆ، دێم
**مظنة (ج) مظانّ:** شوێنی گومان.
**مظنون:** گـومـان لێکراو، چکرین، ئەنت و پەهت، بۆن لێکراو، چاڤزۆرگ.
**مظهر (ج) مظاهر:** ئاسۆگا، ڕواڵەت، چاوگە، ڕووکار، دیارگە، دیمەن، شـوێنی دیاربوون و دەرکـەوتـن، قـەلافـەت، شکڵ، بەرچاو، ڕوخسار.

**المظهر الخارجي:** شێوە، دیمەن، ڕووکاری دەرەوە.

**مُظهِر:** دەرخەر، دەرهێنەر، نوێنەر، وەدەرنەر، ئاشکراکار، ورکێنەر.

**مع:** لەگەڵ، پێکەوە، لەیەل، لەتەک، وێکرا، لەگە، وەرد، دەگەڵ، پەری، چەنی، بە، دەوڵ، دگە، هەڤ، بهەڤ.

**مع الاسف:** داخەکەم، بەداخەوە، داخی گرانم، پەککو، موخابین، غابین، وای، داخم ناچێ، داخی داخانم، دەستی شکاوم، حەیف، ئاخ، داخ، وای.

**مع أن:** هەرچەندە، هەرچۆنی، هەرچۆنێکی، سەربارەی ئەوە، کەچی، گەرچی، ئەگەرچی، ژۆرێیڤەر، لەگەڵ ئەوەش.

**معاً:** لەسەریەکتری، تێکرا، پێکەوە، پێکرا، دگەلهەڤ، ڤێک، ڤێکرا، بەیەکەوە، وێکرا، کەمۆچک، سەریەک، بان یەک.

**معاء:** ڕیخۆڵە.

**مِعاء دقیق:** ڕیخۆڵەی باریک.

**مَعاء:** میاوە، میاوەمیاو.

**معاتب:** سەرزەنشکار، بەسەررۆ.

**معاتبة:** سەرزەنشی یەکتری کردن.

**معاد:** ١- شوێنی گەڕانەوە ٢- پەسڵان **(قیامەت)**.

**معاداة:** دوژمنایەتی یەکتری کردن.

**معادل:** تەراز، هەڤبەر، بەردێلک، تەنگال، هاوسەنگ، هامسەر، هەڤسەر، بەرانبەر، هەڤڕوو، سەتگاتی.

**معادلة:** تەراز، هاوکێشی، بەرانبەری، هاوسەنگی، هاوسەری، هامسەری، هەڤسەری، هاوکێشە.

**معادلة آنية:** هاوکێشە پێکەوە.

**معادلة في الجبر:** هاوکێشە.

**معادلة الليل والنهار:** بەرانبەرێتی شەو و ڕۆژان.

**– احد طرفي المعادلة:** تایەکی هاوکێشەکە.

**معاذ:** لە **(لجأ)**دا بیدۆزەوە.

**معاذ الله:** پەنا بەخوا.

**معار:** خوازراو، خواستراوەوە، خواستە.

**معارض:** لە **(عارضة معارضة)**دا بیدۆزەوە.

**مَعارف:** لە **(معرفة)**دا بیدۆزەوە.

**مُعارف:** زانیار، شارەزا، بەڵەد.

**معارفة:** یەکترناسین، لەگەڵ یەکتری ئاشنایەتی نواندن.

**مُعارك:** شەڕکار، شەڕانی، شەڕفرۆش.

**معاركة:** پێکەوە بەشەڕهاتن، شەڕ لەگەڵ یەکتری کردن.

**معاش (ج) معايش:** هۆی ژیان و گوزەران، ژیوان، جیرە، دەقن، دەبرە، مووچە، بەرات، جەمەکە، پێ بژیو.

**معاشر:** هاودەنگ، هاودەم، هاموشۆکار، بەیەکەوە ڕابوێر.

**معاشرة:** لە **(عشرة)**دا بیدۆزەوە.

**معاشقة:** سەوداگەری، دەسەخلافکێ، .دەستبازی، دەستوازی، دڵدارێتی، دەزگیرانبازی.

**معاصر:** هاوچەرخ، هاوچاخ.

**معاضد:** یاریکار، هاوکار، یارمەتیدەر.

**معاضدة:** یاریکاری، هاوکاری، یارمەتیدان.

**معاطاة:** دانە دەست یەکتری، بەخشین، پێک بەخشین.

**معاطف:** لۆچی لەشی مرۆیانە.

**معاف:** تەرخان، بەربەرەڵا، بەخشراو.

**معاقب:** سزادەر، ئازاردەر، بەدواداگەڕ.

**معاقبة:** سزادان، ئازاردان.

**معاقد:** هاوپەیمان، هاوبەڵێن.

**معاقدة:** هاوپەیمانی، هاوبەڵێنی.

**معاكس:** سەهەنە.

**معالج:** چارەکار، چارساز، دەرمانکار.

**معالجة:** بڕوانە **(علاج)**.

**معالي:** گەورەیی، ئابڕوومەندی.

**معامل المد:** هاوکۆلکەی کشان.

**معاملة:** خریدوفرۆش، دانوستاندن، دادوست، سەودا، مەزندەکردن، نرخ پرسین، سەوداکردن، چەند و چوون، دادوبسەت، بازاڕکردن، کڕین و فرۆشتن، تێکەولێکە، مامڵەت، کروفرۆشی.

**معاملة رسمية:** کاروباری میری.

**معان:** بڕوانە **(مكان)**.

**معاند:** بڕوانە **(عنود)**.

**معاندة:** لە **(عناد)**دا بیدۆزەوە.

**معانقة:** دەست لە ملی یەکتری کردن، یەکتری لە باوەش کردن.

**مُعاهِد:** پەیماندەر، بەڵێندەر، هەواڵبەند، هاوپەیمان، هاوسوێند.

**معاهَدة:** هاوپەیمان، پێڕەوی، یەکێتی، هاوبڕیاری، هەواڵبەندی، نیکول، پەیمان، بڕیە.

**معاود:** ئەو کەسەیە بگەڕێتەوە.

**معاودة:** گەڕانەوە، بادانەوە، وەرگەڕانەوە.

**معاوضة:** سەرەوسەر، هەرەوەز، سەربەسەر، پێک گۆڕینەوە، دەستەوا، دەستیاو، ئاڵوگۆڕ، ساقی و باقی، ئاڵشت.

**معاون:** یاریکار، ئاریکار، یاوەر، کۆمەڵکار، یاریدەدەر، یاریەدەر، دەستیار، دارونیار، یارمەتیدەر.

**معاون الشرطة:** یاوەری کەلانتەری.

**معاونة:** دەستگرتن، داروونی، یارمەتیدان، کۆمەگی، یاریکاری، زبارە، هاری، یارمەتیدان، هاوپشتی، یاریە، دەستیاری، هاریکاری، یاردوم، هامەیاری، یاریدەدان.

**معاوية:** دێلەسەگ، بێچوو ڕێوی.

**معاونة:** دەستەوا، هەرەوەز، دەستیاو.

**معایب:** خراپان، شوورەیی یان.

**معاینة:** بەچاودیتن، ڕووبەرووی چتێک دیتن.

**مَعبد (ج) معابد:** لە (**عبادة**)دا بیدۆزەوە، پەرستنگە، پەرستنگا.

**مَعبد الصنم:** بوتخانە.

**مَعبد النار:** ئاگرخانە، ئاتەشکەدە، ئاترخانە، ئاترکەدە.

**مَعبر (ج) معابر:** ڕاگوزار، سەرەڕێگە، بەرەگە، تێپەڕگە، شوێنی تێپەڕین و پەڕینەوە، بێلایی، ڕێباز، ڕێواز، ڕارەو، دالآن، ڕێڕەو.

**معبِّر:** خەون لێکدەرەوە.

**معبلة:** پەیکانی پات، سەرەتیر، لاوێتە.

**معبود:** پەرستراو، یەزەتە.

**معتاد:** چارش، ڕاهاتوو، ڕام، مقۆ، ژێهاتی.

**معتبر:** لە (**اعتبار**) بیدۆزەوە.

**معتد:** زۆردار، لە سنوور پێ درێژکردن.

**معتدل:** لە (**اعتدال**) بیدۆزەوە.

**معتدل القامة:** دەستە (نەکەڵەگەت و نەکورتەبالا).

**معتذر:** تەوازۆخواز.

**معتدي:** دەستدرێژ، زۆردار.

**معترض:** پەڵپگر، ڕەخنەگر.

**معترضة:** ڕستەیێکی لاوە بخرێتە ناو وتووێژێکی تایبەتییەوە.

**معترف:** درکێن، درکێنەر، ددان پێدانەر، پێ لێنەر.

**مُعترَف:** ددان پێدانراو، درکێنراو.

**معترك:** مەیدانی شەڕ، جەنگگا.

**معتز:** بەخۆشەویست و بەڕێز لە پێنووسدراو.

**معتزل:** کەنارەگیر، گۆشەگیر، گۆشەنشین.

**معتزلة:** دەستەیێکە لە موسوڵمانان وە دوای (**واصل**)ی کوڕی (**عطا**) کەوتوون کە یەکێک بووە لە شاگردەکانی (حسن بصری) لە زنجیرەی وانەی وی دەرچوو، جوورە بیروباوەڕێکی تری گرتووە.

**معتصم:** داوێنگر، پەنابەر، واز لە گوناه هێنەر.

**معضد:** یاریکار.

**مُعتَق:** بەندی ئازادکراو.

**معتقد:** بڕواکار، باوەڕکار، بەقاکار، باوەڕمەند، تمەز.

**مُعتقَد:** باوەڕ پێکراو، سایکە.

**معتقل:** بەندیخانەی دوور، زیندان، گرتووخانە، گرتیخانە.

**معتکف:** گۆشەنشین، کەسێکە سەبارەت بەخواپەرستی گۆشەیێکی بگرێ.

**مُعتَلّ:** نەخۆش، دەردەدار، لە ڕاوێژیی صرف و نحودا وشەیێکە تیپی (و،ا،ی)ی تێدابێ.

**معتم:** تاریک، لێڵ.

**معتمد:** لە (**اعتماد**) بیدۆزەوە.

- **غیر معتمد:** بێ بایەخ، دڕدەنگ.

**معتني:** چاودێر، خەمخۆر، غەمخوار، ئاگادار.

**معتني به:** خەم بۆ خوراو، خەم لێخوراو.

- **غیر معتني به:** گوهفرە، خەمسار، خەمسارد.

**معتوق:** ئازادکراو.

**معتوه:** وڕ، وڕوکاس و گێژ، سەرگەردان، سەپەل، سەپوول، حەپوول، چەنەگ.

**معجب:** خۆبین، خۆپەسند، سەرسوڕهێنەر.

**معجب بنفسه:** بەخۆفش، تڕزل، تڕزۆ.

**معجر:** کۆفی ژنانە، سەرپۆشی ئافرەتان، سەروپێچی ئافرەتانە.

**معجز:** سەرئێشەر، سەخڵەتکار.

**معجزة:** پەرجۆ، کارێکە لە پلە و یاسای سنوور دەرچووبێ، فەرمانێکی لێهاتوو و هەڵکەوتووی وایە کە کەسێکی تر نەتوانێ بیکات.

**مُعجَم:** پیتی نوختەدار، نووسراوی نوختە بۆ دانراو، پرهەنگ، فەرهەنگ، فەرهەنک.

**مُعجَم صغیر:** فەرهەنگۆگ.

**معجن:** لە (**عجن**) بیدۆزەوە.

**معجون (ج) معاجین:** ١- هەویرکراو، تێکەڵاو، هەویر ٢- دۆشاو، چەند دەرمانێکی تێکەڵاو و هەویرکراو.

**معجون یوضع علی الدمل والقرح:** نیوەغەک، نیمرۆ.

**معد:** ئامادە.

**معد:** ئامادەکراو، سازگەر.

**مَعدات:** سامان، ڕەخت، تەڕ و تفاق.

**معدة (ج) معد:** چیکڵدانە، ئاشک، ئاشگە، خۆرگە، چیقڵدانە، گەدک، گەوو، خرگە، پەریزانگ، سیق، بەرچلک، خواردندان، سیقەدان، سیقەتۆرە، بەرچینۆک، جقەتۆرە.

- **اصابة باصطرابات المعدة:** تەبع بوون.
- **اضطراب المعدة:** تەبعی، خێسانەوە.
- **تمدد المعدة:** لە بەر یەک کشانەوەی چیلکدانە.
- **مضطرب المعدة:** تەبع.
- **وجع المعدة:** ژانی ئاشک، دەردی چیکڵدانە.

**معدِّل:** ڕێکخەر، هاوکێشکار.

**معدَّل:** لە (**عدل (ج) عدول**) بیدۆزەوە.

**معدَّل الاسبوعي:** تێکڕایی حەفتانە.

**معدَّل السنوي:** تێکڕایی سالآنە.

**معدَّل الشهري:** تێکڕایی مانگانە.

**معدَّل السعي السنوي:** کۆششی سالآنە بەتێکڕایی.

**معدلاً:** بەتێکڕایی.
**معدلة:** داد و مرۆڤایەتی.
**معدم:** دەروێش، هەژار، نیازمەند.
**معدن (ج) معادن:** مێتال، لاژوەرد، کان، لاژوارده، ئەردزین، چنک.
**معدن اصفر:** گۆگرد، مسی زەرد.
**معدن التراب:** گڵەجان، گڵەخانێ، گڵکەند، گڵێنجان.
**المعادن الثقيلة:** کانە قورسەکان.
**معدني:** کانی، لاژواردی، چنگوو، بەرەکانی.
**معدود:** ئەژمێرراو، بژێرراو، حەل، ژمارده.
**معدول، معدولة:** پێچراوەوە، گەراوە، پیتێکی وایە کە لە شکل و دەنگی وی دەنگی گۆڕابێ.
**معـدوم:** ١- نەبوو، نەمـاو، ونبـوو، لەناوچوو، تێـداچوو ٢- خنکاو، لە سێدارەدراو.
**معـدي:** درم، پەتا، پەتۆ، درمـانە، درمی، تەنینـەوە، گـرەوە، نەخۆش، پێدرێژ.
**معذار:** بەڵکە، پەڵپ.
**مَع ذلك:** سـەرڕای ئەوە، سـەرباری ئەوە، لەگـەڵ ئەوەش، لەگـەڵ ڤێقاسێ، ژووپێڤە، ژووی پێڤە، سەرەڕای ئەوە.
**معذِّب:** ئازاردەر، چرووسێنەر.
**معذَّب:** ئازارچێژتوو، ئازاردراو، چرووساوەوە.
**معذرة:** بروانە (**عذر**).
**معذور:** تەوازۆخواز، بەهانەدار.
**معر:** ئەندازەگر، هەندگر.
**معراج (ج) معارج:** لە (**عروج**)دا بیدۆزەوە.
**معرِّب:** ١- وەرگێڕ بۆ سەر زمانی عەرەبی کەسێکە وشەیێک یا ڕستە و یا وتار و پەرتووکێکی لە هەر زمانێکەوە وەربگێڕێتە سـەر زمـانی عـەرەبی ٢- کـەسـێکە ڕەچەڵەک و نەژاد و کەسێکی یا هۆز و نەتەوەییێکی بکا لە عەرەبی.
**معـرَّب:** ١- کەسـێکە بووبێتـە عـەرەب، وشـەیەکە لە زمـانی تر وەرگیرابێ و خرابێتە سـەر شکڵی عـەرەبی، وەرگەڕاوەتە سـەر زمـانی عـەرەبی ٢- بۆتە عـەرەب ٣- وشـەیێکیـشـە بەهۆی (اعراب) دواییییەکەی سەر (-َ) دار بێ.
**معربد:** هەرزەکار، بەدخوو، بەدمەست، ڤرڤرە.
**مَعَرَّة:** گوناه و خراپە، ڕەنج و ئازاری سەخت.
**مَعرَج:** نەردیوان، پلیکان.
**مَعرض (ج) معارض:** لە (**عرض**) بیدۆزەوە.
**مُعرض:** کەسێکە ڕووی وەرگێڕێ لە کەسێکی، ڕوو وەرگێران.
**معرِّف:** بەناسێندەر، پێناسێن.
**معرَّف:** ناسراو، دیار.
**مـعـرفـة (ج) مـعـارف:** تێگەیشتن، ڕەوشـەنی، ڕەووز، زانین، زانیاری، ئاخوەوەندی، زانست، زانستی.
**معرفة الارض:** زەوی ناسی.
**معرفة الأنساب:** ڕەچەڵەکناسی.
**مدير المعارف:** بەڕێوەبەری زانیاری.
**مديرية المعارف العامة:** بەڕێوەبەرایەتی زانیاری گشتی.
**معرفة علم التأريخ:** مێژووزانی، مێژووناسی.
**معرفة القرائة والكتابة:** سیواد، سەواد، خوێندەواری.
**معرِّق:** ئارەقەپێکار، دەرمانی ئارەقەکردنێ.
**معرَّق:** دالگۆشت، لاواز، مەیێکە کەمێک تێکەڵ بەئاوی کرابێ.
**معركة (ج) معارك:** شـەرگە، کوژتارگـە، کوشـەنگە، جـەنگا، جەنگگە، جەنگگا، جێگەی شەڕ، مەیدانی شەڕ.
**معروض:** نواندراو، نیشاندراو، پێ وتراو.
**المعروض للبيع:** فرۆتەنی، فرۆشتەنی.
**معروف:** لە (**عرف، عرفة ومعرفة**) بیدۆزەوە.
**معري:** ڕووت، بێ پەردە، دانەپۆشراو.
**مـعـز:** بزن، ڕەشـان، سـیـاون، گـدی، بەبزن و کـوور و هەمـوو چەشنێکی ئەو تیرەیەی دەڵێن.
**معز الجبل:** بزنەکێوی.
**مُعِزّ:** خۆشەویست.
**معزقة:** هەسکووبێ، هەسکۆ، هەسک.
**معِزقة:** بژارچن، پیشک، پارچەکوڵە، ئادۆدە، بژاربڕ، بێلەقان، بێلەکان.
**معزول:** لێکەوتوو، لێـخـراو، جیـاکـراو، لە کـار دوورخـراوەوە، گۆشەنشین.
**معزي:** سەرەخۆشیکار.
**معزى اليه:** کەسێکە پاڵپشتی چتێکی درابێتە پاڵ.
**مُعسر:** نیازمەند، تەنگدەست، تەندەست.
**مـعـسـكر:** لەشکرگـا، ئۆردووگـا، هۆردووبەز، سـوپاگـە، هێـز، سـوپاخـانە، سـەربازخـانە، لەشکربەز، سـەروازخـانە، سـەرای پێشمەرگان.
**معسكر الاعتقال:** ئۆردووگای بەندیان، لەشکرگای گیراوان.
**معسور:** سەخت، دژوار.
**معشار:** دەیەک، بەشێکە لە دە بەشان، وشتری پڕ شیر.
**مـعـشـر (ج) مـعـاشـر:** کۆگـە، کۆگا، کـەس و خزمـان، دوودەمـان، خێڵ، هۆز، خانەوادە.
**معشق:** نێرە و مێیە.
**معشوق (م) معشوقة:** دۆست، یار.
**معشوقة:** ئافرەتێکە خوشەویستی و یاربێ.
**معصر (ج) معاصر:** کوشنگە، مرازێکە ئاوی ترێی پێ دەکوشرێ وەلا ئاوەکانیان دەگرێ.

**مِعصم:** بازوانده، بازەنده، بازنده، باق، مەچەکی دەست، شوێنی بازنە و دەستەوانان، زوانده.
**معصور:** کوشراو، کوشیاگ، هەمێز، گوشراو.
**معصوم (م) معصومة:** بێ تاوان، بێ سووچ و گوناه.
**معصية (ج) معاصي:** تاوان، سووچ، گوناه.
**معضد:** باسکبەند، قۆڵبەند، باهووبەند، تۆلبەند.
**معضلة (ج) معضلات:** دژواری، پێسیر، گیروگرفت.
**مُعَطِّر:** بۆنخۆش، بێخۆش، بۆوەش، بۆندار، خۆشبۆن.
**معطر بالمسك:** مسکین، مشکین.
**معطف (ج) معاطف:** قاپووت، وربه، پاڵتۆ، ساقۆ، پاڵتاو.
**معطف من الصوف:** کەپەنە، کەپەنەک، کەپەنک.
**معطَّل:** بروانه (عاطل)، بێکار، بێکارماو.
**معطِّل:** پەکخەر.
**مَعطن:** مۆڵگەی وشتران.
**معطوب:** زەدە، زەدەدار، لە کار کەوتوو، بێ خێر، بێ کەلک.
**معطوف:** لکێنراو، بەستراو، هودەر، پێچراوەوە، میهرەبانی لەتەکدا کراو.
**معطوف عليه:** پێوە بەستراو، هۆلێدراو، پێوەلکاو، پێوەنووساو.
**معطي:** دایەندە، بەخشندە، بدەر، دەستگوشاد، دڵفراوان.
**معطي الدم:** خوێندەر، خوێنبەخش.
**معظم:** ١- گر، گەورە، مەزن، زەند ٢- گەلێک، زۆربە.
**معفو:** بەخشراو، تەرخان.
**معقاد:** ملوانە، ملوانکە.
**معقّب الاثر:** پەی بەر، پەی دۆز.
**معقّب:** پەیدۆز، شوێنگەڕ، شوێنکەوتوو.
**معقبات:** فرشتەکانی ڕۆژ و شەو پەسپسوک (تسبیحات) یەک لە دووی یەکتری.
**معقّد:** گرێگرێ، قەفقەف، گرێ تێکەوتوو، گرێچن، ئاڵۆز، ئاڵۆزکاو، سەخت، گیرە، ڤێزە، ئاڵۆزاو.
**معقرب:** خوار، چەماوەوە، یاریکاری بەهێز.
**معقل (ج) معاقل:** مکۆ، پەناه، پەناگاه، داڵدە.
**معقِّم:** پاکژکار، خاوێنکار، میکرۆبکوژ، نەزۆکار.
**معقَّم:** بێ میکرۆب، برژاوەوە، خاوێنکراوە.
**معقود:** گرێدراو، بەستراو، بەندکراو.
**معقوف:** داچەماو، کۆماو.
**معقول:** لە **(العقل)** بیدۆزەوە.
**معك:** لەگەڵ تۆ.
**معكم:** لەگەڵ ئێوە.
**معكوس:** لە **(عكس)** بیدۆزەوە.
**معكوسة:** بۆر، (ڤیرگول).
**معلاة (ج) معالي:** بەرزی، ئابڕوومەندی، پایەبەرز.
**معلاج:** قاڵنک.
**معلاق:** قەلانک، شاڵۆک، قاڵنگە، قەنارە، بەهەموو چتێکی وا دەڵێن کە چتی پێوە هەڵبواسرێ.
**معلف (ج) معالف:** ئاخوڕ، ئافر، دەلاڤ، کۆل، ئاوەڕ، لەوەڕگا
**معلف فوق الثلج:** دانگە.
**معلقة:** توورەکە، تووربێن.
**معلَّق:** هەلاوەسراو، هەڵواسراو، پێدار.
**معلَّقة:** ژنێکە مێردی گوم بێ و یان نەبەمێرد و نەبەڕەلابێ.
**مَعلَم (ج) معالم:** ئەو نیشانانەیە لە سەر ڕێگایانی داد.ەنێن بۆ شارەزایی ڕارەوان.
**معلم (م) معلمة:** مامۆستا، فێرکار.
**معلم اليهود:** مالم.
**معلول:** چتێکە کە بەهۆی بەڵگە سوورکرابێتەوە، نەخۆش، دەردەدار، دەخەزدار.
**معلوم:** دیار، ئاشکرا، زانراو، پەنی.
**معلومات:** ئاگاداری، زانیاری، زانست، ئاشکرایی، شارەزایی، ناسی، سەواد، ئاخوەوەندی، سەیدایی، سیواد.
**معمرٌ:** ساڵدار، کۆنەساڵ، ساڵخوردە.
**مُعمرٌ:** کۆنەپیاو، پیر، ئاوەدان.
**معمعي:** کەسێکە خۆی لە خەڵکی هەلبقتێنێ، کەسێکە خۆی لە خەڵکی هەڵسەپێنێ.
**معمار:** هونەرمەند لە دروستکردنی خانووبەرە و کۆشک و سەراو پەرداندا، ڕەنگرێژ.
**معمل:** کارگە، کارخانە، دەزگا، دەستگا، دەزگاوبەرە، دەسگا، دەزگەه، دەستگەه.
**معمل البارود:** بارووتخانە.
**مدير المعمل:** کارگێر، دەزگاگێر، کارخانەوان.
**معمل النسيج:** تەونخانە، تیزتیزک، کارگەی جۆلایی.
**معمور:** ئاوا، ئاوەدان، ئاڤاهی، ئاڤا.
**- غير معمور:** چۆل، کاول.
**معمورة:** ئاوایی، ئاوەدانی، ئاڤاهی.
**معممٌ:** مێزەربەسەر، مەندیل بەسەر.
**معمال:** دروستکراو، کراد، مەهرکی، زەوتەلی.
**معمول:** کراو، مەهرکی، دروستکراو، زەوتەلی، خوەڕستی.
**معمول يدوية:** دەسکر، دەستکرد، شێوە.
**غير معمول:** ناباو، ناشێوە.
**معمى:** وشە یا وتارێکە واتایەکەی داپۆشرابێ یان لەناودا بزر کرابێ.
**مَعن:** درێژ، کورت، ئاسان، زماندار، وتاردەر، دوێن، پێوەر.

**معمولي:** دەمانگە.

**معنا:** لەگەڵ ئێمە.

**معنبر:** عەنبەرین، چتێکە بەعەنبەری بۆنخۆش کرابێ.

**معنون:** پەرتووکی پێشدەستی هەبێ.

**معنوي:** واتادار، مانایی، چتێکە بەندیواری بەواتاوە هەبێ وەکو ئازایی، دادگەری.

**معنويات:** ئەترەش، هووێر، ورە، بەشارەت، زەهلە، ئاریشەن، بژوون.

**- ذو قوة معنوية:** ئاریشەن.

**- فقدان المعنوية:** ورەبەردان، زراوچوون، زارەترەک بوون.

**- قوة معنوية:** ورە، ئەترە، ئەترەش، زەندەق، زەهلە.

**- فاقد المعنوية من الخوف او الرعب:** زارەترەک.

**معنى (ج) معانٍ:** واتا، مانا، وێر، چەمک، بەسە، ئانکوو، چەم

**- ذو معنى:** واتادار.

**معه، معها:** ١- لەگەڵ وی، ڤێراوی ٢- لەکنیەتی، لەلایەتی.

**معهد (ج) معاهد:** ١- بونگە، بنگە، ئامۆژگا، بنگا، بونگا، پەیانگا، خوێندنگا، ئامۆژگە ٢- ژووانگە.

**المعهد العالي:** ئامۆژگای بەرز.

**المعهد العلمي:** ئامۆژگای زانیاری، ئامۆژگای زانستی.

**مع هذا:** لەگەڵ ئەوەش، لگەل ڤێهەندێ، دگەل ڤێ چەندێ، لەگەڵ ڤێهەندێ، لگەل ڤێ قاسێ، لگەل ڤێ هەندێ.

**معهود:** ناسراو، یارۆ، هەرامە، کابرا، پەیماندراو، کۆن، کۆنیە.

**مُعَوَّج، معوجة:** خوار، چەوت، خێچ، چەوتەک، کەچ.

**معوجَّة:** جەوتە، جەوتەک (کیمیا).

**معوَّد:** خووپێگرتوو، ڕاهاتوو.

**معوَّر:** یەکچاو، یەکچەهڤ.

**معوَّق:** ڕاگیرکراو، بەندکراو، دواخراو، دواکەوتوو، پاشکەوتوو، دواکەفتگ، جێگەماگ.

**معوِّق:** ڕاگر، گوسپە، پیشگر.

**مُعوَّل:** بڕوا پێکراو، قایم، پشت و پەنا.

**معوَل:** کولنگ، قولینگ، زەنگەن، زەنگن، پاچ، لاوێتە، کولانک، نوێل.

**معوَل صغير:** پاچوولکە.

**معهد (ج) معاهد:** شوێنێکە بڕیاری لەسەر درابێ.

**معونة:** یارمەتی، یاریکاری، باربوو، بارەبور، یاریدە.

**معوى:** ژێخۆڵەیی.

**معي:** لەگەڵ من.

**مَعي، معى:** ڕیخۆڵە، ڕێلەخۆ.

**معي (ج) امعاء:** ڕیخۆڵە.

**معي الاعور:** ڕیخۆڵە کوێرە، ماسوولکە کوێرە.

**معي الدقيق:** ڕیخۆڵەی باریک.

**معي الغليظ الصاعد:** ڕیخۆڵە ئەستوورە، ڕیچک، ڕووڤیرەست.

**- التهاب الامعاء:** سۆی ڕیخۆڵان.

**- قرقرة الامعاء:** قۆڕەی زگ.

**المعي:** مەتەڵ، لۆتەر، ڕیخۆڵە.

**معيار:** لە **(عيار)** و **(عيارات)** بیدۆزەوە.

**معيب:** بڕوانە **(معيوب)**.

**معيد:** دووپاتەکەرەوە، نیوەچڵ، تاقیکەرەوە، کەسێکە کارێکی دووپات بکاتەوە، کەسێکە وانە بۆ قوتابیان دووپات بکاتەوە، چاکەکار، ڕەخنەگر.

**معيد الغناء:** واخوێن.

**معير:** خوازگر، خوازەرەوە، ئەندازەگر، کەسێکە لە ئەیاری پارە سەری دەربچێ.

**معيشة:** لە **(عيش)** بیدۆزەوە.

**معيل:** بەخێوکار، بەروەردەکار، کەسێکە خاوەندی خانەوادەیێکی زۆربێ.

**معين:** لە **(اعانة)**دا بیدۆزەوە.

**معين الراعي:** دواناژۆ.

**مَعين:** ڕەوان، ئاوی کانی کە بەسەر زەوی بڕوات.

**- ماء مَعين:** ئاوی پاک و ڕەوان.

**معيَّن:** دیاریکراو، ئاشکرا، بەرچاو، دیار، بڕیار لەسەردراو، نیشانەکراو.

**معيوب:** ڕمووزن، هاجری، زەدەدار، کەم و کوڕیدار، خەلیخە، ئەنگین، شکست.

**مغاث:** دارێکە.

**مغارة (ە):** غار، ئەشکەوت.

**مغازل:** دەستباز.

**مغازلة:** لە دڵدارێتی دوان، دڵدارێتی کردن، دەستبازی.

**مغازلة مع النساء:** دڵدارێتی لەگەڵ ژنان.

**مغالبة:** بەسەریەکتری چیرەبوون.

**مغالطة:** یەکتر خستنە هەڵەوە، بەڵگەی سست و چەوت.

**مغامر:** کەسێکە بەبێ لێکدانەوە خۆ باوێژێتە ناو گێژەنی مەرگەوە.

**مغامز:** چاوداگر، چاوترووکێن.

**مغامزة:** چاو لە یەکتری هەڵتەکاندن، چاو لەیەکتری داگرتن.

**مغاني:** هاوچرە.

**مُغايَرة:** جیاوازی، بەپێچەوانەی یەکتری بوون.

**مغبَّر:** تۆزاوی.

**مغبغب:** بەرخەبەدار.

**مغبن:** بەغەڵ، بیخی ڕان.

**مغبوط:** شادمان، دڵخۆش.

**مغبون:** تێشکاو، فریوخواردوو.

**مغتال:** دەستکوژ، دەسکوژ.

**مغتبط:** خۆشحاڵ، شادمان.

**مغتذي:** چێشخۆ.

**مَغتسل:** دەستشۆرکە، سەرشۆرگە، جێگای شوشتن، سەرشۆرگا.

**مغتصب:** زەوتکراو.

**مغتظ:** قیندار.

**مغتنم:** تالانکر، کەدەڕووە، دەرفەت دەستکەوتوو.

**مغث الدواء في الماء:** دەرمان لە ئاوێ سوونەوە.

**مغذي:** خۆراکدەر، ماکی خواردەمەنی، چتێکە خاوەندی کەرەستەی خواردنێ بێ.

**مغرب:** لە (غروب) بیدۆزەوە.

**مغرب الاقصى:** مەراکیش.

**مغربَل:** ١- لە بێژنگ دراو، دابێژراو ٢- نزم، ناکەس، هەلامساو.

**المغرة:** قوڕەسوور.

**المغرس:** شەتڵجاڕ، باخڵە، چەقێنگە.

**مُغرِف:** ئەسپی تیژڕۆ، سواری توندڕۆ.

**المغرِض:** بەدخواز، نیاز پیس.

**مُغرم:** دووچاری تاوان و قەرز، هەوەسکار، شێواو و قرمداری چتێکی.

**مغرور:** لە (غرور) بیدۆزەوە.

**مغروس:** چەقاو، دەستنێژ.

**مغري:** هاندەر، فیتدەر، دەست لە پشتدەر.

**مغرى:** فریودراو، دەستشکاو، لە خشتە براو، تیرکریاگ، داسپیریاگ، هەڵخریاگ، هاندراو.

**مغزل:** تەشی، ڕێسەر، دووخ، دووک.

- **رأس المغزل:** سەرەتەشی، سەرەدووک.

**مغزلي الشكل:** تەشیلە.

**مغسل:** دەستشۆرگە، شۆرتکە، سەرشۆرتگە.

**مغسل الموتى:** پاشۆر، تەختەشۆر، مردەشۆر.

**مغسول:** شۆراو، شوشتراو.

**مغشوش:** ساختە، پووچکراوەوە، نەهەڤگرتی.

**مَغشي:** لە پرێکا گیراو.

**مَغشي عليه:** بێهۆش.

**المغص:** ژان، ژوار، لێهاتن، ئێشی دژوار، دەرد.

**مغص البطن:** زگ ئێشە، ژانەزگ.

**المغص الكلوي:** ژانی گورچیلکە.

**مغص المعدة:** ناڤێش.

**مغصوب:** داگیرکراو، زەوتکراو، زەفتکراو.

**مغضوب:** ڕق لێ هەستاو.

**مغضوب عليه:** خواگیر، خوداگیر، ڕق و پشم لێ هەڵگیراو.

**مغطى:** داپۆشراو، سەرنراوەوە.

**مغطي:** داپۆشەر، پێدادەر، لێبوور، لێبوورەر.

**مغفر:** فەرییکە کە لەژێر کڵاو لەسەر بکرێ.

**مَغفرة:** زرێیەکە، بووردن، لێ خۆشبوون.

**مغفل:** نەزان، کەمهۆش.

**مغفور:** داپۆشراو، بەخشراو، خوا لێ خۆشبوو.

**المغل:** ژەک.

**مغلاق:** مرازێکە دەرکە و پەنجەرەی پێ دادەخرێت، ڕێزە، ئاڵقەڕێز، کلۆم.

**مَغلطة:** وشەیێکە کە کەسێکی لە هەڵە و نیگەرانی باوێ.

**مغلَق:** بەستراو، ئاخۆتنێکە کەس تێی نەگات.

**مغلق:** پێکەوەنەر، پێوەنەر.

**مغلوب:** لە (غلب غلباً) بیدۆزەوە.

**مغلوبیه:** لە (غلب غلباً) بیدۆزەوە، ژێرکەوتن.

**مغلوط:** چەوت، چەوتی دار، هەڵەدار.

**مغلوق:** بەستراو، داخراو، پێوەدراو، سەربەمۆر.

**مغلول:** کەسێکە زنجیر و تۆقی لە مل کرابێ.

**مغلي:** کوڵاو، کوڵیو، پژاو.

**مغماز:** زەختە، پلار، پللار، تانووت.

**مغموم:** خەمبار، خەفەتبار، بەپەرۆش.

**مغمى:** بێ هۆش، کاس.

**مغمى عليه:** بێ هۆش.

**مغناطيس ومغنطيس:** کانکێش، ئاسنکێش، ئاسن فرێن، مەگن، مەگنار، کانێکە هێزی ئاسن کێشانی تێدابێ.

**المغنطيسية:** مەگناتیزم.

**مغني:** بێ نیاز.

**مغنّي:** گۆرانیبێژ، دەنگخۆش، گۆوین، سترانبێژ، ئاوازەخوان، سترانڤان، ئاوازەبێژ، خۆشخوان، لاوک بێژ، دیلانەبێژ، دەنگبێژ، لاوژبێژ، لاڤەبێژ.

**مغوار:** تۆپز، تالانکر و شەڕفرۆشی سەخت.

**مغيب:** دوورکەوتووەوە، پەنهان بوو، بزر، ناپەیدا.

**مغيث:** بەهاناگەیشتوو، دادڕەس، فەریادڕەس.

**مغير:** تالانکر.

**مُفاخر:** بەخۆفش، شانازیکار.

**مفاخَرة:** شانازی کردن، شانازی بەیەکتری کردن.

**مفاد (ج) مفائد:** واتا، مەبەس، چەم.

**مفأدة (ج) مفائد:** کزڵۆوەژ.

**مفارق:** دوور، جیا، جودا، جیاواز.

**مفارقة:** جودایی، جیاوازی، لێک دوورکەوتنەوە، لێک هەڵبڕان.

**مفازة:** چۆل، دەشت، سارا، جێگای ڕزگاری، شوێنی لەنێوچوون.

**مفاعل:** کارکەر، کارلێکە.

**مفاهات:** دەم بەدەمەوەنان.

**مفاوض:** ڕووبەڕوو، هاوکار، بەرانبەری کار و فەرمان، وتووێژە، لە کارێکی بیروباوەڕی خۆ دەرخەر.

**مفاوضة:** لە (**تفویض**)دا بیدۆزەوە.

**مفتاح (ج) مفاتیح:** کلیل.

**مفتِّت:** داقنێنەر، دارزێنەر، دافەتێنەر.

**مفتحٌ:** کرەوە، ئاوەڵەکرەوە.

**مفتخر:** خۆهەڵکێش، سەربڵند، شانازیکار.

**مفترض:** گەرەک و پێویست زایین.

**مفترس:** دڕندە، جانەوەر.

**الحیوانات المفترسة:** دڕندە، جانەوەر.

**مفترق:** پەراگەندە.

**مفتري:** بوختانکار، شلتاخبار.

**مفتش الاسرار:** دەمدڕاو، پشکنەر.

**مفتش:** پشکێنەر، لێپرس، لێکۆڵەرەوە.

**مفتضح:** بێ ئابڕوو، ڕیسوا، ئابڕووچوو، بێ شەرم، ترۆ، بەدناو.

**مفتعل:** کاری سەخت.

**مفتقر:** نیازمەند، ئاتاج.

**مفتقد:** گوم بوو، وەدووکەوتوو.

**مفتکر:** بیرکار، بیرکەرەوە.

**مفتَّن:** لە (**فتنة**)دا بیدۆزەوە.

**مفتوح:** سەرئاوەڵە، سەرنەبەسیاگ، سەرنەوەسیاگ، کراوەوە، ئاواڵە، بەروالە، بەتاک، وا، واز، والا، وەتاک، ڕاستەڤەکری، ڤالا، کریاوە، وەلا، سەرواز، سەرنەگیراو.

**مفتوق:** لە (**فتق**)دا بیدۆزەوە.

**مفتول:** بادراو، وادراو، کشتەک، ڤادراو.

**مفتول من اللیف:** کەندر، کندر.

**حبل المفتول:** خرێنە.

**غیر مفتول:** خاو، بانەدراو، بێ باف.

**مفتون:** ١- لە ئاژاوە و گێچەڵ کەوتوو ٢- گراو، شەیدا، سەوداسەر، دێوانە، دەیری، دەهری.

**مفتي:** هیربزان، ڕێدەر، قۆلکێش، زانایەکە بەپێی دەستوورانی ئایینی قۆڵ بۆ کاران بکێشێ.

**مفجوع:** کۆست کەوتوو، کولافە، دڵشەوتی، دڵسووتاو.

**المفحم:** پسک، فسەزمان، زمان گیراو.

**مفحمة:** خەڵووزدان، سوخاڵدان، ڕەژوودان.

**مفحوص:** پشکنراو، پشکێنراو.

**مفخرة (ج) مفاخر:** مایەی شانازی و سەر بڵندی.

**مُفَخَّم:** گەورە، زۆر پایەبەرز، بەرێز

**مفدي:** قوربان، بەلاگێڕەوە.

**مَفَرّ:** پەنا، پەناگا، هەلاتگە.

**مفرِح:** بووژێنەوە، گەشێنەوە، دڵخۆشکار.

**مفرَح:** بووژاوەوە، شادمان، کەیفخۆش، خەرۆ، دڵخۆش.

**مفرَح القلب:** دڵخۆش، دڵگەش، دڵکراوەوە.

**مفرد:** لە (**فرد (ج) افراد**) بیدۆزەوە.

**- بائع المفرد:** تاکفرۆش.

**- بائع المفردات:** وردەواڵە فرۆش، خوردەواتفرۆش.

**مفرش (ج) مفارش:** ڕایێخ، ڕایەخ.

**مفرط:** فیشاڵکار، هەفشک، پێوەنەر، بەفیشاڵ، بافیشکار. تێپەڕ، لە سنوور تێپەڕ.

**مفرَغ:** مەفرەق.

**مَفرق (ج) مفارق:** ١- دوو ڕێیان، چوار ڕێیان ٢- تەوقی سەر.

**مفرِّق:** جوداکار، جیاکار، دابڕ، هەڵبڕ، هەڵبڕێن.

**مفرقعة (ج) مفرقعات:** تەقەمەنی، ترەقە.

**مفروز:** جوێ کراوەوە، جوێ بووەوە، هەڵبراو، دابڕاو.

**مفروش:** ڕاخراو، داخراو.

**مفروض:** ١- گەرەک، پێکهاتوو ٢- دراو (لە ئەندازیاری).

**مفروق:** لە (**فرق**)دا بیدۆزەوە.

**مفروم:** ئەنجنراو، جنراو.

**مفزِع:** داچڵەکێن، ڕزاوبەر، ترسێن.

**مفزَع:** ترساو، ڕزاوبراو، داچڵەکاو.

**مُفسد:** لە (**فساد**) بیدۆزەوە.

**مفسدة (ج) مفاسد:** هۆی دوو زمانی و خراپی و گەندی.

**مفسِّر:** لێدوو، ڕاڤەر، واتا لێکدەرەوە، لەسەررۆ، زمانزان، زوانزان.

**مفشّي:** ئاشکراکار، زمانشڕ، پێ لێنەر.

**مفشّي الاسرار:** ڕازدەرخەر، ڕاز ڕانەگر، درکێن، پێ لێنەر، درکێنەر.

**مفصد:** نەشتەر.

**مَفصَّل:** بەش بەش و لێک جوێ کراوەوە، دووروودرێژ، درێژە پێدراو، لێدواو، بەپێچەوانەی کورتە، دووڤدرێژ.

**مَفصل (ج) مفاصل:** لە (**فصل**)دا بیدۆزەوە.

**مَفصل الفخذین:** نێک، کلۆمک.

**مَفصّلاً:** بەدووروودرێژی.

**مفضال:** کەسێکە زۆر زانا و هونەرمەندبێ.

**مفضَّض:** زێوکێش، ئاوەزێوکراو، زێوین، ڕووکێشی زێو.

**مفضّل**: پەسند، پەسندکراو، بەباشترین هەڵبژێردراو.
**مفضوح**: ئابڕووبراو، هەتک کراو، ترۆ، ڕیسوا.
**مفطر**: ناشتاشکێن، ڕۆژووشکێن.
**مفطور**: ئافەریدەکراو، پەیدابوو، سروشت و دەروونی ئافەریدەکراو.
**مفطوم**: منداڵی لە شیرکراوەوە.
**مفعول**: کراو، کریاک، پیشکبەر.
**مفعول العمل**: کاری کراو، کار ئەنجام.
**مفقود**: بزر، گوم، ونبوو.
**مفقود الاثر**: شوێن براو.
**مفقود الشعور**: کاس، تاساو.
**مفكرة**: یادنامە، بیرەوەخەر.
**مفلاق (ج) مفاليق**: سووک، نزم، دەست بەتاڵ.
**مَفلح**: ڕزگار، پیرۆز، سەرکەوتوو.
**مفلس**: نابووت، لات، مایەپووت، بێ پووڵ و پارە، دەست بەتاڵ، مایەپووچ، ناویت، هالکەنی، ڕووشاوان حاڵ، سالووک.
**مفلق**: بوێژێکە وتەی سەیر بەکاربیات.
**مفلوج**: کۆج، شەپلەلێدراو.
**مفكّر**: پربیر، بیرکەرەوە، زۆر بیرکەرەوە، ڕامێن، تێرامێن.
**مفكّرة**: هۆشێنە، هۆشێنەر، یادهێنەر، بیرنامە، یادێنەر.
**مفني**: لەناوبەر.
**مفهوم (ج) مفاهيم**: واتا، چەمک.
**مفوض**: لە (فوض)دا بیدۆزەوە.
**مفوض الخفر**: سەرپاسەوان، سەرکێشکچی.
**مفوض الشرطة**: سەرپۆلیس.
**مفيد**: سوودمەند، بەقازانج، بەردار.
**– غير مفيد**: بێ سوود، سەر، سهرک، بێ کەلک، بەیار.
**مقابل**: بەرانبەر، ڕووبەڕوو.
**– بدون مقابل**: بێ بەرانبەری، خۆڕا، خۆڕایی.
**مقابلة**: بەرانبەری، ڕووبەڕووکردنی دوو یا چەند چتان. ڕووبژار، ڕووبەڕوویی، لە زاراوەی بدیع برێتییە لەوە کە لە نێوانی پارچەکانی دوو ڕستە یا دوو لەتکە هەڵبەستان دژی و جیاوازی هەبێ.
**مقابلة صحفية**: دیدەنی.
**مقاتل**: شەرکار، شەرفرۆش، شەرەوان، بکوژ، کوژندە.
**مقاتلة**: لێکدان، شەڕ لەگەڵ یەکتری کردن.
**مقاربة**: لە (قرابة)دا بیدۆزەوە.
**مقارن**: نزیک، هاورێ.
**مقارنة**: بوونە یار و هاورێی یەکتری، نزیکی، بەرانبەری، بەراوەرد، لێک نزیک بوونەوە.
**بالمقارنة**: لەچاو.
**مقاسمة**: چتێکی لەگەڵ یەکتری بەشکردن، سوێند خواردن، سوێندان.
**مقاس**: دەمکانە، دەمووکانە.
**مقاساة**: لە بەرانبەر سەخت و ڕەنج و ئازار خۆڕاگرتن، چەوسانەوە، ڕەنج کێشان.
**مقاطعة**: لە (قطعة)دا بیدۆزەوە.
**مقال**: وتووێژ، قسە، وتە، گوتە، گۆتە، قەواتی، کەڤنە شۆب، وتار.
**مقالة (ج) مقالات**: وتار، قەواتی.
**المقالة الادبية**: وتاری وێژەیی.
**مُقام**: لە شوێنێکی ئارامگرتن و داکاسان، جێگا، زەمینە.
**مَقام (ج) مقامات**: کۆگە، کۆمەڵگە، پایە، جێ، جێگا، دەڤەر، دێلەڤ، ژێرە لە (جەبر)دا.
**مَقامة (ج) مقامات**: وتار لە تصوف، پەشیمانییە (تۆبە).
**مقامر**: قوماریاز، قومارچی.
**مقامرة**: پێکەوە قوماركردن.
**مقاول**: وەخۆگر، وەستۆگر، بەڵێندەر، بەڵێندار، دەستەبەر.
**مقاولة**: لە بارەی کارو فەرمان یا وتووێژێکییەوە بڕیاردان پێکەوە.
**مقاوم**: بەرگر، بەرگەگر، بەربەرەکانیکار.
**مقاوم**: پێشگر، بەربەرەکانیکار.
**مقاومة**: بڕوانە (قاوم مقاومةً).
**مقايسة**: ١- ئەندازەی دوو چت یا دوو کاران پێکەوەگرتن، خەمڵکردن، وەگرتن، دانان، بەراوەردکردن، بەراوەردکردنی دوو چت ٢- ژێرە، بنە، لە ژمارە و پێوانێ.
**مقايضة**: هێلکە شکانێ، هێلکەشکێن، ئاڵشت.
**مقاييس السطوح**: پێوەرەکانی ڕوو.
**مقبرة (ج) مقابر**: گۆڕستان، گۆڕسان، زەهمان، گۆڕخانە، موغبەرە.
**مقبض**: دەسە، دەسک، دوڤک.
**مُقبِل**: ڕووتێکەر، هاتوو، داهاتوو، دادی، ئایندە.
**مُقبَل**: ڕووتێکراو، ئایندە، داهاتوو.
**مقبلاً**: ١- هەڵتەک هەڵتەک، ڕووتێکردن ٢- لە داهاتوودا.
**مقبوض**: وەرگیراو، گیراو.
**مقبول**: وەرگیراو، پەسندکراو، پێ خۆشبوو، پەسەن، پەسند، هەویان، خۆشهاتوو، لە خوا خۆشهاتوو، بەجێ.
**مقت**: دوژمنایەتی کەسێکی کردن.
**مقتبس**: سوود وەرگر، ڕووناکی گیر.
**مقتحم**: بێ بڕوا، کەسێکە بەبێ لێکدانەوە دەست لە کارێکی بقەدارەوە بدات.

**مقتدر**: لە (**اقتدار**)دا بیدۆزەوە.
– **غير مقتدر**: بێ توانا، ناتوان.
**مقتدي**: وەدووکەوتوو.
**مقتدى**: ئەو کەسەیە رووی تێ بکەن و وەدووی بکەون.
**مقترح**: داهێنەر، پێشنیازکار، زووهەڵبەس.
**مقترن**: لێک نزیک، دۆست، یار.
**مقتصد**: بەئابوور، ئابووریناس، ئابووریزان، ئابوورکار، ئابووریکار.
**مقتصر**: کورتکراوە، قوڵەکراوەوە.
**مقتضب**: براو.
**مقتضي**: پێداویست، هۆ.
**مُقتضي**: داخواز، داواکار، ویستەر، خواستەر، خوازۆک، بخواز.
**مقتضيات المصلحة العامة**: ویستەمەنیەکانی بەرژەوەندی گشتی.
**مقتفي**: لەبەر بێ کەسێتی رۆیشتوو، وەشوێن کەوتوو.
**مقتل (ج) مقاتل**: کوژتنگە، کوژتارگە.
**مقتنع**: چاوتێر.
**مقتني**: خاوەند، دەست کەوتوو، وەدەست هاتوو.
**مقتول**: کوژراو، کوژاو، کوژیاگ.
**مقحم**: ضعيف، سست.
**مقدار**: لە (قدر (ج) (قدار)دا بیدۆزەوە.
**مقدار اتجاهي**: بڕی ڕێبازی، بڕێ ڕێبازانە.
**مقدار غير اتجاهي**: بڕی نارێبازی، بڕی نارێبازانە.
**مقداراً**: هەندێک، هەنێ، هەندێ.
**مقداراً آخر**: هەندێکی تر، کەمێکردی.
**مقدار الجبري**: چەردەی جەبر، هەندەی جەبری.
**مقدار ذلك**: هەندەی دی، هێندەی دی، هەندو، هەفقاس.
**مقدار ضئيل**: کەمێ، چکێ، تۆزێ، نەختێ.
**مقدار كافي**: گوژمە.
**مقدار قليل**: کەمێک، نەختێک.
**مقدام**: ئامادە، بۆ شەڕ و هەڵمەت، ئازا.
**مقدح**: ئەستێ، ستێ، هەستە، ستە.
**مُقدَّر**: سەرنووێشت، چارە، چارەنووس، هەنگامە، ڕووداو.
**مقدّر**: خەمڵچی، واگر، وادانەر.
**مقراض**: دووارد، تۆڕتۆ، مەگریجەنی.
**مقدَّر**: بەر کەتی، لە چارە نووسراو، بڕیار لەسەر دراو، چارەنووس.
– **مدى المقدرة**: یارا، توانا.
**مقدّس**: پاک، پیرۆز، دەوڵەتی.
**مقدم**: لە کۆچ گەر، ئەمە کاتی هاتن.

**مقدَّم**: پێشوو، پێشی، هاتوو، پێشایی.
**مقدمة**: سەرەتا، بەرایی، پێشدەست، پێشڕۆ، پێشەنگ، بەربێژی، بەرگۆتن، دەرامەد، دەستپێکی، پێشەکی، دەست پێشی، بەرایی.
**مقدور**: ئەوەی لە توانا دایە، توانا.
**مقذوفات بركانية**: هەڵپڕژاوی ئاگرپژێنی.
**مقر**: بارەگا، ئارامگا، ئارامگر.
**مقر السلطنة**: شانشین، میرنشین.
**مقر عسكري**: بنکە.
**مقر القيادة**: بارەگای لەشکری.
**مقرار**: خوێندنگە، خوێندنخانە.
**مُقرّ**: ددان پێدانەر، پێ لێنەر.
**المِقربة**: دەستەک.
**مقرر**: بڕیار دراوە، بڕیار لەسەر دراو، ئارامگرتوو.
**مقرنس**: میچ یا گونبەزێکە بەگێچی نەقش و نیگاری دەریەڕیو و پلە پلە دروست کرا بێ.
**مقروء**: خوێندراوەوە.
**مقروض**: قەرزدار، براو، گەزتراو.
**مقرَّب**: نزیک.
**مقروع**: کوتراو، گەورە و مەزن.
**مقرون**: نزیک، نێزیک.
**مقدمة الكتاب**: پێشدەستی، دیباچە، دیواچە.
**مقريء**: خوێنەر، کەسێکە خوێندنەوەی قورئانی فێری خەڵکی بکات.
**مقدمة الجيش**: سەرجەنگ، پێشجەنگ، سەرهەنگ.
**المقزحة**: خوویدان، نمەکدان.
**مقسط**: دادگەر، دابەشکار.
**مقسم**: بڕوانە قصابە.
**مقسم**: دابەشکار، دابەشەر.
**مقسوم**: بەشکراو، دابەشراو.
**مقسوم علي (÷)**: نیشانەی دارەبەش بەرکەوتوو.
**مقسوم عليه**: بەشدراو، بەسەر دابەشکراو، ژمارەیێکە کە ژمارەییێکی تری بەسەردا دابەش کرابێ.
**مقشَّر**: دارنراو، داماڵراو، پاککراو، تیکوڵ یا پێست لێ کراوەوە، داڕووشاو.
**مقشِّر**: دارن، پێست یا تیکوڵ لێکەرەوە.
**مقشط (ج) مقاشط**: مرازی کەوڵکردنێیە، ئامرازێکە پێستی مالات و ئاژەڵانی پێ لێ دەکەنەوە.
**مقشور**: بڕوانە مقشَّر.
**مقصَّب**: زەڕی، زەربان، ئەستوور و ڕەق، زێڕباف، زێڕباخن، زەڕین.

**مقصبة**: قامیشەلان.
**مقصد (ج) مقاصد**: لە (قصد)دا بیدۆزەوە.
**مقصّر**: کورتکەرەوە، قوڵەکار، کۆتایی کار، سستی کار.
**مقصلة**: سەربڕ، چەشنە مرازێکی خنکاندنێیە سەری مرۆی لە لەشی جووێ دەکاتەوە.
**مقصود (ج) مقاصد**: ئامانج، ویستراو، ئارەزوو کراو، مراز.
**مقصور**: کورتکراوەوە.
**مقصورة**: لە (قصر ومقصور)دا بیدۆزەوە.
**مقضي**: تەواو بوو، ڕەوا بوو.
**مُقطِّر**: تکێن، داچۆڕەر.
**مُقطَّر**: تکاو، چکا.
**مقطع (ج) مقاطع**: برگە، پچرگە.
– **متحد المقطع**: هاوبڕگە.
– **شبه مقطع**: لابڕگە.
**مُقطَّع**: ئاوارە، دەربەدەر.
**مقطف**: دەسەچینە، دەستە چینە.
**مقطفة**: قەرتاڵە.
**مقطوع**: بڕاو، بڕدراو، پارچەکراو، پساو، پسێنراو.
**مقطوع الريش**: کۆتەرە.
**مقطوع اليد**: دەستبڕاو، یەکدەست.
– **غير مقطوع**: نەبڕاو.
**مقعد (ج) مقاعد**: دانیشتگە، نیشتگە. قوون، کوون، کۆمیە، کۆم.
**مُقعَّد**: ئاڵۆز، گرێچن، گرێ گراوی، بەپێچوپەنا، ناسازگار.
**مقعَّر**: قوپاو، کلۆر، ناوچاڵ، قووڵ.
**مقعر الوجهين**: هەردووک ڕوو قوپاو.
**مقفع**: سەرشۆڕ، سەرەوژێر، کەسێکە دەستەکانی کرژ و هەڵقرچا بێ.
**مقفل**: قفل دراو، بەستراو.
**مقفى**: پاشبەند ڕێک، بەشی قەندار، دوا ڕێکوپێک.
**مقل**: دەروێش، دەستکورت.
**مقلاة**: تاوە، ئاخلیفینک، ڕیترو، ڕمپێشک، ڕوون پێژ، لنگ.
**مقلاع (ج) مقاليع**: لە (قلع)دا بیدۆزەوە.
**مقلب**: وەرگێڕ، ئاوەژووکەرەوە، سەرەونخونکەرەوە.
**مقلة** (ج) مقل: (مقل العين: گلێنەی چاو)، گلێنکە، گوزا چاڤ، گلارەکانی چاو.
**مُقلِّد**: لاساییکەرەوە، پەسخەلی، هەنە کچی، هەنە کار، هەنە کۆ، لاسایی کار.
**مقلع**: هەڵکەنەر.
**مقلق**: جاڕسکار، جاڕس و هەراسان و تەنگاوکار.
**مقلّم**: خەت خەت، خیت خیت، دێغ دێغ.

**مقلمة**: قەڵەمدان.
**مقلوب**: لە (قلْب)دا بیدۆزەوە.
**مقلوع**: هەڵکەنراو، هەڵقەندراو.
**مقلّى**: سوورکراوەوە.
**مقمر**: مانگەشەو، ماتاو، مانگەڕۆژ، هەویەشەو، هەویزۆک، تاڤهەی.
**مقمعة**: گۆپاڵ.
**مقمل**: ئەسپێوون، دژووێن.
**مقنع**: سەرپۆشی ژنان.
**مقنع**: تێگەیێن، دابینکار، لاسدەر، تەفرەدەر.
**مقنع**: سەر و پۆتراک داپۆشراو.
**مقنن**: یاسا دانەر، دەستوورناس.
**مقني**: کارێزکەن، کارێز هەڵکەن.
**مقهور**: شکاو، ڕقوقین لێ هەڵگیراو.
**مقهى (ج) مقاهي**: چاخانە، چایخانە.
**مقوال**: خۆشزمان، قسەباش، زمان پاراو.
**مقود (ج) مقاود**: کەمەندە، کەمەن، جڵەو، هەوسار، هەڤسار، قەراسە، دەستەوسار، دەسکە جڵەو، دەستە جڵەو.
**مقوس**: کەوانەدار، گەودار.
**مقوقس**: باڵندەی تۆقدار و ناوی پادشایەکییە.
**مقولة**: وتار، گوتار، گوفتار.
**مقوم (ج) مقومات**: ڕاستکار، مەزندەکار، نرخپرس، سروداگەر، ڕاگر، ڕاستکار، ڕاستکەرەوە، ساخکەرەوە.
**مقوى**: مقەبا.
**المقوى المموج**: موقەبای لۆچدار.
**المقوي**: هێزدەر، تواناییدەر، بەهێزکار، هێزبەخش، بووژێنەوە.
**مقيء**: ڕشێنەوە، دەرمانی هەراژ، دەرمانی ڕشانەوە.
**مقياد (ج) مقاود**: هەوسار، هەڤسار، قەراسە، ڕست، جڵەو، لڤان Livon.
**مقياس (ج) مقاييس**: پێوەر، پێوانە، ئەندازەگر، ئەندازە مرازێکی وایە ئەندازەی جێ پێ دیاری بکرێ، ئەندازەژمێر.
**مقياس الارتفاع**: پێوەری بەرزی.
**مقياس التشاقلي**: پێوەری وێچوواندی، پێوەری قورسەکی، پێوەری وێنەپێو.
**مقياس الخارطة**: پێوەری نەخشە، پێوانەی نەخشەکە.
**مقياس الرسم**: پێوەرەکانی ڕوو (ماتماتیک)، پێوەری وێنەکێشان.
**مقياس الرطوبة**: شێ پێو.
**مقياس السطوح**: پێوەری ڕوو.
**مقيد**: پابەست کراو، پێوەند کراو، گرفتار، دەربەست، گیر، گیراو، گیری، گیرۆ، گیرۆدە، دەربەس، دەربەن، دەربەند.

**المقيظ**: هاوینەهەوار، ئێلاخ هاوینەوار.

**مقيم**: له (اقامه)دا بیدۆزەوە.

**مك**: له جێ چوواندن، لەگە بردن.

**مك العظم مكاً**: ئێسک مژین، مژتن.

**مكاء**: شوانهەڵخەڵەتێنه، شکانشته خلیک.

**مكابرة**: خۆ بەفیز و گەوره نواندن.

**مكاتبة**: نامه بۆ یەکتری نووسین.

**مكار**: فێڵەزان، دفنان، چڤۆ، خاپۆ، تافتەخۆر، چاتانه، گزەوون، جامباز، جانباز، خۆقەباز، نازکار، خاپینۆک، ڕیپۆکار، ڕیپۆر، فەنباز، کەیووا، نیاتەکار، وڕ وڕە، فێڵباز، تەفرەدەر، کەڵەکباز، شێوەباز، فریوباز..

**مكاري**: بەکرێدەر، کەسێکە ئەسپ و وشتر و هەموو جۆره چوارپێیەکی بەکرێ بدات.

**مَكاس**: باجگر، ڕادار،گومرگچی، باج ئەستێن، ڕاگر.

**مِكاس**: دوودڵی و نیگەرانی له فرۆشتندا، نرخ کەمکردنەوە، چەنه لێ دان، کڕیار و فرۆشیار.

**مكاشر**: دەراوسێی نزیک، ددانگر.

**مكاشفة**: ئاشکراکردن، دەرخستن فەرمانێکی کراوه له ڕووی چتێکی نهێنی وا نەمان.

**مكافأة**: پاداشت، دفنان، تۆڵەی چاکه دانەوە، پاداش، ئیزا، ئەمەک، ئەمەگ، خەڵات، بەخشش.

**مكافح**: پێشگر، بەربەرەکانیکار، تێکۆشەر.

**مكافحة**: تێکۆشین، پێشگرتن، بەربەرەکانی کردن، قڕان تێخستن.

**مكافحة الحشرات**: گەزنده قڕان، مێش و مەگەز لەناو بردن، قەلاچۆ تێخستنی زیندەواران.

**مكافئ**: هاوهێز، تۆڵەدەرەوە.

**مكالمة**: له (كلمة تكلما)دا بیدۆزەوە.

**مكافيء**: ئەوەیه که لەگەڵ چینێکی تر بەرانبەر و هاوچەشن بێ.

**مكان (ج) امكنة**: جێگا، جێگه، جێ، حاس، جا، گا، گه، وەند، جهێ، دەڤەر، کۆ، لۆر، دێلەڤ، جاگه، تەڤگەر، دان، سار، سان، شوێن، هەرەمێن، (یاگه) کورتکراوەوه.

**مكان لحج**: تەنگەبەر، شوێن تەنگ.

**المكان الوعرة والمنيعة في الجبال**: یاس.

**مكانة**: پایه، پله، شان.

**مكانفة**: یارمەتی یەکتری دان.

**مكاني**: شوێن، کلۆس.

**مَكّب**: کەبابخانە.

**مكّب**: غەر غەرەی دەزوو.

**مُكِبّ**: سەرشۆڕ کەسێکه هەمیشه تەماشای زەوی بکات و سەری خۆی بەرز نەکاتەوە.

**مُكَبّر**: بانگدەر.

**مكبّرة**: بڵند بێژرد، بڵێنه بێژردم.

**مكبّرة**: زلکار، گەورەکەرەوە.

**مكبس (ج) مكابس**: مەنگەنه، مەنگەنه، جەڕ و مەنگەنه، مەنگەنەی پەستاوتن، پەستێنەر.

**مكبس دولَر**: پەستێنەری گەڕۆک، پەستێنەری خولاوە.

**مكبس المائي**: پەستێنەری ئاوی، مەنگەنەی ئاوی.

**مكبس**: پەستێنەر.

**مكبوب**: ڕژاو، سەرەوژێر، بەرەوخوار، قلپ بووەوە.

**مكبوس**: ئاخنراو، پەستاوتراو، داپەستاوتراو، داپەستوو.

**مكتب (ج) مكاتب**: نووسینگە، فێرگە، خوێندنگە، قوتابخانە.

**المكتب الخاص**: نووسینگەی تایبەتی.

**المكتبة**: پەڕتووکخانە.

**المكتبة العامة**: پەڕتووکخانەی گشتی.

**مكتتم**: پەنهان ڕاگر.

**مكتحل**: کەسێک چاوی خۆی ڕەش کردبێ.

**مكتسب**: وەدەستهاتوو، دەستکەوتوو.

**مكتشف**: داهێنەر.

**مكتوب (ج) مكاتيب**: نامه، ڕەشبەڵەک، قاقەز، دەستنووس، ئابادی، نووسراو.

**مكتفي**: بەس، هەرهەنده.

**مكتنف**: دەورەدەر، یاریکار.

**مكتوم**: پۆشراو، پەنهانکراو، ڕاز، نهێنی، پەنهان.

**مكث**: ڕاوەستان، مدران، مدرای، جێگیر بوون، گیر بوون، وه درەنگ کەوتن، چاوەڕوان بوون، درەنگ کردن.

**مكثاف ومكثف**: خەستکار، خەستەر، چڕکەرەوە، خەستکەرەوە.

**مكثر**: دەوڵەمەند، دارا.

**مكثف**: خەستکەر، خەستەر.

**مكحلة**: کلدان، کلتوور.

**مكحول**: کل له چاو کراو، ڕەژیاگ، کل له چاو کێشراو، چاو ڕشتوو.

**مكدر**: ئازاردەر، چرووسێنەر، ئازار چێژتوو، چرووسادەوە، دڵگیر، شلوێ، دڵگران، دڵتەنگ، دڵڕەنج، دڵخووەر، دڵەن، دڵمەن، دڵمەند.

**مكدي**: (ه) گەدا، دەرۆزەکار، سواڵکار.

**مكذب**: وەدرۆ خەرەوە.

**مكذوب، مكذوبة (ج) مكاذيب**: درۆ.

**مكر (ج) مكور**: فێڵ، فرۆفێڵ، تەڵەکه، بەند، باو، بەندوباو، فریو، ڕیپ، ئارداف، ناز، چڤ، خاپۆ، گۆبەند، گزەوون، چاپ و چووپ، خاپ، ڕاو، ڕەنگ، فەنبازی، کەڵەک، داو.

**مكرر**: دووپات، دووپات کراوەوە له (تكرار)دا بیدۆزەوە.

**المكرشة**: گیپە.
**مكرم**: ڕێزگر، قەدرگر.
**مكرم**: ڕێزکراو، قەدرگیراو.
**مكرمة (ج) مكارم**: گەورەیی، مەزن.
**مكرة (ج) مكارة**: ڕەنج و سەختی و ناخۆش، ئەوەیە بێز و بۆنی لێ بکرێ.
**مكروه**: ناحەز، بێزو و بۆ لێکراو، ناپەسند، نارەوا، گەند، گەندەژە، ناشیرین، قۆڵ بۆ نەکێشراو.
**مكس**: خەراج، باج وەرگرتن، ڕاداری، باج.
**مكسب (ج) مكاسب**: ئەوەیە کە لە کڕین و فرۆشتندا دەست دەکەوێ، قازانج، سوود، دەستکەوت.
**مكفوف**: کوێر، نابینا.
**مكسر**: شکاو، تێکشکاو.
**مكسور**: شکاو، تێکشکاو.
**مكشوف**: لە (کشف)دا بیدۆزەرەوە.
**مكعب**: لەشێکە خاوەندی شەش ڕووی چوارگۆشە بێت.
**مجموع مكعبين**: سەرجەمی دوو سێ جا.
**الفرق بين المكعبين**: جیاوازی نێوانی دوو سێ جا.
**مكعب**: کەوش، قۆندرە، سۆڵ.
**مكمل**: کاکۆڵدار، خوڵا، نەدار.
**مكلف**: ناچارکراو، بەسەردا بڕاو، بەسەردا سەپاو.
**جندي مكلف**: قاف، پێشمەرگەی زۆرە‌یی.
**مكلل**: لە (تكليل)دا بیدۆزەوە.
**مكمل**: دواکەوتوو، بەجێماو، دواکەوتە.
**مكمل**: تەواوکار، بڕکار، پڕکەرەوە.
**مكمن**: لە (کمين)دا بیدۆزەوە.
**مكمن الصياد**: لە (کمين)دا بیدۆزەوە.
**مكن، تكن**: گەرای کوللە و مار و ئیتر.
**مكنة**: هێز، توانایی، دەوڵەمەندی، ماڵ، دەوڵەت، سامان.
**مكنسة**: لە (کنس)دا بیدۆزەوە.
**مَكنَّف**: چی دەورەدراو.
**مكننة**: مەکانیزمە.
**مكنوز**: لە گەنجینە دانراو.
**مكنون**: پۆشراو، شاردراوەوە، پەنهان.
**مكواة (ج) مكاو**: وتوو، ئوتوو.
**مكوس**: گومرگ، باجی گومرگ، باجگیری.
**دار المكوس**: گومرگ.
**مكوك (ج) مكاكيك**: تاسی ئاوێیە، مێکوکی جۆلایی و ئیتر، مەکۆ، شەپۆڵ، مەکۆک.
**مكوكب**: ئەستێرەدار، ئەستێرەنیشان.
**مكوم**: کۆماکراو، بەسەریەکدا هەڵدراوەوە.

**مكون**: پێکهێنەر، داهێنەر، پێکەوەنەر.
**مكوي**: لە قاقدەر، دەقدەر، وتووچی، وتوولێدەر، وتووکێش.
**مكياج**: ئارایشت.
**مكيال**: پێوانە، ئەیار، کۆڵ.
**مكيال الطان**: کەپوولە، کەپیلە.
**مكين**: جێگرتوو، خاوەند و جێ و پایە.
**مكينة (ج) مكانات**: پلە، پایە، هێمنی، نەرمی.
**مكينة (ج) مكائن**: ماشین، ماشینە.
**المكائن البسطة**: ماشێنە سادەکان.
**ملك الساعة**: کۆک کردنی کاتژمێر، بارکردنی کەژمێر.
**مل ملا**: کز و خەمناک بوون، نەخۆش و ناساز بوون.
**ملا**: ئاوکێش، ئاوهەڵێنج.
**ملء**: پڕ بەکاسەی.
**الملء**: پیروتژی کردن، ڕتماندن، سیلەکردن، دەستەیێک مرۆ.
**ملأ ملأ**: پیروتژی کردن، ڕتماندن، سیلەکردن، دەستەیێک مرۆ.
**ملأ الساعة**: کەژمێر بارکردن، کاتژمێر کۆک کردن.
**ملء القلب**: پڕ بەدڵ.
**ملء الكف**: کۆڵ، کۆلم، لاوێچ، پڕ بەمستی.
**ملء اليد**: پڕ بەدەستی، پڕ بەمستی.
**الملاء**: پەسیوی، هەلامەت.
**ملاء (ج) ملاء**: پەسیوی، هەلامەت.
**ملائكة**: فرشتە، فریشتە.
**ملائم**: نەرم، سازگار، لەبار، کیس، بژوون، دەستدان.
**– غير ملائم**: نالەبار، ناسازگار، تووش.
**ملابس**: پۆشەمەنی، جلوبەرگ.
**ملابس الحداد**: کووێن، ڕەشپۆشی.
**ملابس الرثة**: جلوبەرگی دڕاو، جلوبەرگی ڕزیو و کەنەفت.
**ملابس الشتوية**: جلوبەرگی زستانێ.
**ملابس صيفية**: جلوبەرگی هاوینێ.
**ملابس ضيقة**: جلوبەرگی تەنک، بەرگی چەسپ.
**ملابس عتيقة**: جلوبەرگی کۆن.
**ملابس مفتوقة**: جلوبەرگی هەڵپچڕاو، جلوبەرگی هەڵوەشاو.
**ملابس ممزقة**: جلوبەرگی لە کارکەوتوو.
**ملابسة**: تێکەڵاو بوونی کاروبار، سەر لێ شێوان.
**ملاح**: مەلەوان، مەلەڤان، ئاوباز، کەشتییەوان.
**ملاح بحرية**: کەشتییەوان، مەلەوانی دەریایی.
**ملاح العوامة**: کەڵەکەوان.
**ملاحة**: مەلەوانی، کەشتییەوانی، مەلەڤانی، ئاڤژەنی.
**ملاحة بحرية**: کەشتییەوانی، مەلەوانێتی دەریاییە.
**مديرية الملاحة العامة**: بەڕێوەبەرایەتی دەریاوانی گشتی.
**مَلاحة**: جوانی، شرینی، شۆخی، چاکی، زرێوانی.

**ملاحظ:** بڕوانە لاحظ، ملاحظة.

**ملاحظة:** بەگۆشەی چاو تەماشا کردن، ڕوانین، سەرنجدان، وردەوە بوون، سەرنج یا سەرنجە.

**ملاة:** لە (لجا)دا تەماشایەکی (ملجا)ی بکە.

**ملاذ الاثام:** پشتوپەنای مرۆڤان.

**ملاریا:** لەرزوتا، سێبەڕۆ.

**ملازم:** هەمیشە لەگەڵ، هاوڕێ.

**ملازم العسکري:** سەرکردەی سوپایی.

**ملازمة:** هەمیشە لەگەڵ کەسێکی یا چینێکی بوون.

**ملاسة:** ماڵوو، نەرمی، ڕێکی.

**ملاصق:** پێکەوەنووساو، لێک نزیک.

**ملاط:** گڵ، گێچ، قوڕی سواخێ.

**الملاط الکلس:** قوڕ و قسڵ، گڵ و گێچ.

**ملاطفة:** لە (لطف)دا بیدۆزەوە.

**ملاعبة:** گەمە لەگەڵ یەکتری کردن.

**ملاعنة:** جنێو پێکدان.

**ملاقاة:** لە (لقاء)دا بیدۆزەوە.

**ملاقي:** لە (لقاء)دا بیدۆزەوە.

**ملاك:** گوڵ، بنچینە و مایەی چی، بەندیواری کار و فەرمانان یا ئەوەیە کە چتێک بەوییەوە ڕاوەستا بێ، (کادر).

**ملاك:** خاوەند ماڵ و سامان، ساماندار، خێوی، دێدار.

**ملاکمة:** شەڕە مستەکۆڵە، مستەکۆلانێ، بەمستەکۆڵە لێکدان، زۆرەدانی، زۆرانبازی، ململانێ.

**ملالة:** بێزاری، دڵتەنگی.

**ملال:** خەفەتباری، کزی، پەرۆشی، پەرێشانی، ناسازی، دڵتەنگی.

**ملام:** سەرزەنشت کراو.

**ملامة (ج) ملاوم:** لە (لوم و ملامة)دا بیدۆزەوە.

**ملامح:** ئاوکار، دیمەن، ڕووکار.

**ملامسة:** دەست لێکدان، دەست بەیەکتری داماڵین.

**ملآن:** پڕ، تژی، کەیل، تراز، تەژی، دنگ.

**ملبس:** پۆشراو، لەبەرکراو. نوقلی بادام، هێلکە چۆلەکە.

**ملبوس:** لەبەرکراو، پۆشراو.

**ملة:** خۆڵەمێشی گەرم، ژیلەمۆ.

**ملة (ج) ملل:** ڕێگا، ئایین. هۆز، گەل، نەتەوە.

**ملتئم:** وێکهاتنەوەی برین و چاک بوونەوە.

**ملتبس:** وێچوو، وێکچوو، داپۆشراو.

**ملتجئ:** پەنابەر، هانابەر.

**– قبول الملتجئ:** پەنادان.

**ملتحق:** پێکەیشتوو.

**ملتحم:** لە جێم کراو، جۆش خواردوو.

**ملتحمة:** دیوی ژوورەوەی پەلکی چاو.

**ملتزم:** وەخۆگر، لەخۆگر، دەستەبەر، دەستەبەرە.

**ملتصق:** پێوەنووساو یا لکاو.

**ملتطم:** دەریای هەستاو و شەپۆڵدار.

**ملتف:** تێکئاڵاو، پێچ خواردوو.

**ملتفت:** لا لێکەرەوە، ڕوو تێکار.

**ملتقط:** هەڵبژێر، چنینەوە.

**ملتقي:** دیتنگە، ژوانگە، شوێنی پێکگەیشتن.

**ملتقي النهرين:** دوو ئاوان.

**ملتئم:** سارێژ، وێکهاتووەوە.

**ملتمس:** ویستەر، تکاکار، داینەگیر، دەستەودامان دەستەوداوێن.

**ملتهب:** بڵێسەدار، تەشەنەدار، گڕگرتوو، داگیرساو.

**ملتهف:** ئاگری زمانەکێش.

**ملتوي:** گێڕ، لوول، مژخواردوو، پەپۆکەخواردوو، پێچ خواردوو.

**ملتوي المفاصل:** جومگە وەرگەڕاو.

**ملج ملجاً:** (ە) مڵچاندن، مڵچە، مڵچە مڵچ کردن، چڵپاندن مرچە مرچ کردن.

**ملجأ (ج) ملاجئ:** لە (لجأ)دا بیدۆزەوە.

**ملجم:** لغاو کراو.

**ملح:** پێداگر.

**ملح:** سپێکە تێکەڵ بەڕەش کرا بێ.

**ملح (ج) املاح:** خوێ، خێ، خوە، خووا، مەکێ، غەک.

**ملح بارود:** شۆرە.

**ملح الصخر:** بەردە خوێ، خوێی بەردی (کیمیا).

**ملح الطعام:** خوێی چێشت.

**ملح مغذي:** خۆراکە خوێ.

**– ارض ملحية، منبع الملح:** خوێتڵێن.

**– املاح معدنية:** خوێی کانی.

**ملحد:** لە ئایین دەرچوو، لە ئایین وەرگەڕاو.

**ملحفة:** (ە) لیفە.

**ملحق:** ڕەگەڵ کەوتوو، پێگەیشتوو، پێگەییوو، پاشکۆ، هاوڕێ، پاشەر، پێگەیاندراو.

**ملحق الثقافي:** پاشکۆی زانیاری، پاشەک.

**ملحمة (ج) ملاحم:** داستان. شەڕێکیشە کوشتاری زۆر تێدا ڕوو بدات.

**ملحن:** ئاوازدانەر.

**ملحوظ:** دیتراو، بەگۆشەی چاو تەماشاکراو.

**ملحية:** شۆرەکات.

**ملخص:** سەردەوس، کرۆک، کاکڵ، پوختە، کورتە، بەکورتی ڕاڤەکراو، کورتکراوە.

**ملدوغ، ملسوع:** پێوەدراو، مارانگاز، مار گەزتوو.

**ملذة (ج) ملذات**: خۆش هەوەس.

**ملزم**: کەسێکە کارێک یا فەرمانێک لەسەروی گەرەک کرا بێ، دابین بوو، داکەوتوو، دامرکاو.

**ملزم**: بەزێنەر، فستۆق، دابینکار.

**ملزمة (ج) ملازم**: بەند (لە لای چاپخانان بەند (١٦) لاپەڕەیە).

**ملزوم**: چی پێویست و بەکەڵک.

**ملساء**: لووس.

**ملصة**: دز گۆژگە، دز کۆشگە، دزگا.

**ملصق، ملصوق**: پێوەنووساو، پێوەلکاو.

**ملطاس (ج) ملاطس**: کوتکی بەرد شکاندنێیە.

**ملطخ**: تێوەدراو، پیسکراو.

**ملطخ بالدخان**: دووکەڵاوی.

**ملطفة**: نامە، پڕ لە میهرەبانی.

**ملعب (ج) ملاعب**: لە (لعب)دا بیدۆزەوە.

**ملعبة**: کراسی بێ قۆڵ کە منداڵان لە کاتی گەمەدا لە بەری دەکەن.

**ملعقة (ج) معالق**: کەوچک، کەفچک، کەفچی، کەفچە.

**ملعقة اشتعال**: کەوچکی سووتان.

**ملعقة خشبية كبيرة**: ئەسکوێ، چەمچە، ئەسکوو، کوودە.

**ملعقة الشاي**: کەوچکی چای.

**ملعنة (ج) ملاعن**: لە (لعنة)دا بیدۆزەوە.

**ملعون (ج) ملاعين**: بڕوانە لعين.

**ملغي**: پووچ کراوەوە، تێکدراو.

**ملف**: لیفە، غەڕ غەڕە. (لە فیزیک)دا: کۆیل.

**ملف في الكهرباء**: گلۆڵە، گولۆڵە.

**ملفة**: فایل.

**ملفة الخيط الحرير**: گلۆڵە، گولۆڵە، ماشەر.

**ملفة شخصية**: فایلی کەسێتی.

**ملفق**: ڕێکخراو، پێکهاتوو.

**ملفوف، ملفوفة**: لە (لف)دا بیدۆزەوە.

**ملقاط، ملقط (ج) ملاقط**: لە (لقط)دا بیدۆزەوە.

**ملقب**: نازناودار.

**ملقح**: پەیوەندکراو، کوتراو. پەڕێندراو.

**ملقح**: پەیوەندکار. پەڕێنەر.

**ملقلق**: خەمبار، دەنگ و هەرایەکە کە تێکەڵ ناسازگاری بێ.

**ملقى**: ئاوێژتراو، فڕێدراو.

**ملقي**: ئاوێژەر، فڕێدەر.

**ملك الموت**: فریشتەی گیان ئەستێن (عیزرائیل).

**ملك (ج) املاك**: مڵک، سامان، بۆچک، دەوڵەت.

**ملك (ج) ملكاً**: بوونە خاوەند سامان، بوونە خاوەند، خاوەندێتی کردن. داگیر کردن، دەست بەسەرداگرتن.

**ملك (ج) ملوك**: شا، پادشا، میر، خوسرەو. میرەک، خاوەند سامان، ساماندار.

**ملك الملوك**: شاهەنشا، میری میران.

**ملك النمل**: شامێروو، کەڵەمێروو.

**– اولاد الملوك**: شازادە.

**– بلاط الملكي**: شانشین، دەربار، ئەرک.

**– نديم الملوك**: شایار، شالیار، هاودەمی پادشا.

**ملكة**: شاژن، ژنمیر، خێزانی میری، شارەبانوو.

**ملكة النحل**: شاژنی هەنگان.

**ملكوت**: سامانی زۆر و فراوان، گەورەیی و دەسەڵات، دەستەڵاتی ئاسمانی شکۆ، جیهانی فریشتان.

**ملكة (ج) ملكات**: سامان و توانایی کاری یا چالاکی تێگەیشتن لە ئەنجامی ڕاهاتن و تاقیکردنەوەدا.

**ملكي**: هی منە، ماڵی منە، سامانی منە.

**مَلَكي**: شایانە، شاهانە، پادشایانە.

**ملكية**: پادشایی، پادشایەتی، شاهانە، ماف، ماڵ.

**ملكية**: خاوەندێتی، خودانی، خێوێتی.

**الملكية الزراعية**: بەخاوەند بوونی زەویوزار.

**ملل**: بێزاری، هەراسانی، ماندوێتی.

**ملم**: مەحلان، کارئاشنا، شارەزا، بەڵەد، لێزان، ئاشنا.

**– غير ملم**: نەزان، نابەڵەد.

**ملمة (ج) ملمات**: کێشە، هەنگامە، کارەسات، سەختی، دژواری.

**ملمع**: تروسکەدار، ڕەنگاوڕەنگ، ولاخ و ماڵاتێکە کە پەڵە و خاڵی لێ بەپێچەوانەی ڕەنگی خۆی پێوە بێ، مەلان لە ڕاوێژی (بدیعی)دا کەرتە (مصراع) یا بەیتێکی بەزمانی کوردی و ئەو کەرتەکەی تریش بەزمانی بیانییان بێ.

**ملموس**: دەست لێدراو.

**ملهوج**: کاڵ، کرچ.

**ملهوف**: خەمگین، دڵسووتاو، لێ قەوماو، زۆرلێکراو.

**ملهم**: دڵخورپێن، بەدڵداهێنەر.

**ملهم**: دڵخورپاو، بەدڵداهاتوو.

**ملهى (ج) ملاهي**: سەماگە، گۆبەندخانە، گەمەخانە، تەماشاگە، یاریگا.

**ملوان**: شەو و ڕۆژ.

**ملوث**: لە (لوث)دا بیدۆزەوە.

**ملوحة**: شۆری، سوێری.

**ملول**: لالووت، ئالۆز، دڵئێشاو، خەمبار، خەمناک، خەفەتبار، خەفەتناک، دڵگیر، بەپەرۆشن، کز، هەراسان، دڵپڕ، دڵتەنگ، دڵشکاو، ناساز.

**ملوم**: سەرزەنشت کراو.

**ملون:** لە (لون) و (تلوین)دا بیدۆزەوە.
**ملون:** ڕەنگێنەر، ڕەنگێن.
**ملي:** توانگەر، دەوڵەمەند، توانا.
**ملي (ج) مليون:** ئەو کەسەیە کە بەندیواری بەگەل و هۆزەوە هەبێ.
**مليارد:** هەزار میلیون.
**مليان:** پڕ، تژی، تەژی، کەیل.
**مليح:** جوان، شەنگ، شیرین زمان. سووتێر، شۆر.
**مليح القامة:** شۆخ ئەندام، بالاشیرین.
**ملين:** نەرمکار، شلکەرەوە.
**مليون (ج) ملايين:** دە جاران سەد هەزار (١,٠٠٠,٠٠٠) هەزار هەزار.
**مم، مما:** لە چی، لەوەی کە.
**ممات:** مردن، مرن، لەکاتی سەرەمەرگێدا.
**مماثل:** هاوچەشن، هاوتا، وەکو یەکتری.
**المماثل في الاسم:** هاونێو، هاوناو، هەڤناڤ.
**مماثلة:** وەکو یەکتری بوون.
**مماراة:** شەڕکردن، جەنگ کردن.
**ممارس:** دەرزێن، مەشقکار، خەریکی، ڕاهاتن، ئەرک کێش.
**ممارسة:** چارەکردن، خەریکبوون، دەست پێکردن، ئەرک کێشان، مەشق کردن، خەریکی ڕاهاتنێ.
**ممازح:** گەمەپێکار، سەر لە دوونەر.
**ممازحة:** سەر لەسەر نان، گەمە پێکردن.
**المماس:** لێکەوت، لێک سودان.
**مماشاة:** لەگەڵ یەکتری هەڵکردن، لەگەڵ یەکتری بەڕێگایەدا ڕۆیشتن.
**مماطل:** سەرچوون، ناڕاست.
**مماطل في الدين:** قەرز کوێر.
**مماطلة:** ئەمرۆ و سبەی پێکردن، سەرچەوتی، قەرز کوێری، دەستاودەست پێکردن، دەستی دەستی پێکردن، تەفرەدان، تەفرە.
**الممالك المتحدة:** ولاتە یەکگرتووەکان.
**مماليك:** نۆکەران.
**ممانع:** بەرگر، پەکخەر، دڵۆتێخەر.
**ممانعة:** یاساخی، پەکخستنی کاروباری کەسێک، بەربەست کردن، قۆرخ، بەرگری، بەرهەڵستی، بەرگرتن، پێگرتن، دڵۆتێخستن، ڕێگری، ڕێ نەدان.
**ممتاز:** تەرخان، ناقبر، نایاب، سەرگوڵ، بژاردە، هەڵبژاردە، هەڵبژێردراو، سەرتۆپ.
**ممتحق:** پووچکراوەوە، لەناو براو.
**ممتحن:** تاقیکار، تاقیکەرەوە، تاقەر، ئازمووکار.
**ممتد:** کشاو، کشراو، درێژە پێدراو، کێشراو، درێژ بوو.
**ممتزج، ممزوج:** تێکەڵاو، ئاوێتە، ئامێتە.
**ممتلك (ج) ممتلكات:** سامان، دارایی.
**ممتلك:** هەبوو، دارا.
**ممتلئ:** پڕ، تژی، تەژی، کەیل، لیپاو، لیپ.
**ممتلئ الوجه:** ڕووپڕ.
**ممتنع:** دوور، کەسێکە لە کاروبارێکیدا سەرپێچی بکات و سەر شۆڕ نەکات.
**ممتهن:** هیچوپووچ.
**ممثل:** نوێنەر، بندار، کارگوزار، ئەکتەر.
**ممحو:** لەناو چوو، لەناو براو، کوژاوەوە.
**ممحي:** قیران تێخراو، دووا براو.
**ممحي:** دوا برێن، لەناو بەر.
**ممخض:** ژاندراو.
**ممخضة:** مەشکە.
**ممخوض:** بڕوانە مخیض.
**ممد:** یارمەتیدەر، یاریدەدەر، یاریکار، یارمەتیکار.
**ممدوح:** هەڵنراو، پێ هەڵگوتراو.
**ممدود:** کێشراو، درێژکراوەوە. ڕاخراو، داخراو.
**ممر:** سەرەڕێ، چەقی ڕێگا، ڕاڕەو، ڕێباز، ڕێواز، شوێنی هاتوچۆ، ڕاگە.
**ممر الجبل:** دەربەند، دەربازگە.
**ممر مائي:** بووار.
**ممرض:** نەخۆشەوانی نێرینە.
**ممرضة:** نەخۆشەوانی ئافرەت. دایەن، تایەن.
**ممرن:** ڕاهێنەر، وەکارهێنەر.
**ممرن:** ڕاهاتوو، کارکردە.
**ممزق:** هەڵدڕ، دادڕێن.
**ممسحة:** پەڕۆ، جیل، تەختەسڕ، پەڕۆ یا مرازێکە چی پێ بسڕێتەوە وە یا بکوژێتەوە.
**مُمسك:** بەرچاو تەنگ.
**مَمسك:** دەستاوێژ، بالگە، قوڵە.
**ممسك:** قوڵف، هەنگڵ، قڵف، دەسک.
**مَمسكة، ممصة:** مۆدنە، دارجغارە، دەمتەجغارە.
**ممسوح:** سڕاوەوە، سڕاو، پاک کراو.
**ممسوخ:** ئەوەی کە وێنەی دی وەرگەڕاوە و ناشیرینتر بووە.
**ممشقة:** شانەی خوری.
**ممشوق:** بالابەرز و باریک ئەندام.
**ممشى:** ڕاڕە و ڕێڕەو، دالان، بێلایی، تێپەڕگە.
**ممصل:** کیسەی ماستی.

**ممصوص:** مژراو، مژتراو.
**ممطر، ممطرة:** هەوری بەباران، بارانی بەبارش.
**ممقوت:** دوژمندار، کەسێکە خەڵک ڕقی لێ بێتەوە و دوژمنایەتی بکەن.
**ممکن، یمکن:** دەشێ، دەبێ، دەگونجێ، لەوانەیە ببێ، ڕەنگە ببێ، لە تواناڎا دایە، گونجاو، ئاسان.
**ممکن الوقوع:** لەوانەیە ڕووبدات.
**مملحة:** خوێدان، نمەکدان، خوێدانک. خوێڵێن.
**مملسة:** ماڵوو.
**مملکة (ج) ممالك:** وڵات، وڵکە، هێڵ، خاک، کیشوەر، ماد، هەرێم، شانشین.
**مملول:** ئەوەی کە مایەی بێزارییە.
**ممنوع:** قەدەغە، قەدەغەکراو، قورغ، یاساغ، پاوان، بەند، پەکخراو، نەهێڵراو، بەربەستکراو.
**ممنون:** بەربار، پاپا. سوپاس، ماڵیاوا، ماڵاتە ئاڤا.
**ممنونیة:** بەرباری. سوپاس کردن.
**مموج:** شەپۆڵدار، گوڵدار، گوڵ گوڵ.
**ممیز:** هەڵبژێر، هەڵاوێر، جیاکەرەوە، جیاکار.
**ممیز:** بژاردە، ماخ، سەردەستە.
**ممیزة:** ڕەوشت، خووڕەفتار.
**مَنّ منًا:** چاکە لەسەر دانان، چاکە بەچاو دادانەوە.
**مَن (ج) امنان:** (ە) مەت، پووت، باتمان.
**مَنّ:** گەزۆ، شۆک، گەرگولە.
**مَن:** کێ، چ کەس؟
**مَن انت؟:** تۆ کێی.
**مَن انتم؟:** ئێوە کێن.
**مَن هو:** ئەو کێیە، کێیە (بۆ تاکێکی نێرینەی نەدیوە).
**مَن هي:** ئەو کێیە، کێیە (بۆ تاکێکی مێیینەی نەدیوە).
**من هما:** کێن، بۆ دوو کەسی نەدیوە کە نێر بێ یا مێ.
**من هم:** کێن، ئەوان کێن (بۆ گەلێکی نێرینەی نەدیوە).
**من هن:** کێن، ئەوان کێن (بۆ گەلێکی مێیینەی نەدیوە).
**- کل من:** هەر کەسێکی.
**مِن:** لە، ل، ژ، د، ج، نە، نەج، ئەژ، ج، لێ، منە، لەدی.
**من البدوء الی الختم:** لە سەرەتاوە تا بنی.
**من حیث المجموع:** لە ڕووی گشتییەوە.
**من أین؟:** لە کوێ.
**من بعد:** لەپاشان، لە دوایە، لەمەولا، لەمەوپاش، لێرەودوا، لەوە بەولاوە، لە گرەو دوا.
**من حیث:** لەبەر ئەوەی، چونکو، چونکە، بەهۆی ئەوەوە.
**من هذا:** لەوە، لەمە.

**من هنا:** لێرەوە، هێڤە.
**مناب:** جێگرتنەوەی کەسێکی، کاری کەسێکی کردن.
**المنابع الربیعیة:** بەهارەکانی، بێڵوو.
**مناجاة:** پاڕانەوە، لاڵانەوە، ئاوڕدانەوە، ڕازونیاز لە دەرگای خودای خوازتن. سرکە سرک، ورە، ورتەی نهێنی.
**مناخ:** کەش، وار، ئاووهەوا، جێگا، هەوا.
**المناخ الصحي:** هەوای سازگار، ئاووهەوای سازگار.
**- رداءة المناخ:** ناسازی ئاووهەوا، ناخۆشی هەوا.
**- ردیٔ المناخ:** ئاووهەوای ناسازگار.
**مناد:** بڕوانە (منادي)
**مناداة:** بانگ کردن، گازکردن، بانگ ڕاهێشتن، گازی کرن، های کرن.
**منادي:** بانگکار، گازکار، جارچی، دەلاڵ، هاوارکارێک، جاڕ ڕاهێڵ.
**منار:** لە (نور)دا بیدۆزەوە، شوێنی ڕووناکی.
منازع، منازعة: لە (نزاع)دا بیدۆزەوە.
**منازل:** شەڕکار، مەیداندار.
**منازلة:** شەڕکاری، مەیدانداری.
**مناسب:** لەبار، سازگار، شیاو، هێژا، ڕێک، گونجاو.
**- غیر مناسب:** ناسازگار، ناڕێک، ناپەلیار، هەرچکی.
**مناسبة:** لە (نسبة)دا بیدۆزەوە.
**مناص:** پەنا، پەسیو.
**مناصحة:** ئامۆژگاری یەکتری کردن، پەندی یەکتری دادان.
**مناصفة:** دوو نیوەکردن، دوو بەشکردنی ماڵ یا چشتێکی تر.
**مناضل:** تێکۆشەر، خەباتکار.
**مناط:** ئاوێژتنگە، تەرازوو، جێگای هەڵاوسین.
**المناطق الانتخابیة:** ناوچەی هەڵبژاردن.
**المناطق القطبیة:** هەرێمی پۆلییەکان.
**المناطق الکثیفة:** هەرێمە چڕەکان.
**مناظر:** پیلەباز، پیلەگەر، چاودێر، وتووێژکار، چاودەر، بینەر، چاودێر.
**مناظرة:** پیلەبازی، لە بابەت فەرمانێکییەوە وتووێژکردن، بەربەرەکانێ، ڕوونینە یەکتری.
**مناع:** نەهێڵ، کۆسپ، پەکخەر، بەرگر، بەرهەڵست.
**مناعة:** بەرگری، پایەداری، هێزی بەربەرەکانێتی، بەرهەڵستی، ڕێگری.
**مناعة مکتسبة:** بەرگری دەستکەوتوو.
**منافاة:** بەپێچەوانەی یەکتری جوولانەوە.
**منافس:** ڕقەبەری کار، بەربەرەکانی کار، هاوچاو.
**منافسة:** ڕکەبەری، ڕقەبەرێتی، هاڤرکێ، هاوچاوێ، هەڤڕاکەتن، ناکۆکی، دووبەندی.

**منافق:** ناڕاست، گێرەشێوێن، دووڕوو، دووزمان.

**منافقة:** دووڕوویی، گێرەشێوێنی.

**منافي (ج) منفي:** لە (نفي)دا بیدۆزەوە، دژ، نەیار، لەناوبەر.

**مناقش:** وشـتـومـرکـار، لێکۆڵەرەوە، وتووێژکـار، پێکەوە گفتوگۆکردن.

**مناقـشـة:** وشـتـومـر، چەقـە چەق، بەرەکـە بەرەک، پیلەبازی، لێکۆڵینەوە.

**مناقص:** بەسەر هەڵوێست، نرخ کەمکەرەوە، کەمگر.

**مناقصـة:** بەربەرەکانیـتی یەکتری کردن لە کەمکردنەوەی نرخی چشتاندا لەکاتی فرۆشتنیاندا، کەمگر بێ.

**مناقض:** هەڵوەشێن، ناتەبا، ناکۆک، بەپێچەوانە.

**مناقضة:** بڕوانە (نقض).

**مناقلة:** گفـتوگۆ لەگەڵ یەکتری کردن، چیرۆک و بەسـەرهات بۆ یەکتری گێڕانەوە.

**منال:** دەستکەوتگە، شوێنی سوود لێ وەرگرتنێ.

**منام:** نووستنگە، ژووری نووستن.

**المنامة:** پێخەف، نوێن.

**منان (م) منانة:** زۆر چاکەکار، زۆر بەخشندە. زۆر چاکەکار و بەخشندە.

**مناهي:** کار و کردارانی قەدەغەکراو.

**مناهج والکتب:** لە (نهج)دا بیدۆزەوە.

**مناوب:** هاونۆبە، نۆبەگر.

**مناوبة:** نۆبە لەگەڵ یەکتری کردن.

**مناورة:** مەشقی قوتابی و پێشمەرگەکان، ڕێنەبەر.

**مناوش:** دەمەقاڵەکار.

**المناوشة في القتال:** تێکبەربوون، پێکدادان.

**منبسط:** کراوەوە.

**منبع (ج) منابع:** سەرچاوگە، کانیاو، کێنی، کانی، سەرچاوە، کانگا.

**بعد:** لێرە بەدواوە، لەپاشان، لەوەدوا، لەوەپاش.

**منبه (ج) منبهات:** وریاکەرەوە، وشیارکەرەوە، وەهۆشهێنەر.

**منبهات:** وریاکەرەوەکان، وەهۆشهێنەرەکان.

**منتاف:** مووکێش.

**منتبه:** بێدار، هوشیار، ئاگادار، وریا.

**منتج:** بەرهەمدەر، بەرهەمهێنەر، بەرهەم هاوەر، بەرهەمهێن.

– **غیر منتج:** بێ بەرهەم، بێ دەستاو.

**منتجات:** بەرهەمەکان.

**منتجات الالبان:** سپیایی، بەروبۆی شیری.

**منتجات ورقية:** قاقەزی بەرهەم.

**منتخب:** بژاردە، هەڵبژێردراو.

**منتجع:** لەوەڕگە.

**منتحر:** خۆکوژ.

**منتخب:** هەڵبژێر.

**منتخب:** لە (انتـخابات)دا بیـدۆزەوە، هەڵبـژێردراو، تەرخـان، سەرپشک، نایاب.

**منتدب:** دەست بەسەرداگر، نێرەر.

**منتزع:** هەڵکەنراو، جوێکراوەوە.

**منتزه:** لە (تنزه)دا بیدۆزەوە.

**منتسب:** سەربە، لەمەڕ.

**منتشر:** لە (انتشار)دا بیدۆزەوە.

**منتصر:** سەرکەوتوو، زاڵ، دەستەڵاتدار، دەستکەوتوو، بەپیرۆزی گەیشتوو.

**منتصف:** نێوان، نێوەڕاست، ناوقەد.

**منتصف الليل:** نیوەشەو. نیڤەشەڤ.

**منتظر:** لە (انتظار)دا بیدۆزەوە.

**منتظر:** چاوە چاوگە، چاوەڕوانگە.

**غیر منتظر:** چاوەڕێ نەکراو، بەدوورزانین.

**منتظم:** لە (انتظام)دا بیدۆزەوە، ڕێک، ڕێکوپێک.

– **غیر منتظم:** ناڕێک، ناپوخت.

**منتعش:** بووژاوە، ژیاوە.

**منتـعم:** مـاڵدار، خـاوەند سـامـان، کـەسـێکە لە ناو و بەهرەدا پەروەردە و بەرخودا بێ.

**منتفخ:** ئاوساو، فوودراو، پەنماو، پەنمیک.

**منتفع:** کەسێکە لە کارێکی سوود و کەڵکی دەستکەوێ.

**منتفش:** فش، فش و فۆڵ، گڤت.

**منتفي:** دوورخراوەوە، لەناوبراو.

**منتقد:** لێگر، ڕەخنەگر، لێ دوو، وردەگیر.

**منتـقل:** گـوێزراوە، بۆراندک لە شـوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی تر ڕۆیشتوو.

**منتقم:** تۆڵەئەستێن، تۆڵەکار، تۆڵەکەرەوە.

**منتقم الدم:** خوێن نەستێن.

**منتكس:** سەرەوژێر، سەرنخون.

**منتهز:** هەڵپەرست، دەرفەت دەستکەوتوو.

**منتهك:** بێ ئابڕوو، پەردە دڕاو، لاوازکار، ڕەنج پێگەیاندن.

**منتهي:** بەپایان گەیشتوو، کۆتایی هاتوو، براوە.

**منتوج:** بەر، بەروبۆ، بەرهەم.

**منتوج:** زەڕی، زێڕباف.

**منتوف:** هەڵکەنراو.

**منثني:** قوپاو، نوشتاوە.

**منثور:** پەڕاگەندە.

**منجد (ج) مناجد**: گوريس كورت، بەرسووری گەوهەربەند.
**منجز**: ڕەوا، بەرهەم، دەستكەوت، پێكهاتنی كار.
**منجز ناتج**: بەرهەم.
**منجل (ج) مناجل**: داس، داسك.
**منجل صغير**: داسووكە، داسك.
**منجلي**: ڕەوشەن و ئاشكار.
**منجليق**: (د) مەنجەنيق، كەفك، كەفكانی، مراز و جۆرە چەكێكی شەڕێ بووە لە پێشوودا.
**منجم**: ئەستێرەناس، ئەستێرەژمێر، ئەختەرژمێر، هەسارەژمێر، ستێرناس.
**منجم (ج) مناجم**: كانگە، لاژوارد، ڕێگای ئاشكرا.
**مكان المناجم**: كانگا.
**منجم الميزان**: شەهێنی تەرازوو، شهێن.
**منجمد**: سەهۆڵبەندان، بەستوو، ڕچیاو، پلۆر، ڕچ، ڕچاو، بەستەڵەك.
**منجنيق**: بڕوانە (منجليق).
**منجود**: ڕەنج ديتوو، خەمناك.
**منجور**: تاشراو، داتاشراو.
**منجي**: ڕزگاركار، قوتاركار، دەربازكار.
**منح**: دان، پێدان، بەخشین، پێشكەشكردن، خەلات بەشینەوە، بەخشش.
**منح الاجازة**: دەستووردان، پاسدان.
**منحت (ج) مناحت**: تەشووێ، تەپشوو.
**المنحة**: بەخشش، دۆخە، خەلات.
**منحة العريس للعروس في ليلة الزفاف**: سەرمەشقانە، سەرمەشكانە.
**منحة لعمال النسيج**: سەردڕ، سەردڕانە.
**منحدب**: دەربەڕيو، قۆقز.
**منحدر**: سەرەوژێر، سەرەونخوون، كەسێكە لەسەرێوە بێتە خوارەوە.
**منحر**: بۆقەتەی ملی.
**منحرف**: لە (انحراف)دا بيدۆزەوە.
**– شبه منحرف**: نيمچە لاتەريب، چوارلاییء، دوو لاتەريبی.
**منحصر**: كورتكراوە، دەورە دراو.
**منحط**: لە (انحطاط)دا بيدۆزەوە.
**منحل**: لە (انحلال)دا بيدۆزەوە.
**منحني**: لە (انحناء)دا بيدۆزەوە.
**منحوس**: لە (نحس)دا بيدۆزەوە.
**منحوت**: تراشراو.
**منحول**: وتار يا هەڵبەستێكی يەكێكی تر بەهی خۆ نيشان دا.

**منخاس**: مامێزە. نەقیزە.
**منخزم**: هەڵدڕاو و بڕاو، كەپۆ بڕاو.
**منخر (ج) مناخر**: لووت، كەپۆ، دفن، تفنك، كونە كەپۆ.
**منخرين**: هەردووك كونە كەپۆ.
**منخفض**: پەست، چاڵ، لێژ، نزم، نشێو، نەوی، نفز، نزمان، چالایی.
**منخل (ج) مناخل**: لە (نخل)دا بيدۆزەوە.
**منخور**: كلۆر، قۆرقاڵ، كولۆر.
**منخول**: دابێژراو، والاوێن.
**مندرج**: ڕەگەڵ خراو، گونجێنراو.
**مندرس**: ڕزیو، كۆنە، كراسی كۆن.
**مندف**: كەوانە و كوتكی هەلاجییە.
**مندل**: دەستەسر، خاولی.
**مندل**: لالە، گوڵە مەنديلە، گوڵەباخ.
**مندمج**: ڕەگەڵ خراو، تێهەڵكێشراو.
**مندوب**: هەڵبژێراو، داواكردن.
**مندهش**: تاساو، حەپەساو، دووڕماو.
**مندور**: پەرۆشدار، بەدبەخت.
**منديل (ج) منادل**: دەسرە، دەستەرە، دەستەسر، دەسرۆكە، دەستمالۆك، دەستماڵ، هەوری.
**منذ، مذ**: لەكاتی، لەدەمی، لەوساوە، لەوێڕا، وەتی، لەوەتی، وەستێ، ڕا.
**منذ هناك**: لەوێڕا.
**منذ امس**: لە دوێنێوە، وەستێ دووهێ.
**منذ ذلك الوقت**: لەدەمییەوە، ژێلی، ژێركی.
**منذ زمن بعيد، منذ القدم**: لەمێژە، ژمێرڤە.
**منذ القديم**: لە زووەوە، لەمێژە.
**منذر**: ترسدەر، ترسێن.
**منزه**: دوور، بێ پەڵە، پاك.
**منزجر**: لە (انزجار)دا بيدۆزەوە.
**منزع**: دارنراو.
**منزعج**: لە (انزعاج)دا بيدۆزەوە.
**منزل**: هاتۆتە خوار.
**منزل (ج) منازل**: قۆناخ، چەقز، هەوار، بنەگە، بارەگا، بارگە، كۆچخانە، هەوارگە، ئارامگە، جێگای هاتنە خوار و دابەزین.
**منزل القوافل**: خان، كاروانسەر، قۆناخ.
**منزلة**: پايە، پلە، شان.
**رفيع المنزلة**: پايەدار، پايەبەرز.
**منزلق**: خزيو، هەڵخليسكاو، هەڵدێراو.
**منزه**: پاكوخاوێن.

**منساة:** دارده‌ست، چه‌مک، ڕۆتک، سقک، شقتانی، شیف.
**منسب:** دانراوی کاتی، دانراوی جاره‌کی.
**منسجم:** کۆک، پوخت، ڕێک، له‌بار، سازاو.
**غیر منسجم:** ناله‌بار، گه‌پ، نه‌گونجاو.
**منسحب:** کێشراو، خۆکێشه‌ره‌وه دواوه.
**منسحق:** هاڕراو، وردوخاشکراو.
**منسد:** به‌ستراو، داخراو، نوقاو.
**منسر (ج) مناسر:** دندوک، ده‌نوک.
**منسرح:** له (انسراح)دا بیدۆزه‌وه.
**منسق:** ڕێکخراو، ڕێکوپێک، خنج.
**منسك (ج) مناسك:** جێگای قوربانی، ڕێگای ئایین، شێوه‌ی په‌رستی، غاردان له نێوانی صه‌فا و مه‌روه‌دا.
**منسکب:** ڕژاو، ڕژیاو.
**منسلك:** ڕێگاگرتوو، هاتوو، که‌سێکه چووبێته ناو ڕێگا و بیروباوه‌ڕێکییه‌وه.
**المنسم:** پێ یا نینۆکی وشتر و فیلیه. نیشانه، ڕێگا، ڕه‌وشت. ده‌نکی بۆنخۆش.
**منسوب:** وابه‌ست، هاوگه‌ڕ، ده‌ست و پێ.
**منسوب الی:** له‌مه‌ڕی، وابه‌سته‌ی.
**منسوج (ج) منسوجات:** چنراو.
**منسوخ:** پووچکراوه، له‌ناوبراو.
**منسی:** له‌بیرکراو، فه‌رامۆشکراو.
**منشأ:** سه‌رچاوه، ڕه‌چه‌ڵه‌ک، بناوان.
**منشآت:** دامه‌زراوان، ساختمان.
**منشئة:** ده‌زگا، دامووده‌زگا.
**منشار (ج) مناشیر:** (ه) مشار، هه‌ره، هیزار، گوره، بڕه‌ک، بڕهۆک، ئه‌ڕا. جۆره ماسییه‌که لموزی درێژه وه‌مشاری ده‌چێ.
**منشار رفیع:** گرده‌بڕ.
**منشار الکبیر المستعملة لشخصین:** شه‌ق، شه‌مشار، گوشاد.
**منشرح:** دڵکراوه، هشقه‌کری، ئاوه‌ڵه.
**منشرح الصدر:** بێن درێژ، پشوو درێژ، هشقه‌کری.
**منشرح القلب:** دڵکراوه، هشقه‌کری.
**منشعب:** ده‌سته ده‌سته.
**منشفة (ج) مناشف:** له (نشف)دا بیدۆزه‌وه.
**منشق:** قه‌ڵه‌شاو، شه‌قار شه‌قار، تڵیشاو.
**منشل:** که‌وگیر.
**منشور:** هه‌ڵخراو. په‌رتوبڵاو، په‌رتکراو.
**منشیء:** دامه‌زرێنه‌ر، دانه‌ر، نووسه‌ر، ده‌وبر، میرزا.
**منصب:** ڕژاو، ڕژیاو.
**منصب (ج) مناصب:** پایه، پله، جێگا.
**منصب (م) منصبة:** سێ کوچکه‌ی ئاوری که به‌رد بێ، سێپایه‌ی ئاوری سێپا.
**منصة:** کورسیێکه بووکی له‌سه‌ر دانیشێ.
**منصة الخطابة:** دوانگه.
**منصرف:** په‌شیمان بووه‌وه، گه‌ڕاوه‌وه.
**منصرم:** کۆتایی هاتوو.
**منصف:** دادپه‌روه‌ر، دادگه‌ر، ڕاستیپه‌روه‌ر، له‌ڕووی داد و مرۆڤایه‌تییه‌وه ڕه‌فتارکار.
**منصف:** له‌تکار، پارچه‌گه‌ر.
**منصهر:** شل، تاواوه‌وه، شل بووه‌وه.
**منصوب:** دانراو، دامه‌زراو، به‌ردار.
**منصوح:** ئامۆژگاری کراو، په‌ندا دراو.
**منصور:** ڕزگار بوو، یاریده‌دراو، سه‌رکه‌وتوو، پیرۆزی ده‌ستکه‌وتوو.
**منصوص:** له (نص)دا بیدۆزه‌وه.
**منضاج:** شیشه‌ی که‌بابی.
**منضج:** بڕوانه (ناضج).
**منضج:** پێ گه‌یێن.
**منضجر:** سه‌خڵه‌ت، خه‌فه‌تبار، دڵشکاو، ملول.
**منضجة:** ئاوپاش، ئاوپڕێن.
**منضدة:** مێز، هه‌رزاڵ، هه‌رزه‌ڵ، ئه‌رزیل، ستێرک.
**منضدة الطعام:** مێزی نانخواردنێ.
**منضم:** هاوڕێ، خراوه سه‌ریه‌ک.
**منطاد:** چشتێکی خڕی پڕ له هه‌وایه بۆ حوا به‌رز ده‌بێته‌وه.
**منطبع:** چه‌سپان، چاپ بوون، به‌رواژی بوون.
**منطبق:** له‌سه‌ر یه‌کتری دانراو، به‌رانبه‌ری یه‌کتری.
**منطفیء:** کوژاوه‌وه، خامۆش، کوژیاو، کوژیاک.
**منطق:** لمژێر (نطاق)دا بیدۆزه‌وه.
**منطقة (ج) مناطق:** هه‌رێم، قه‌ره، قۆڵ، هه‌رەم، هێڵ، ناوچه.
**منطقة الاستواء:** هه‌رێمی یه‌کسانێتی.
**المنطقة الباردة:** سارده‌سیر، کوێستان.
**منطقة البروج:** هه‌رێمی کۆنگران.
**المنطقة الحارة:** هه‌رێمی نێوانی دوومداری سه‌ری سرطان و سه‌ری جه‌دی که گه‌رمایی ڕۆژ لێره زۆر ده‌بێ.
**المنطقة الکردیة:** هه‌رێمی کوردی.
**المنطقة المنجمدة الشمالیة:** هه‌رێمی به‌سته‌ڵه‌کی باکور.
**منطقی:** به‌جێ، (لۆژێکی).
**منطمس:** ڕووچوو، له‌ناوچوو.
**منطلق:** ده‌ربه‌ڕیو، ڕزگار، ڕایی، ڕسگار، سه‌ربه‌ست.
**منطوق:** کوتراو، بێژراو.

**منطوق النظرية**: وتەی بیردۆزە.
**منطوي**: پێچراوە، نوشتاوەوە، لۆچ لۆچ.
**منظار**: دووربین.
**منظر (م) منظرة (ج) مناظر**: بەرچاو، دیمەن، پێشچاو، دیتنگا.
**ضعيف المنظر**: نابووت، پووچەڵە.
**منظف**: پاک، خاوێنکراو، پاککراو.
**منظف**: خاوێنکەرەوە، پاککار، پاکەوان.
**منظم**: پوخت، رێکوپێک، بەسەروبەر.
**منظم**: رێکوپێک کار، سازگەر.
**منظمة**: لە (نظام)دا بیدۆزەوە.
**منظمة الدفاع المدني الدولي**: رێکخراوی بەرگری نەتەوەیی نێوانی دەوڵەتان.
**منظور**: دیتراو، رەچاوکراو، لەچاوگیراو.
**منظوم، م. منظومة**: هەڵبەستراو، پێوەکراو، هەڵبەست.
**منظومة حماسية**: هەڵبەستی دەماربزێو، هەڵبەستی هەست بزێو، چریکە.
**منع**: پێشگیری، نەهێشتن، پەکخستن، پێشگیرەوەیی کردن، بەرگری کردن، نەهێشتن، ژ بەرڤەکرن، بەربەست کردن، بەرگرتن، بەرگری، پێشگرتن، تخ لێدان، وەبەرگرتن، یاساخی، یاساخ کردن، رێ نەدان، رێگرتن، بەرهەڵست کردن.
**منعش**: بووژێنەوە، گەشێنەوە.
**منعطف**: خوار بووەوە، وەرگەڕاوەوە.
**منعطفات**: پێچوپەنا.
**منعقد**: بەستراو، گرێدراو، رێککەوتوو.
**منعكس**: وەرگەڕاو، وەرنەگیراو.
**منعم**: بەخشندە.
**منغص**: شلوێ، لێڵ، ناخۆش.
**منغمس**: نقوم بوو لە ئاودا، نقوم لە ئاو هەڵکێشراو.
**منفاخ**: دەمەی کورەی ئاسنگەران و نیتر.
**منفجر**: تەقیوو، پەقیو، تەقاوە، سەرچاوە و کانی تەقیو.
**منفذ (ج) منافذ**: لە (نفوذ)دا بیدۆزەوە.
**منفرج**: لە (انفراج)دا بیدۆزەوە.
**منفرد**: لە (انفراد)دا بیدۆزەوە.
**منفسخ**: رزاو، رزیو، رزاوەوە.
**منفصل**: لە (انفصال)دا بیدۆزەوە.
**منفعة (ج) منافع**: قازانج، سوود.
**منفعل**: لە (انفعال)دا بیدۆزەوە.
**منفوخ**: دەمەکراو، پفدراو، فوو پێداکراو.
**منفور**: بێزو بۆ لێکراو، دوورخراوەوە، لە بەرچاو، کەوتوو، لە بەردڵان گران.
**منفوش**: بژ.
**منفى**: ئاوارەگا، دەربەدەرگە، دوورخراوگە.
**منفي**: دوورخـــــراو، نابووتکراو، ئاوارە، دەربـەدەر، نەوداڵ، هەڵەتە، وێڵ، هەڵوەدا، سەرگوم.
**منقاد**: بەگوێ، فەرمانبەر، باربەر، گوێ لە مست.
**منقار**: دندوک، دەنووک، دەمک، نکل.
**منقاش (ە)**: قاش، ماشە، مرازێکە مووی لە لەش هەڵدەکەنێ. مرازی نەخشاندنێ.
**منقبة (ج) مناقب**: کردەوەی چاک، هونەر، رێگا لە چیاياندا، رێگای باریک لە نێوانی دوو خانوواندا.
**منقبض**: دڵتەنگ، دڵهەلاتوو، گرفتدار.
**منقبض القلب**: دڵگیر، دڵگران، دڵرەنج.
**منقح**: پاککراو، خاوێنکراو، بژارکراو.
**منقذ**: رزگارکار، بەفریاهاتوو، دەسگر، دەستگیر.
**منقرض**: دوابراو، قڕان تێکەوتوو، بنەبڕ.
**منقسم**: بەش بەش کراو، دابەشراو.
**منقش**: لە (نقش)دا بیدۆزەوە.
**منقص (ج) مناقص**: کەموکوڕی.
**منقضي**: دوایی هاتوو.
**منقط، منقوط**: نوختەدار، نوختە نوختە، پنک پنک.
**منقطع**: براوەوە، بڕاو، پساو، دابڕاو.
**منقطع الاصل**: بنەبڕ، ریشەبڕ، بنبڕ.
**منقع**: خوساو، گۆل، ئەستێر، قوڕاو، چلپاو، زلقاو.
**منقل**: لا بەلا، رێگای نێو چیایان، رێگای کورت.
**منقلب**: وەرگەڕاو، سەرەوژێر، شێواو.
**منقلة**: مەقەڵی، مەنگەڵ، سووچپێو. گۆشەپێو (لە ئەندازیاری و ئەژمارێدا).
**منقلع**: هەڵکەنراو، لەڕیشە دەرهێنراو.
**منقور**: هەڵکەنراو، هەڵکۆڵراو.
**منقوش**: لە (نقش)دا بیدۆزەوە.
**منقول**: گوێزراوەوە، ڕاگوێزراو.
**منقول عمدا**: دەستگۆز، دەستگوێز.
**منقى**: بژاردە، بژارکراو، خاوێن کراو.
**منقي**: خاوێنکەرەوە، هەڵبژێر.
**منكب (ج) مناكب**: قەلادۆشان، ریشەی باسک و شان.
**– المدافعة بالمناكب**: تێکسرماندن.
**منكر**: بێ بروا، بێ باوەڕ، لامل، بێ لێ نەنەر.
**منكر**: ناپەسند، ناشایان، باوەڕ پێنەکراو.
**منكرش**: ورگدار.
**منهوم**: وێران و کاول.
**منهزم**: شکست خواردوو، هەلاتوو، لەشکری شکاو.

**منهضم**: خۆراکی هەپروون (هضم) کراو.
**منهل (ج) مناهل**: جێگای ئاو خواردن، سەرچاوەیی کە ئاوی لێ بخۆنەوە.
**منهمك**: سەرقاڵ، سەرگەرم و تێکۆشەر لە کارێکیدا.
**منهوب**: تالآنکراو.
**منهي**: وەلآمدەر، ئاگادارکار.
**منهي**: قەدەغەکراو.
**منهيات**: کاروباری خراپ کە نایێن قەدەغەی کردبێ.
**منهج (ج) مناهج**: ڕێگای ڕاست، ڕێگای ئاشکرا و دیار.
**منكس**: سەرەوژێر، سەرنخون.
**منكس الرأس**: لە (نكس)دا بیدۆزەوە.
**منكسر**: شکاو.
**منكوء**: کولاوەوە.
**منكوب**: بەدبەخت، ڕەنج دیتـــوو، ئازار چێـــژتوو، ڕۆژڕەش، چارەڕەش، تووشی نەگبەتی و کارەساتان هاتوو.
**منكشف**: ڕووت، ئاشکرا، دیار.
**منكوس**: لە (نكس)دا بیدۆزەوە.
**منكوحة**: ژنی مارەکراو.
**منهج، منهاج**: ڕێ، ڕێگا.
**منهار**: کاول، ڕووخاو.
**منهج**: لە (نهج)دا بیدۆزەوە.
**منهزم**: لە (انهزام)دا بیدۆزەوە.
**منهل**: سەرچاوەی ئاوی شیرین.
**منهمك**: شەل و پەت، سەرگەرم و تێکۆشەر لە کاروباردا.
**منوال**: دەســتگای چنینی جـۆلآییـیـە، بەرانبـەر، ڕووکـار، بار، شێوە، کردار، دەسگای خودایی.
**منوب، منوب عنه**: کەسێکە لە کارێکیدا جێنشینی وی بێ.
**- على هذا المنوال**: بەو چەشنە، بەو شێوەیە.
**منور**: ڕووناک، ڕەوشەن. خوێندەوار، شارەزا، ڕەوشەنبیر.
**منوط**: بەستراوەوە، وابەستە.
**من لدن**: کەمن، لەلای، لە لایەن.
**منول**: کەرەستەی جۆلآییە.
**منوم**: نوێن، خەفێن.
**المنوم المغناطيس**: نوێنی موغناطیسی.
**منون**: مەرگ، گل، ئاکام. ڕووشەی ڕۆژگار.
**منوى (ج) منويات ومنادى ومنايا**: ویست، دڵخواز، ئارەزوو.
**منها**: لەو، لەو داشکاوە.
**منهاج (ج) مناهج**: ڕێگای ڕاست، ڕێگای ڕووناک و ئاشکرا.
**مني**: هیــوا، هێــوی، هەوەس، گــاڤێن، مــەراز، مــراز، هەویا، ئارەزوو، خـواست، نیـاز، دڵخـواز، ئاوات، داخـاز، سـەرک، کام، کرن، هێڤی.
**- نيل المنى**: بەئاوات گەیشتن.
**مني (ه)**: مەنی، ئاوی مرۆڤان، تو، تۆو، تۆخم، ئاوی تۆم، تۆم.
**- نزول المني**: ئاو هاتنەوە، وەرسان، وەرسین.
**منهتك**: دڕاو، پەردەی دڕاو، بێ ئابڕوو.
**منهب**: پەشیمان، ژیوان، پاشگەز، گەڕاوەوە، پژمان.
**منية (ج) منايا**: مەرگ، مردن، ئاکام، چارەنووس.
**المنيحة**: ڕەشەوڵاخ، گامێش یا وشتر یا ئاژەڵێکە خوری و شیر و بێچووەکەی دەبەخشن.
**منير**: درەوشەر، ڕەوشەنکەرەوە.
**منيع**: ڕاز، لات، تێوەڕ. جێگای سەخت و قایم و بڵند.
**منيف**: بڵند، بەرز.
**مهات**: مانگاکێوی.
**منهوب**: تالآنکراو.
**- اموال منهوب**: تالآنی.
**مهاج**: لانەواز، دەربەدەر.
**منهي**: تخ لێکراو، قەدەغەکراو.
**مهاجرة**: دوورکەوتنەوە، جوێ بوونەوە، دەربەدەری.
**مهابة**: ترس، ڕق، گەورەیی و شانوشکۆ.
**مهاجم**: پەلاماردەر، شالآوبەر.
**مهاجاة**: خراپە و کەموکوڕی یەکتری بەڕووی یەکتری دادانەوە.
**مهاجمة**: بڕوانە هجوم.
**مهاد**: سەنیر، بەڕە، زەوی نەرم، لانک.
**مهادنة**: دەست هەڵگرتن، ڕوو لە ئارامی کردن.
**مهار**: پووزەوانە، دارێکی گچکەیە کە لە پەڕەی کەپوی وشتری دادەنێن وە بەبەنیش دەیبەستن، هەوسار.
**مهارة**: سەلیقە، کارزانی، زیرەکی، وریایی، زرنگی، شارەزایی، شـابازی، شەهبـازی، کارسـازی، مەحلانی، شیـاوی، شـاک، لێهاتوویی، هووردەیی، کارامەیی
**مهارة فنية**: سەلیقەی هونەرمەندانە.
**مهام**: گرنگ، کاروباری سەخت، جلەو.
**مهامة**: سرتە سرت، چپە چپ لەگەڵ یەکتری کردن.
**مهان**: کەنەفت، بێچارە، پێکراو، ڕیسوا کراو، ئابڕووبراو.
**مهانة**: پێکران، ڕیسوایی، سستی، بەدناوی.
**مهب (ج) مهاب**: بەربا.
**مهب الريح**: بەربا، با گر، با ئەنگێو، باگە، باگا، باگیر، بەروا.
**مهبط (ج) مهابط**: شوێنی هاتنە خوار، نشێوی، نزمی.
**مهبل**: زێ، مـاڵ، ئەندامی شـەرمی مێـیینـانە. پسـدان، پزدان، میزدان.
**التهاب المهبل**: زێ ئاوسان.
**مهتز**: لەرۆک، لەرینەوە.

**مهتلك:** زگ لەوەڕێن، نەوسن، چڵێس، زگن، زگبرسی.

**مهتم:** لە (اهتمام)دا بیدۆزەوە.

**مهتوك:** ئابڕوو براو، بێ ئابڕوو، ڕیسوا، سووک، ترۆ، بەدناو، سیاسەتکراو.

**مهجر:** ڕەوگە، نیشتمانی نوێ، شوێنێکە لە نیشتمانی یەکەمەوە بچییە وێ و بیکەیە نیشتمانی دووەم.

**مهجع:** گێلی، ئەو کەسەیە کە زوو لە لای هەموو کەسێکی ڕابی.

**مهجور:** بەجێ هێشتراو، دەربەدەرکراو، ئاوارە، ئاوارەکراو.

**مهد (ج) مهود، مهاد:** لانک، بێشکە، دەرگووش، فاڵ، گافارە، لاندک.

**– أثاث المهد:** مەدبەند.

**محرك المهد:** لۆری، ڕلژێن.

**مهدء، مهدئة:** ڕاوکە، ڕادە.

**مهدد:** ترسێن، هەڕەشەکار.

**مهدم:** وێرانکار، کاولکار.

**مهدوم:** وێران، کاول، خاپوور، کامباخ.

**مهدوم العش:** هێلانەوازە، هێلانەشێوان، هێلانەوێران.

**مهذار:** زۆربلێ، زۆربێژ، چەنەباز، هەرزەبێژ، چەنەدرێژ.

**مهذب:** پاکخوو، خۆشکردار، ئابڕوومەند، هێمن.

**مهر (ە):** مارەیی، هەشتیەکی، هەشتەک. مۆر، موهیر.

**مهر المؤجل:** مارەیی.

**مهر مهراً:** مارەکردن.

**مهر (ج) امهار:** چووانوو، جانی، کوڕە، نۆما، کوڕگ، کوڕ کوڕە.

**مهر ذو سنة واحدة:** یەکبڕ.

**مهر ذو سنتين:** کۆڵەبژە، دووبڕ.

**مهراً (مهرء):** دارزاو، کولاو، هەلا هەلا بوو (گۆشت)، ڕزیو، زۆر کولاو.

**مهراس:** هاوونگ، ئاوان، دۆڵ، هاوان، هاوەن، دنگ، دینگ.

**مهراسي:** دەسکی، دنگی.

**مهرب (ج) مهارب:** قاچاخچی، قاچاخ.

**مهرة (ج) مهرات:** مۆرێکە بەهۆیەوە پیاو و ژنان گرفتاری ئەڤینی یەکتری دەکەن.

**مهرج (ج) مهراج:** زۆربلێ، چەنەباز، قەرەچەناخ، چەند هەراش، چاوەش، چەو چەو، دەمدڕاو، زاردڕاو، دەڤدڕیاو.

**مهرج:** چاوەش، هەڕاجکار.

**مهرجان (ە) میهرجان:** میهرگیان، ناوی جێژنەیێکی زۆر کۆنی کوردانە کە دەکەوێتە یەکەمین ڕۆژی پاییزێ زوحاک کە لە ڕۆژی یەکەمینی بەهاریدا گیرا ناویان نا نوڕۆژ (نەورۆز) کە لە یەکەمین ڕۆژی پاییزێدا کوژرا کرا جەژنی شادمانی و ناوی نرا میهری گیان واتا دڵ و گیان حەسایەوە و ئاسوودە بوون.

**مهري:** کوڵێن، دارزین، هەلا هەلاکار.

**مهزم:** بەزێن، بەزێنەر.

**مهزول (ج) مهازيل:** لاواز، بێ تین، ڕەقەڵە، لەڕ، سیس، چرچ.

**مهزوم:** هەلاتوو، بەزیو، شکاو، تەقەتێکەوتوو.

**مهشم:** ئەنجنراو، جنانراو.

**مهضوم:** هەپروون هەپروون کراو.

**مهضوم الحق:** دەمچەوت، دەمچەفت.

**مهفة:** باوەشێن، باژەن، باوەشینک، باڕووشە، باڕۆشە.

**مهك:** سوونەوە، بەتوندی سوونەوە.

**مهل:** باب و باپیر، باووباپیر.

**مهل:** خاو، سس، لەسەرەخۆ و نەرم، کارکردن.

**مهل مهلاً في العمل:** بەکاوەخۆ کارکردن و پەلە نەکردن.

**على مهل:** لەسەرەخۆ، بەکاوەخۆ، هێوران.

**مهل:** زووخاو و ڕشانەوەی مردووان، زەرداوی ڕشانەوەی مردووانە.

**مهل:** کانانی وەکو ئاسن، مس، زێڕ، زیو، قەتران و ڕۆنی زەیتوونی و هیتر.

**المهلي:** فرنی.

**مهلة:** وچان، مۆڵەت، پشوو، کاوەخۆ. زیلەمۆ، ژیلەمۆ، زیل، زیلک، ژیلی، تەڕاف، خۆڵەمر، خووەلی، مەرمۆتک.

**مهلك:** لەناوبەر، تەفرووتووناکار.

**مهلكة (ج) مهالك:** شوێنی لەناوبردنێ.

**مهلل:** چەماوەوە، کووڕ وەکو مانگی یەکشەوە.

**مهلهل:** تووکی تەنک، کراسی تەنک چنراو.

**مهم (ج) مهام:** گرنگ، پێشەم، گرگرە، بەرکەتی، پۆتە، باکدار.

**مهما:** هەرچی، هەر چاخێکی، هەر جارێکی، هەر کاتێکی، هەر نا، هەر تاکە، هەر تاوەکو، هەرچەندە، هەرگا.

**مهما أمكن:** بەپێی توانایی، تا ئەو ئەندازەیەی، کە بگونجێ، هەر چەندێکی ڕێککەوێ.

**مهماز (ج) مهاميز:** مامزەی پشت پانیەی مارەگەنز، (چەکمە) و پۆتین و ئیترە، موو مووز، مامێز. نەقیزە.

**مهمة (ج) مهمات:** فەرمان، کار، کردار، پژگال، ئەرک.

**مهمز:** بڕوانە مهماز.

**مهمل:** لە (اهمال)دا بیدۆزەوە.

**مهموز:** هەمزەدار، وشەیێکە کە بەیەکێک لە پیتە بنچینەکانی هەمزە بێ.

**مهموم:** خەمبار، دڵتەنگ، خەفەتبار، بێ دەماخ.

**مهنا:** نۆشی گیان.

**مهن مهنة:** پەرای و ڕاژەکردن، ئوودا (خزمەت) کردن. کارکردن لە پێشەیێکدا.

**مهنة:** شیری هیندی.
**مهنة (ج) مهن:** پەرای، ڕاژ، نوودا. پیشە، کر.
**مهنة البناء:** بەننایی، بیناتسازی.
**مهنة التلمیذ:** شاگردێتی، قوتابێتی.
**مهنة الراعي:** شوانی، شڤانی.
**مهنة الرمال:** فاڵچیەتی، فاڵچێتی.
**مهنة الشاعر:** بوێرێتی، هەستیارێتی.
**مهنة العامل:** شاگردێتی.
**مهنة العطارة:** خوردەفرۆشی، وردەواڵەفرۆشی.
**مهندس:** ئەندازیار.
**مهنئ:** پیرۆزبایی کار.
**المهو:** تەرزە، تەگر.
**المهوع:** ڕشێنەوە، ئەوەیە کە هۆی ڕشانەوەیە.
**مهئ:** گاکێوی.
**مهئ، مهیأ:** لە (تهینە)دا بیدۆزەوە.
**مهیأ للاطلاق:** لەسەر تێزە.
**مهیب:** سامناک، کەسێ یا چشتێکی کە لێی بترسێن.
**مهیج:** هاندەر، فیتدەر، دەست لە پشتدەر، تووژێنەرەوە.
**مهیل:** شوێنی سامدار، جێگای ترسان.
**مهین:** نزم و سست.
**مواء:** (ە) میاواندن، میاو، میاو.
**موات:** مردوو، زەوی بەیار و وێران و بێ خاوەند.
**مؤاثم:** ئەو کەسەیە لە ڕۆیشتنیدا ڕاوەستێ و یا درەنگ بەسەر خۆی بێنێ.
**مواثقة:** لەگەڵ یەکتری بەڵێن و پەیمان بەستن.
**مواج:** زۆر شەپۆڵ لێدەر.
**مواجة:** ڕووبەڕووکار.
**مؤاخاة:** دۆستایەتی، برادەرایەتی.
**مؤاخذ:** لێ گر، سەرزەنشکار.
**مؤاخذة:** سەرزەنشت، لێ گرتن.
- **لا تؤاخذني:** لێم مەگرە.
**مواد:** کەرەستە.
**مواد اولیة:** کەرەستەی خاو.
**مواد عضویة:** زیندە ماددە، ماددەی ئۆرگان.
**مواد العطاریة:** وردە، وردەواڵە، خوردە، خوردەوات.
**مواد مستهلکة:** شرە.
**مواد موادعة:** واز لە دوژمنایەتی هێنان، لەگەڵ یەکتری ئاشت بوونەوە.
**مواز:** تەریب (ماتماتیک).
**موازي:** هاوکێش، بەرانبەر، هاوڕێک، باتەڤە، ڕاست هەڤ.
- **خط الموازي:** هێڵی هاوڕێک.
**مؤازاة:** ڕووبەڕوو و بەرانبەری یەکتری بوون.
**مؤازر:** یاریکار، یارمەتیدەر، یاریدەدەر، هاوپشت، هاریکار.
**مؤازرة:** یاریکاری، هاوپشتی، یارمەتیدان.
**موازن:** تەراز، هاوتەرازوو.
**موازنة:** هاوسەنگی، هاوسەنگێتی، لەنگەر، بەراورد، لێکدانەوە، هەڵسەنگاندن، سەنگاندن، سەنگانن.
**الموازنة القلقة:** هاوسەنگێتی نەسرەوت.
**الموازنة المستقرة:** هاوسەنگێتی جێگر.
**الموازنة المستمرة:** هاوسەنگێتی هەمیشەیی.
**موازي:** بروانە مواز.
**موازي في الهندسة:** هاوڕێک.
**خط الموازي:** هێڵی هاوڕێک.
**مواساة:** دڵدانەوە، دڵنەوایی، یارمەتی کردن، هاوکاری یەکتری کردن.
**مواساة المیت:** تازیانە، پرسە.
**مواش:** ئاژەڵ، وشتر، ڕەشەولاخ، چوار پێ.
**مواصل:** سەرلێدەر، هاتوچۆکار.
**مواصلات:** ڕێگاوبان.
**مواصلة:** پێکگەیشتن، وێکهاتن، هاموشۆ، هاتوچۆ، پێداهاتن، گەیشتنە یەکتری.
**مواضعة:** پێکەوە لە کار و یا لە فەرمانێکی هاوبیر و باوەڕ بوون و ڕێک کەوتن.
**مواطاة:** لە کارێکیدا لەگەڵ کەسێکی ڕێک کەوتن.
**مواطن:** لە (وطن)دا بیدۆزەوە.
**مواظب:** هەمیشە ئاگا لە کار و چڕ و پایەدار، برێڤ، کار قایم، گوێدێر، گوهدێر.
**مواظبة:** کار قایمی، چاوەدێری، هەمیشە ئاگاداری کاروبار کردن.
**مواعد:** پەیماندەر.
**مواعدة:** پەیمان و بەڵێنی پێکدان.
**موافق:** هاوکار، هاوڕێ، یەکدەست، سازگار، ڕێککەوتوو، هاودەنگ، هاوڕا، ساز، لەبار، بەدڵ ڕا لێ.
- **غیر موافق:** ناساز، بێ کێش، ناقولا.
**الموافقة علی:** ڕا لێبوون.
**موافقة:** سازگاری، ڕێککەوتن، هاوڕایی، هاودەنگی، ڕا لێبوون، قۆڵ بۆ کێشان، ڕەزامەندی.
**مؤاکلة:** هەم خۆراکی، پێکەوە خۆراک خواردن.
**موالات:** دۆستایەتی لەگەڵ یەکتری، بەندیواری یەکتری، وەدووی یەکتری کەوتن.
**مؤالف:** کەوی، ڕام، هوگر.
**غیر مؤالف:** سل، سەرکێش.

**مؤالفة**: لەگەڵ کەسێکی هۆگر بوون، دۆستایەتی و هاودەمی.
**موالي**: ئاوارە، دەربەدەر. ئەو کەسەیە کە لە بنچینەدا ئارەو نییە و بۆتە ئارەو و یا بۆتە موسڵمان.
**موالیا**: جۆرە هەڵبەست وە یا تەرانەیێکە نۆکەر و ژێردەستان بۆ ئاغا و خاوەند و گەورەکانی خۆیان دەخوێنند، لە دوایی هەر هەڵبەست و یا بەندێکیدا دەیانگوت: (یا موالیا) و (اشارە)یان بۆ ئاغایەکانیان دەکرد.
**موالید**: زێد، زاینگە، جێگای لە دایکبوون، شوێن و کاتانی لە دایکبوون.
**موالید ثلاث**: سێ گەوهەر، زاگان.
**مؤامر**: پیلانگێر، کەڵەکباز.
**مؤامرة**: کەینوبەین، دەهۆ، پیلان، کەڵەک، رەواسە، قومە قوم.
**مؤانسة**: لەگەڵ کەسێکی هۆگربوون و پێکەوە هەڵکردن.
**مؤبد**: هەمیشەیی.
**موبق**: شوێنی لەناوچوون، پەیانگا، زیندان.
**موت**: مردن، مرن، گیاندان، مەرگ، بەلاداهاتن نەبوون، لەناوچوون، لەگەڵ کەوتن.
**موت الابیض**: مەرگی ئاسایی.
**موت الاحمر**: مردنێکە بکوژرێ.
**موت الاسود**: مردنە بەخنکان.
**موت الفجائي**: مەرگی کتوپر، پەرکەم.
**- علی وشك الموت**: بێ حاڵ.
**موتة**: (ە) مۆتە، دیوەزمە، تەنتەل، مۆتەکە، کابووس، مێردەزمە، مێردەزمۆکە، کاموسک، دیوەزمۆکە. گۆ یا ئەوەیە کە لە خەوێدا سواری سینگی مرۆڤی دەبێ.
**مؤتمر**: ئەنجوومەن، کۆمەڵ، کۆمەگ، چڤانگە، کۆڕ، جڤین، جڤان، کۆمەک، کۆنگرە، ئاپۆرە، پونگال، راوێژگە، راوێژگا.
**مؤتمر الادب**: ئەنجوومەنی وێژە.
**مؤتمر اللغة**: ئەنجوومەنی زمان.
**مؤتمر الوطني**: کۆنگرەی نیشتمان.
**مؤتمن**: جێگای دڵنیایی، مرۆی دەستپاک و هێمن.
**مؤثر**: کاری، کاریگەر، کارتێکەر، کارگەر، تەزوودار، بەسۆ، جەرگبڕ.
**مؤثرات الحسیة**: کارتێکەرە هەستییەکان.
**مؤثم**: کەسێکە یەکێکی تر هان بداتە سەرگۆنا دەکردنێ.
**موثوق**: بروانە معتبر لە (اعتبار)دا.
**موج (ج) امواج**: شەپۆل، پێل، پێلچوک، وشترە، وشتراژ، سیپەل، لیپاو.
**موج طویل**: کیخ، شەپۆلی درێژ.
**الموجات الطویلة**: شەپۆلانی درێژکۆلە.
**الموجات مستعرضة**: شەپۆلانی پانکۆلە.

**- هدیر الامواج**: هوونە، هوون.
**- موجب**: هۆ، مایە، بۆنە. گەرم (پۆزیتیف) خۆگر، وەخۆگر.
**- بموجب**: بەپێی.
**موجب**: وتارێکە کە بەرهەڵست (نفي و نهي) و پرسیاری تێدا نەبێ. وەخۆگر (پۆزیتیف).
**موجبة**: کاری گەورە، سا چاک بێ یا خراپ.
**موجة**: شەپۆل.
**الموجة العصبیة**: دەمارە شەپۆل، شەپۆلی دەماران.
**موجد**: داهێنەر، ئافەرێننده.
**مؤجر**: بەکرێدەر.
**موجز**: لە (ایجاز)دا بیدۆزەوە.
**موجز**: کورتە، کورتەیەک، کورتکراوە.
**موجهة**: بەروو، بایەخدار، بایەخ پێدراو، وتار یا وشە و تەوازۆی پەسندکراو.
**موجوء**: خەساو، خەسێنراو.
**موجود**: ئامادە، ساز، پەیدا، هەس.
**- غیر موجود**: نییە، نەماو.
**موجودیة**: هەسێن، هەبوون، هەستی.
**موحد**: خوداپەرست، خوا بەتاکناس کەسێکە باوەڕی بەتاک و تەنیایی خودای هەبێ.
**موحش**: خەمهێنەر، ترسێن، خەفەتهێنەر.
**موحل، موحول**: قوڕاوی، باتلاخ.
**مؤخر**: لای دوایی و پشتەوە بەپێچەوانەی لای پێشەوە، دوا، پاش، پشت، دوایین، دواکەوتوو، پاشکەوتوو.
**مؤخر**: هێڵەوە، پەکخەر.
**مؤخرة**: دوا لەشکر، دوایی لەشکر، پاشەوە، پاشپارێز، کنگ.
**مؤخرة الجیش**: دوا لەشکر، پاش پارێز، دوا جەنگ.
**محافظ المؤخرة**: دوا پارێز.
**مؤدب**: گران، هێمن، بەشێواز، سەلار، پەلیار، سەنگێن.
**غیر مؤدب**: بێ شێواز، بێ تورە، ناتورە، گران، ئارام، لەسەرەخۆ.
**مؤدب**: فەرهەنگکار، شێوازکار، لەلە.
**مودة**: سەودا، خۆشەویستی، دڵنەوایی، دڵنەوازی، مهرەبانی نیشاندان.
**مودع**: پێ ئەسپێر، بەرێکار.
**مودع**: پێ ئەسپێرراو.
**مؤدي**: بدەر، گەیێن.
**مؤذ**: شەرفرۆش، ئازاردەر، زیاندەر، گەلاج، پیاوخراو، هەزار فەند، زیانکار، زیانۆ، زیانە خەرۆ.
**مؤذن**: بانگدەر، بانگ راپێل، بانگ راهێڵ.
**مؤذي**: ئازار و رەنج گەیێن، دڵشکێن، زیانکار، زیانگەیێن.

**مورث:** هۆ، بۆ، مایە.

**مورث:** میرات لەپاش بەجێماو.

**مؤرخ:** لە (تأریخ)دا بیدۆزەوە.

**مورد (ج) موارد:** دەسکەوت، دەستکەوت، سەرچاوە، بنیات، بنیان. گەیشتنگە، شوێنی دابەزین.

**مورق:** گەڵادار، پەلک دار، گەڵاکردوو.

**موروث:** شرە، سەربەستی، میرات ساماانێکە بەمیرات بەکەسێکی بگات.

**موز:** مۆز، هەنجیری باوا (میوە).

**موزع:** دابەشکار، بەخشەر، بڵاوکەرەوە.

**موزع البرید:** بەخشەری چەپەر.

**موزون:** کێشراو، هەڵسەنگاو، هەڵسەنگیراو. هاوەدەنگ، هاوکێش، ڕێککەوتوو.

**موسخ:** چڵکن، پیس.

**موسر (ج) میاسیر:** دەوڵەمەند و توانا.

**مؤسس:** دامەزرێنەر، بناخەدانەر، بنیادکار، دامەزرێن، دروستکار، ڕێکخەر، سازگار، چەقێن.

**مؤسس:** دابینکراو، تاقەتکراو، دامەزراو، ڕێکخراو، بنەگرتوو، دامەزرێنراو، پێکەوەنراو، جێگرتوو، تاقەتکراو، دابینکراو.

**مؤسسة:** دامەزراو، ساختمان، دامودەزگا، دەزگا، بنگا، بونگا.

**موسع:** گوشاد، فراوان.

**موسم:** کەمژ، کژ، گر، گێل، وەرز، گۆنەر، دەم، کەش، کانگە، جەنگە، گۆنەڵ، پشکساڵ.

**موسم البیادر:** جۆخینان، کاتی خەرمانان.

**موسم الزراعي:** وەرز.

**موسوم:** ناوبراو، نیشانەکراو، داغکراو.

**موسوي:** موسایی، جوو، جوولەکە، جهوو.

**موسی:** مووسا، ناوی پێغەمبەری جوولەکان بوو.

**موسی الحلاقة:** گوێزان.

- **شفرة الموس:** دەمگوێزان.

**موسیقی:** باڵەبان، شایلۆغان، موزیقە، ساز و ئاواز، دوودەک و باڵەبان.

**موسیقي:** سازلێدەر، ساز و ئاواز لێدەر، مۆزیقار.

- **الحان موسیقیة:** کازە کاز.
- **جوقة الموسیقی:** تووتەک و باڵەبان، دەستەی مۆزیقە، دوودەک و باڵەبان، شایلۆغان.
- **عالم الموسیقی والالحان:** پەردەناس.
- **علم الموسیقي:** پەردەناسی.

**موشح:** ڕازاوەوە، حەمایەڵ لە گەردن کردن، لە وێژەشدا هەڵبەستێکە کە لە سەرەتای هەر مصراعێکیدا یا بەیتێکی ویدا پیتێکی بێنن کە لە تەواوی واندا ناوی کەسێ یا چینێک یا ڕستەیێک ڕێک بخرێ.

**مؤشر:** نیشاندەر.

**مؤشر:** نیشاندراو.

**موشور (ج) مواشیر:** پارچە بلوورێکی سێ سووچە ڕووناکی دادەبەخشی.

**الموص:** کا.

**موصل:** گەیەنەر، ڕسێن، ڕاگەیێن، بەیێک گەییێن، لێکدەر، گەیێنەر.

**موصل القطعتین:** گەیشتنەوە یەکتری دوو پارچان.

**الموصل:** شوێنی پەیوەندی و پێکگەیشتن، شوێنی بەستن و گرێ لێدان لە بەن و گوریس و ئیتر. ناوی شارێکیشە لە بادیناندا کە لە سەردەمی ساسانییەکانی کورددا ناوی کورد ناوا بووە.

**موصوف:** پێ هەڵگوتراو.

**موصول:** گەیشتوو، پێوەنیشتوو.

**موصي:** ڕاسپێر.

**موصی:** ڕاسپێرراو.

**موصی به:** پێ ئەسپێرراو.

**موضة:** داب، باو.

**موضع (ج) مواضع:** جێ، جێگا، جاگە.

**موضوع:** بابەت، سەر باس، دانراو، پرۆژە. مەبەس، بابەت، دەستاوێژ، ئێوور، سفن، باس، هۆ.

**موضوعي:** بابەتی.

**موطن (ج) مواطن:** لە (وطن)دا بیدۆزەوە.

**موظف:** مووچەخۆر، جیرەخۆر، فردەوەر، فەرمانبەر، کارمەند.

**موظف صحي:** فەرمانبەری تەندروستی.

**موظف المسؤول:** کاربەدەستی لێپرسراو.

**موعد، موعود:** لە (وعدة)دا بیدۆزەوە.

**موعظة (ج) مواعظ:** وتاری پڕ پەند و ئامۆژگاری.

**موفر:** زۆر و فراوان کراو.

**موفق:** سەرکەوتوو، وەسەرکەوتوو، بەمەبەست گەیشتوو.

**موفقیة:** سەرکەوتن، بەمەبەست گەیشتن.

**موفور:** زۆر، فرە.

**موق:** قولینچکی چاوە بەلای کەپووە.

**موقت:** لە (وقت)دا بیدۆزەوە.

**موقد النار:** ئاگر هەڵکەر.

**موقد (ج) مواقد:** ئاگردان، ئاوورگ، کوچک، کوچکادور، کوچکانی، سووتگە، سووچێو.

**موقد:** مەقەڵی، مەنقەڵی.

**موقر:** لە (وقار)دا بیدۆزەوە.

**موقع (ج) مواقع:** لە (وقع وقوعا)دا بیدۆزەوە.

**موقع التأخر:** گیرگە، کارمەندگە.

**موقع الصيد**: ڕاوگە.
**موقع**: خستراو.
**موقع**: ئیمزاکار، مۆرکار، ئیمزاکراو.
**موقف (ج) مواقف**: جێگای ڕاوەستانێیە، ئێستگە، ئێستگا، ڕاگرگە، گرتووخانە. هەڵوێست.
**موقف السيارات**: مۆڵگە.
**موقوف**: ڕاوێستێنراو، گیراو، ڕاوەستراو، دەست بەسەردا گیراو، ڕاگیراو. گرتوو، گراو، دووساخ.
**موكب (ج) مواكب**: کۆڕەو، دەستە مرۆیە کە سوار بێ یا پیادە.
**موكب الملوك**: کۆڕەوی پادشایان.
**مؤكسد**: ئۆکسید دراو، ئۆکسید کراو.
**مؤكسد**: ئۆکسید دەر.
**مؤكد**: قایم، پاڵپشت دراو.
**- غير مؤكد**: دوو بەختی.
**موكل**: کەسێکە یەکێکی تر بکاتە دەمڕاستی خۆی.
**موكول**: پێ ئەسپێرراو، بەندیوارییە بەیەکێکی ترەوە.
**مولي**: سەرۆک، سەردار، سەروەر.
**مولد (ج) موالد**: زێد، زایینگە، مەڵبەند، جێگای لە دایکبوون.
**مولع**: قرم لێ خۆشکەر، زۆر ئارەزووکار، ئازا، ئارەزوومەند.
**مولد**: دروستکار، داهێنەر، زایین.
**المولد الكهربائي**: پێکهێنەری کارەبا، دینەمۆ.
**مولد الحموضة**: ترشی پەیداکار.
**المولدة**: مامان، دایەن.
**مؤلف**: دانەر، ڕێکخەر.
**مؤلم**: بەئێش، بەژانوژووار، بەسووێ.
**مولود (ج) مواليد**: زاو، زاک، تازەبوو، زا، زاگی، زادە، ڕۆڵە، بەچکە، منداڵ، وەند (بۆ کوڕ و کچ).
**المولود حديثا**: تازەبوو، نوو زا، نەو زاک، کۆرپە، کۆرپەلە.
**مولوي**: پاڵپشتدار.
**مولي**: پشت هەڵکردوو.
**مؤمن**: بڕوادار، باوەڕهێنەر.
**موميا**: مۆمیا، مۆمنای. دەرمانێکە پێشوونیان لە مردووانیان دەدا تا نەڕزێ.
**موما اليه**: لێدواو، (اشارة) بۆ کراو.
**مؤنة**: ئازووخە، پەتلە، تفاق، دانەوێڵە، قووت، دانەوێر، دانێڵە، دانهێرک، داناش، ئازووقە.
**- مخزن المؤنة**: هێشتخان.
**مؤنث**: مێیینە، ما، مێزا، ئافرەت.
**مؤنس**: هاودەم، هاواڵ، هەمدەم، هاوڕاز، هاودەنگ، هاڤدەم، بەردەڤک، ئاواڵ، ڕام، هۆگر، هاوڕا، هاوڕێ.
**مؤهلات**: شایستەکار.
**موهة ومواهة**: ئاوی ڕوو، ڕەونەقی ڕوو.
**موهبة (ج) مواهب**: بەهرە، بەهرەوەری، بەهرەمەندی.
**موهن**: پەست و کەنەفتکار، سستکار، بێ تینکار.
**موهوب**: بەهرەوەر، بەبەهرە، بەهرەمەند.
**موهوم**: گومان لێکراو، بەدڵدا هاتوو، ئەوەیە کە گومانی لێ بکرێ.
**موهون**: سست، لاواز، نزم و پەست.
**مؤيد**: لاگر، لایەنگر، پشتیوان، پاڵپشت، هەڤاڵدار، لاکێش.
**المياه الغازية**: ئاوە گازاوییەکان.
**المياه الكبريتية**: گەڕاو و ئاوی گۆگردی.
**المياه المالحة**: ئاوی خوێاوی.
**المياه المعدنية**: ئاوی مەعدەنی.
**مياه النابعة في الربيع فقط**: کووێراو.
**ميت (ج) موتى**: مردوو، مردی، مری.
**- تأبين الميت**: بەمردوو هەڵگوتن.
**- تجهيز الميت بالكفن والدفن**: پەخت کردن.
**- حيوان الميت**: تۆپیوو، هەڕمین.
**- كالميت**: مردەڵە، مردۆخە.
**الميت الجيفة**: مندار، مرار.
**ميتم**: هەتیووخانە.
**ميثاق (ج) مواثيق**: پەیمان، بەڵێن، هەرێ، هەرێنی، ژووان، خولەسێ، گفت، برپە.
**ميدان (ج) ميادين**: (ە) مەیدان، ناوکۆ، گۆڕەپان، کۆڕ، ڕاسایی.
**ميرة**: خۆراک، خواردەمەنی، چێشت.
**ميراث (ج) مواريث**: بڕوانە (إرث). ماڵێکە کە لە لایەن مردووانەوە بۆ شرەگران دەمێنێتەوە.
**ميز**: بڕوانە (تمیز).
**ميز الشيء او لمحه**: بەدی کردن.
**ميزاب**: (ە) مێزاب، مێزاو، پلووسک، سوولی، سوولاوک، لووساووکێ، بۆختک، چەمبلووک.
**ميزان (ج) موازين**: تەرازوو، تەرازی، پلوور. مانگی حەوتەمە بەپێی ژمارەیاری بورجان. تەرازووی هەستیار (لە فیزیا)دا. تەرازوو، کۆمکانستیوا (ئەستێرە). کێش، دەمهەڤری، دۆخ، بار، ئەندازە، سەنگاتی.
**ميزان اعتيادي**: تەرازووی ڕەشۆکی.
**ميزان البرودة**: پلەی ساردی، پلەی سەرمایە.
**ميزان الحرارة**: پلەزانی گەرما، گەرماپێو، گەرمانووێن.
**ميزان الحساس**: تەرازووی هەستدار.

**میزان الهواء**: بانووتن.

**میزانیة**: تو واز، لەنگە، بودجە.

**میزة**: بروانە (ممیز).

**المیـزة الرئیـسیـة**: جـیـاکـەرەوەی بنچـینەیی، جـووتکەرەوەی سەرەتایی، جیاکەرەوەی سەرەکی.

**میزراب**: بروانە (میزاب).

**میس**: کەوت، کەوێت، کەڤۆت.

**میسر**: قومار.

**میسر**: ئاسان، ئامادە.

**میسرة (ج) میـاسر**: چەپەنگ، لای چەپە، بەپێـچەوانەی لای راستـە، لای چۆیە، چەپگە، چەپگا. دەوڵەمـەندی، ئاسـانی، چەپگە.

**میسم**: چزز، چززە، داغ.

– **وضع المیسم**: چزز کردن.

**میسور**: ئاسان و نەرم، دەوڵەمەند.

**میسور (ج) میاسیر**: ئاسان، سانا، نەرم.

**میشوم**: (ە) شووم، نەحس.

**میطدة**: دارێکە بۆ قاپی لەنێو دیواری دەنرێ.

**میقات (ج) مواقیت**: کات، گاڤ، جێگایەکە بۆ لێ کۆبوونەوە.

**میکانیك**: چەرخەگەر. وشەیێکی رۆژئاواییە.

**میکروسکوب**: مرازی وردبین.

**میـکروفون**: گـەورەکـەرەوە، بڵـێندبێـژ، دەنگەوەر، (وشـەیێکی فەرەنگییە).

**میل**: فرسەنگ (٤٠٠٠) هەنگاوە.

**میل**: کلچێووک، میـلی پزشکی و برینانە.

**مَـیل**: هەوەس، هۆک، حـەز، رشـتی، نیـاز، کـەلوو، ویـستن، رووتێکردن، ئـاور لێـدانەوە، ئارەزوو، ڤین، خـووەسـتـەک، هەوەسکردن، دڵ هاوردن، ویـسـتی دڵ. بەلادا خـوار و لار بوونەوە، لارەکە، هاور لێدانەوە، لاری.

**المیل الی الشيء**: دڵ بۆ چوون.

**میلاد**: کاتی لە دایکبوون، رۆژی لە دایکبوون.

**میلاد المسیح**: رۆژی بوونی عـیـسا پێـغـەمبـەرییە کە سـەرەتای مێژووی مەسیحییە.

– **عید المیلاد**: جەژنەی لە دایکبوونی عیسا پێغەمبەر (خ).

**میلان**: بەلادا خوار بوونەوە، بەلادا هاتن، لارێ، لارێی.

**میـمنة (ج) میـامن**: پیـرۆزی. لای راست، راستـگە، راسـتگا، راستـەنگ.

**میمون (ج) میامین**: پیرۆز، بەفەر.

**میناء (ج) موان وموانی**: کەناری دەریایان، شوێنێکی تایبەتییە کە کەشـتـیـان لێی رادەوەسـتن و لەنگەریـشی لێ رۆ دەهێـڵن، لەنگەرگا، لەنگەرگە، پوور، بەندەر، پەسارگە، قەف، مـینا، بنکە، دەرەگە، کەشتیگا، لەن، بەنەر، پەسار، دەراو، دەراڤ. ئاوێنە، جام، نەینۆک.

# ن

**ن**: پیتی بیست و پێنجەمینی ئابێی ئارەوییە.

**نا**: ڕاناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمە لەباری کۆدا: مە، مان، وەکو کنا: بووین. کتابنا: پەرتووکمان، لدینا: لە لای ئێمە، لەکن ئێمە.

**نائب (في البرلمان)**: نوێنەر.

**نائب (وكيل)**: جێگر.

**نائب المحافظ**: جێگری پارێزگار.

**نائب (ج) نواب**: نوێنەر، بندار، جێدار، جێگر، جێ نشین، کەسێکە جێگای یەکێکی تر یا هۆزێکی بگرێتەوە.

**– مجلس النواب**: ئەنجومەنی نوێنەران.

**نائبة (ج) نوائب**: هەنگامە، ڕووداو.

**نائب عريف**: دوو خەت.

**نائحة**: سەردوولکە بێژ.

**النائرة (ج) نوائر**: ئاژاوە، ئاگری هەڵکراو، دوژمنایەتی.

**نائل (م) نائلة**: پێگەیشتوو، پێ گەییوو، پێ ڕاگەیشتوو، دەستکەوتوو، گەیشتوو. بەهرەمەند.

**نائل المراد**: بەئاوات گەیشتوو.

**– غير نائل المراد**: ناکام.

**نائلة**: ناوی بوتێکی بووە کە قورەیشیان لەپێش ئیسلامیدا دەیانپەرست.

**نائم (م) نائمة**: نستوو، نوستوو، نوستی، دەرکەوتوو، خەوتوو، ڕازەر، مەرگ.

**نائي**: دوور، دێر، دووێر.

**ناب (ج) انياب**: دڕۆک، کەڵبە، گیرە، گیرکە، چوار ددانەکانی ژێر چاوانە دووی لە سەرەوە و دووش لە خوارەوەن.

**ناب فحل الخنزير**: برە، شفرە، دڕمولە.

**ناب الفيل**: شفرەی فیلی، ددانی فیلی.

**نابت**: هەموو چشتێکە کە بڕوێ وەکو گژوگیا و داروبار.

**نابض**: تیراوێژ، ڕق، کێن، سپرنگ.

**نابض حلزوني**: سپرنگ.

**نابغ (م) نابغة (ج) نوابغ**: هۆکەڵ، بلیمەت، هەڵکەوتوو، میرکوڕ، کەسێکە خاوەنی هۆش و سەلیقەیێکی بێ هاوتا بێ.

**ناتج**: بەرهەم (کیمیا).

**ناتج**: کەسێکە ڕاژەی ڕەشەولاخی ئاوس دەکا تا دەزێ، بەرهەمهێنەر.

**ناتج ثانوي**: بەرهەمی ناوەنجی.

**ناتج القسمة**: ئەنجامی دابەشکردن.

**ناثر**: پەخشێن، بلاوکەرەوە، پەخشیار.

**ناثر الجوهر**: گەوهەر پەخشان، گەوهەر پەخشێن.

**ناجح**: ڕزگار بوو، ڕزگار، دەرچوو، سەرکەوتوو، ڕەسیو، ڕسکار، پیرۆز.

**ناجذ (ج) نواجذ**: چوار ددانە کاتی خۆ ناسینێیە.

**ناجي، منجي**: ڕزگارکار، قوتارکار، دەربازکار.

**ناحت**: تراشەر، تاشەر.

**ناحل**: بڕوانە (نحيل).

**ناحي (ج) نحاة**: خاوەندی زانیاری نەحو.

**ناحية (ج) نواحي**: کاڤار، ڤاج، پەڕگەنە، بەروبووم، مەڵبەند. لادێ، گەورەدێ.

**– مدير ناحية**: مەڵبەنددار، پەڕگەنەدار، پەخشدار، سەرۆکی ناوچە.

**ناحية (٣)**: کەنار، لا، گۆشەوکەنار.

**ناحية الطبيعية**: ڕووی فیزیکی.

**ناخب**: هەڵبژێر.

**ناخذات (ج) نواخذ**: (ە) ناخودای، کەشتی، کەشتیەوان.

**نادر (ج) نوادر**: ناوێزە، هەڵکەوتوو، دەگمەن، چک، نایاب، بەرکەتی، هەڵکەوت، مێکەوت، دەگمە، نەوەیە کە هی وەکو وی و هاوتای کەم بێ.

**نادراً**: تاکولۆک، بەهەڵکەوت، بەدەگمەن.

**نوادر العمل**: شاكار.

**نادم**: پژمان، پەشیمان، پاشگەز، ژووڤان، پێ لەپاش، خاو، پێشمان، ژیوان، گەڕاوەوە، بەرەو دوا، ژیڤان، هەڵگەڕاوەوە.

**نادی مناداة ونداءً الرجل**: بانگ کردن.

**نادي (م) نادية (ج) نوادي**: بانگیاری، هۆرگە، یانە، کۆگا، ماڵ، دیوان. بانگکار، گازکەر.

**نار (ج) نیـران**: ئاوور، ئاگـر، ئاڤـر، ئاتر، ئازەر، دوژ، ئایەر، یاگی، ئاهیر.

**النار الكردية**: ئاورە، ئاگرۆکە، هەوڵەزلزڵە.

**- اهل النار**: دۆزەخی، دۆژەیی.

**- ایقاد النار**: ئاوور گەشاندنەوە، گەشکردنەوە.

**- حرارة النار**: تینی ئاگری، هالاوی ئاگری.

**- اللعب بالنار**: ئاوور بازی، گڕ گرانێ.

**- لهیب النار**: هێڵە، نێڵە، نێڵە نێڵ.

**- معبد النار**: ئاتەشکەدە.

**- في النار والسقر**: تخ، چش، بەجەحەندەم.

**نارجیل**: گوێزی هێندی.

**نارجیلة**: نێرگەلە، قەننەی ئاوێ، قەلیاناوی، قلیاناوی، مێلاو.

**ناري**: ئاورین، ئاگرین.

**نازك**: (ه) ناسک، ڕفت، ڕازراڤ.

**نازل (م) نازلة**: دابەزیو، هاتووە خوار.

**نازلة**: کێشە، کارەسات، هەنگاوە.

**ناسخ**: پووچکەرەوە، لەناوبەر. ڕوونووسکار، ڕوونووســـیــار، ڕوونووسەر.

**- منسوخ**: پووچکراوەوە، لەناوبراو. ڕوونووسکراو.

**ناسك**: خوداپەرست.

**ناسور (ج) نواسر**: برینێکی ئاوەوزە لە کەناری کۆم و یا گۆشەی چاو و یا بنی ددانی مرۆڤان.

**ناسي**: فەرامۆشکار، بێ زەین.

**ناشئة**: سەرەتای ڕۆژێ، سەرەتای شەوێ، کاتژمێری یەکەمینی شەوێ.

**ناشر**: هەڵخەر. بلاوکەرەوە، پەخشێن، پەخشکار، پەخشکەرەوە.

**ناشر الاخبار**: ڕاگەیێن، پێڕاگەیێن، وەلامدەر، باخیر.

**ناشز**: قۆقز، قیت، قوت.

**ناشزة**: (ه) ناچیزە، ئافرەتێکە گوێ نەداتە مێردەکەی و لەگەڵی نارێک بێ.

**ناشئ (م) ناشئة**: نوێکار، تازەکار، تازەقەلا، کەسێکە هێشتا لە کاری خۆیدا هێشتا باش شارەزا و مەحلان نەبوو بێ.

**ناصب (ج) نواصب**: دامـەزرێنەر، بەرپاکـار، لە (نحـو)دا سـەر (-) دانەر.

**ناصح**: ئامـۆژگـار، مـۆژیار، ڕامـوشگە، ئامـۆژیار، ڕامـشگەر. مۆچکار، مۆچیار، مۆژیاریکار.

**ناصر**: یاریکار، یاوەر، یارمەتیدەر، ڕزگاریدەر.

**- منصور**: ڕزگار بوو، یارمەتی دراو، یاریدە دراو.

**ناصل**: کاڵ.

**ناصي**: دەستەیەک بووە لە نەیارانی عەلی. بوتپەرست.

**ناصیة (ج) نواصي**: نیوچاوان، ناوچاوان، پێشانگی، کالانۆک. کاکۆڵی لای ناوچاوانیش.

**- اغر الناصیة**: قەش، قەشان.

**- شعر الناصیة**: پەرچەم، فکلە، فوکلە.

**ناضج (للفواکه)**: گەیشتوو، گەییوو (میوە)، گەهیشتوو، لاڵ. کولاو، پێگەیشتوو، پوخت، سروا (چێشت).

**- فـواکـه غیـر ناضـجـة**: زرک، نەگـهـایی، نەیادای، هەڵمژۆژ، نەگەییوو، کاڵک، کاڵوکرچ.

**ناضح**: ئاوڕێژ، ئاپرژێنکەر، دادەر.

**ناط**: هەڵبەز.

**ناطق (م) ناطقة**: دووێن، درکـێن، واتەگـەر، واتەکـار، بێـژندە، درکێن بەدەم، بەدەموێل، بەزمان، لێڤەرێن، درکێنەر، گۆیا.

**ناطقة**: هێزی ئاخوتن و ڕاڤەکردن.

**- منطوق**: کوتراو، بێژراو.

**نفس ناطقة**: کەسی ئاخوەر.

**ناطور (ج) نواطر**: ڕەزەوان، باخـەوان، جـەوان، قـۆخڵ، ڕەزڤـان، هۆلکڤان.

**ناظر (ج) نواظر**: دیدەڤان، کێشکچی، بینەر، دیتەر، دێدەوان، بیننده، چاووێز، چاوتێبڕ، چاودێر، تێڕامێن، سەرکار. هاوتا، هاوتەقا، بارتەقا.

**ناظر الامور**: سەرپەرشتکار، سەرپەرشتیار.

**ناظر العمل**: سەرکار، سەرپەرشتیکار.

**ناظر المتصرفین**: شاندیار.

**ناظر المدرسة**: چاودێری قوتابخانە، یاوەری قوتابخانە.

**ناظرہ مناظرة**: وەک وی هەڵسـووڕان، یەکێکی وەکو یەکێکی تر گێڕان. پیلەبازی، پیلەگەری.

**ناظم**: ڕێخـەر، دانەر، ڕێکخـەر، بەسـتـەکـار، هۆنەر. بـەوانە (لە جواغرافیایدا).

**ناظم الشعـر، الاشعـار**: هۆن، هۆنەری هەڵبـەسـتـان، هەڵبـەست ڕێکخەر.

**ناظور**: دووربین.

**ناظورة**: چاویلکە.

**الناعس**: خەفۆک، ئەو کەسەیە وەنەوزە بیباتەوە.

**ناعش**: ژیان و زیندەگانی پێ بەخش.

**ناعم:** نەرم، پێ بڕ، چیت، پخ، لووس، نەرمــوشل، نەرمــونۆڵ، نەر، هوور، مژۆک، بۆقل، شلک، مڵ. ورد.

**ناعم الجسم:** ناسک بەدەن.

**ناعورة:** چەرت.

**نافـذ (م) نافـذة (ج) نوافـذ:** ڕەوان، ڕەوا، کـاری، کـارتێکەر، کاریگەر. تێپەڕ، گشتی.

**نافذة (ج) نوافذ:** پەنجەرە، کولانکە، کولانە، دەلاقە، دوو دەری، سووسە، کولانەی سەربان و دیواری ڕەوزەنە.

**سد النافذة:** سووسەبڕین.

**نافر:** قوشقی، ڕەمەکی، بێزوبۆکار.

**نافسه منافسة:** ململانێ، ناکۆکی، بەربەرەکانێتی، بەرانبەری کردن، ڕکەبەری، دووبەرەکی، دووبەرەکێتی، قینەبەرێتی.

**– منافس:** بەربەرەکانی کار.

**نافض، نافضة:** ناولەرزە.

**– حمى النافضة:** لەرزوتا.

**نافع:** پڕ سوود، بەکەڵک، بەسوود، پێکەیێن، سـوود دەر، سوود بەخش.

**نافلة (ج) نوافل:** نەوە، تالان، پەرستی، بەخشش، خەڵات.

**نافورة:** ناوهاوێژ، ناوهەڵقوڵ، هەڵقوڵ.

**نافي:** نەهێڵ، گێڕەوە.

**ناقة (ج) ناق وانواق:** وشـتری مێ، حێشتر، نارقـان، ناروانە، وشتر ما.

**ناقد:** لێ گر، ڕەخنەگر. کەسێکە پووڵوپارەی چاک لە هی خراپ جووێ کاتەوە.

**ناقشه مناقشة:** پیلەبازی کردن، چەقـە، چەقـە چەق، یەکـتـر دواندن.

**ناقص (م) ناقـصـة (ج) نواقص:** کـەم، کـەمـوکـورت، کەموکوڕیدار، کەموکوڕ، لەت، نادروست، نیڤجۆ، نیوەچڵ، پاندرووس، پچڕیاگ، سـووک، ناتەواو، کـەل، کەموکورتی، نادروست. کەمکەرەوە، داپاچێن.

**ناقص الخلقة:** شەهت، بەراویتە، بەراوێژتە.

**ناقص العقل:** بێ مـێـشـک، گـەوج، بۆدل، تۆلاز، هوڕ، هەرێ، خرپۆ، ڕێژگاو، هۆوەر.

**ناقصه مناقصة:** بەربەرەکانێتی یەکتری کردن، لە کەمکردنەوەی نرخی چشتاندا لەکاتی فرۆشتنیاندا، نرخ لێک کەمکردنەوە.

**ناقض:** خوارڕۆ، پەیمانشکێن، شکێن، تێکدەر.

**ناقض العهد:** پەیمانشـکێن.

**– مناقض:** ناتەبا، ناکۆک، هەڵوەشێنەر.

**ناقل (م) ناقلة (ج) نواقل:** گوێزەرەوە، کەسـێکە خۆی یا مـاڵی خۆی لە شوێنێکییەوە بگوێزێتەوە شوێنێکی تر، گێڕەوە.

**ناقل الكلام:** قسە گێڕەوە، قسە چێن، دووڕوو.

**ناقل الحمولة بالاجرة:** کرێبارچی.

**ناقلات النفط:** کەشتی نەفت گوێزەرەوە.

**ناقلة (ج) نواقل:** کۆچەر.

**ناقور (ج) نواقير:** بۆڕی، کەرەنا، شێپوور.

**ناقوس (ج) نواقيس:** زەنگی گەورەیە لە کلێسایەیدا لێ دەدەن.

**نارقة:** نەخۆشێکە تازە چاک بووبێـتـەوە هێـشـتا کـەمێک تینی مابێ.

**ناكح:** مارەکەر، مارەبڕ، ئەو کەسەیە ژنان لە خەڵکی مارە بکات.

**ناكر:** نەناس، نەزان.

**ناكر الجميل:** پێ نەزان، سپڵە.

**ناكس:** سەرشۆڕ، چەماوەوە یا سەرەوژێر.

**نام نوماً ونياماً:** نووستن، خەوتن، چاو، چوونە خەو، وەرکەوتن، ڕازان، خەفتن، چاو گەرمکردن، هوێتن، بووسان، وتەی.

**ناموس (ج) نواميس:** (ە) خاوەندی ڕاز، نهێنی زان، نامووس، ئابڕوو، ئاوڕوونیـنی، ئاوڕوو. کـەمێن، بۆسـەی ڕاوکـەران. درۆزن.

**ناموسة:** لانی شێری. مێشوولە، نەهووڕە، پێشکە، تەپۆ.

**ناموسية:** کوللە، مێشوولەبەند، پێشکەبەند.

**نامي (م) نامية:** ڕوواو، فراژی و نموکار، فراژی بوو.

**نامية:** مێیینەی فراژییە، هێزی فراژی و بووژانەوەیە.

**ناهق:** زەڕەکار، زەڕەکەر، بەزەڕ.

**ناهي (م) ناهية (ج) نواهي:** نەهێڵ، پێشگر، پێشگیر.

**ناوب، مناوبة:** سزاکردن، هەڵگەڕاندن.

**– مناوب:** نۆبەگر.

**– المناوبة في الحراسة:** نۆبە گۆڕینەوە لە کێشکدا.

**ناوش مناوشة:** وەرگرتن، بەگژ یەکتری داهاتن، ئێخەی یەکتری گرتن، دەمەتەقێ، دەمەقاڵە، شووڤک.

**المناوشة في القتال:** تێکبەر بوون، پێکداهان.

**ناوش لفلان الشيء:** تێکەڵاوکردن.

**ناول مناولة:** دانە دەست یەکتری، دەست بەدەست پێکردن.

**ناي (ج) نايات:** (ە) بلوێر، بلوو، نای، نەی، لوولێ، نەی، بلۆر، پلوور.

**صوت الناي:** فیتەی بلووریری.

**نبـأ (ج) انبـاء:** وەڵام، ئاگـا، کـوتە، باس، قـاو، قـاوە قـاو، دەنگوباس، خـواس، پەیام، پەیڤێن، پەیک، پێـغـەم، تەرزە نوو، باسوخواس.

**الانباء الداخلية:** دەنگوباسی کووڤ، دەنگوباسی ناوخۆ.

**– موجز الانباء:** کورتەی دەنگوباس.

**نبـات (ج) نبـاتات:** ڕووەک، ڕووەگ، شـینـایی، گـیـا، گـیـوا، شیناوەردی، سەوز، سەوزایی، شیناهی، گژوگیا، ڕوواو.

**نبات التي يصنع منه الورق**: گابر.
**نباتات بصلية**: رِوواوەکانی پیوازی، ڕووەکی پیوازی.
**نباتات سنبلية**: ڕووەکی گوڵەگەنم.
**نبات حولية**: ساڵە ڕووەک.
**نبات متكاثفة**: گەپەل، ڕووەکی چڕ.
**نبات مسهل**: ماڵوێچە، ماڵوێنجە.
- **انتاج نباتي**: ڕووەکە بەرهەم.
- **جذور النباتات**: کوڕک، ڕیشە، دەماری ڕووەکان، ڕەگوڕیشەی ڕووەکان.
- **خبير النباتات**: گیاناس، پسپۆڕی گیا و ڕووەکان.
- **عصارة النباتات**: چەقە، شیرە، شیلەی ڕووەکان.
- **علم النباتات**: ڕووەکزانی، ڕووەکناس.
**كومة من النباتات المحصودة**: تا، گیشە.
- **ورقة النباتات**: گەڵا و پەلکی ڕووەکان.
**نباتي**: ڕووەکی، گیایی، داس.
**نباح**: وەڕە، سەگوەڕ، حەپە، عەو عەو، ڕێلین، زایەڵە، گەف، گەفە، گەفە گەف، گەنین، گف، گفە گف، لوورە، لوورە لوور، لووراندن، هەوت، ئوورین، وەڕین، چەپاندن. دەنگ گری.
**نباح الكلاب**: ڕەئین، وەڕین.
**نباش**: گۆڕ هەڵکەن، گۆڕکەن. کفن دز، چت لە گۆڕ دەرهێنا، ڕاز دەرخەر.
**نباشة**: کفن دزی.
**نبالة**: خانەدانی، گەورەیی، ماڵهاتی، ڕەسەنی.
**نباهة**: گەورەیی، بەرزی، بەناوبانگی، زیرەکی، هونەرمەندی، وریایی، وشیاری.
**نبت**: بڕوانە (نبات).
**نبت نباتاً**: ڕوویین، ڕووان، ڕسان، ڕسکان.
**نبت بري**: گیای کێوی.
**نبت طبيعي**: گیای خۆڕوو، گیای خۆڕسک.
- **الانبات الهوائي**: هەوڕووان.
**النبتة**: گژوگیا، پنچک، دەوەن.
**نبتة القثاء وغموه**: بڕکە، یارەما.
- **منبت**: ڕووانگە، جێگا ڕووینی گیا.
**نبح نبحاً ونبوحاً**: وەڕین، عەو عەوکردن، حەپاندن، حەو حەوکردن، هەوتکردن.
**نبذ**: ئەفەڕۆز.
**نبذة**: سەرپێتک، نوویشک، خۆڕوو، کرۆک.
**النبذة**: سەمەنی.
**نبراس (ج) نباريس**: بڕوانە (مصباح).
**نبرة (ج) نبر**: پارووی زەلام.

**النبز بالالقاب**: نرتک، ناوونرتک.
**نبش**: هەڵکەندنەوەی گۆڕ، چت لەژێر زەوی دەرهێنان.
**نبش الماضي**: کای کۆن بەبا کردن.
**نبض (ج) انباض**: نەزڵە، شووارە، شووارق، تریە، پت، پتە پت، پرتە، پل، پند، خرپە، دڵ لێدان، لێدانی دڵ، جووڵانی دەمار.
**نبض الجرح**: پلدان، پڵدان، تروان، ترنیوینگ.
**نبض دقات القلب**: تریەی دڵ.
- **جس النبض**: شووار گرتن، شووارق گرتن.
**نبط (ج) انباط**: یەکەمین ئاوێکە لەبنی بیرێ بێتە دەرێ کەلێکە کە لە (بطائح)ە دەهاتنە ناو عیراقیان.
**نبط الماء نبطاً ونبوطاً**: ئاو لە زەوی و کانی هەڵقوڵا.
**نبط الشيء واستنبط**: دوای پەنهانی ئاشکرای کرد، بەدی کرد.
**نبع**: کەووت (دار).
**نبع نبعاً الماء**: هەڵقوڵینی ئاو لە کانی، بەلقاندن.
**نبع الحار**: گەرمک.
- **منبع (ج) منابع**: کانی، سەرچاوە، پنار، سەروکانی، کانگە، کانگا، سەروچاوە، سەروکانی، دەهنگالە، چەشمە، کانیاو، کێنی، چاوە، هانە، چەمە.
- **المنابع الربيعية**: بەهارەکانی، بێڵوو، دەهنگابە.
**نبعان**: بلقە، بلقە بلقی ئاوێ.
**نبق العجم**: سنجوو، سرینچک.
**نبل (ج) انبال ونبال ونبلان**: تیر، بەش، تەخش، تیری کەوانی.
**نبل**: خانەدانی، باشترین، چاکترین.
**نبلة (ج) نبلات**: پاداش، پاروو، بەخشش.
**نبلة كل الشيء**: بژاردەی هەموو چشتێکی.
**نبهة نبهاً**: وەئاگا هاتن.
**نبهه من نومه**: وەئاگا هێنان، لە خەو هەستاندن.
**منبهات**: وریاکەرەوەکان.
**نبهه على او الى الامر**: وشیارکردنەوە.
**نبوة**: پێغەمبەرایەتی، پەیامبەری، پێغەمبەرایەتی، پەیخامبەری. وەڵام لە چشتێ نەدیوو ڕوونەداوەوەدان.
**نبوة**: کول بوونی شیر، کەم بوونی هێزی بینایی، ناشیرین بوونی ڕوخسار.
**نبوة السيف من كثرة الاستعمال**: سووان، کول بوون.
**نبوخ**: هەوبرهەڵاتن، هۆرامان.
**نبوغ**: پەیدابوون، هەڵکەوتن، هەڵتۆقان، هەڵتۆقین، دەرهاتن، ئاشکرابوون، هۆشیاری و زرنگی و باشی بیر.
**نبوي**: پێغەمبەری.
**نبي (ج) انبياء**: پێغەمبەر، پەیامبەر، وەخشوور، وەڵامدەر، پەیخامبەر.
**نبيب**: قارە، قارە قار، قیرە، قیرە قیر.

**نبيذ (ج) انبذة**: مەی، شیلە، شیرە، بیرە، ئاوجۆ، مەزر.
**نبيذ السكر**: شەکراو.
**نبيل (ج) نبلاء**: خانەدان، ماڵهات، تۆران. گەورە، قەڵەو.
**نبيه (ج) نبهاء**: زیرەک، بەئاگا، ئاگادار، زانا.
**نتاج**: بەر، بەرهەم، بەروبۆی هەموو چشتێکی.
**نتاج الغنم الصغار**: بەرخ و کاری ساوا.
**نتج نتجاً ومنتوجاً**: ڕوودان، دەرکەوتن، سەرهەڵدان.
**النتح**: هەڵمین: ئارەقەی لەشی مرۆ و ئیتر دەلاندن، ئاودادان، ئاو دەردان.
**نتح الماء او نزحة**: ئاو هەڵگوزین.
**نترجة**: نەترین.
**نتف**: ڕنینەوە، کەندن، کەنن، هەڵکەندن، ڤەرووچکاندن، ڤەرووتاندن، پەرتان.
**نتف الريش والزغب الطور بالماء الساخن**: ڕنینەوە، ئاوەڕووتکردن، پەرتان، پەرتاندن.
**نتف صوف الغنم**: وشکردن.
**النتفة**: بەقامک ڕنینەوەی گیا و ئیتر.
**– منتوف**: ڕنراو، هەڵکەنراو.
**– منتاف**: مرازی موو هەڵکەندنی برینگ.
**نتق الجراب نتقاً**: هەنبانەکەی تەکاند تا تۆزەکەی بڕوات.
**نتقت المرأة اوالناقة**: ژنەکە یا وشترەکە فەرخەیان زۆر بوو.
**نتل الشيء نتلاً**: ئەوی کێشایە پێشەوە.
**نتل الجراب**: هەرچی لە هەنبانەدا بوو دەریهێنا.
**نتلة**: ڕاتەکاندن.
**نتل، نَتّل**: هێلکەی وشتر مورغییە کە پڕ بوو لەناو بیابانیدا لەژێر خاکێی دا دەشارنەوە.
**نتن**: بۆگەن، بۆگەنیو، بێگەن، گەن، گەنی، گەنیو، کف، بۆگەندی، کفکۆ، گەندەژە، گەند، گەنیک.
**نتوء**: دەربەڕین، هەلامسان، مالووسکە، مەمیلە لە (کیمیا)دا.
**نتيجة (ج) نتائج**: ئەنجام، پرتووک، پەرتاڵ، بەرە، داوی، شەوت، دەستاو، بەروبۆ، بەروبو، زا، سەرەنجام، زاوزۆ، زاوزێ، دەستاو، دەساوێژ، ئێوەر، کەلیژ، زاوزووە، بێچوو، بەچکە، بەچ.
**نتيجة العمل**: کارەنجام.
**النتيجة المستحيلة**: ڕێگەی ستەم ئەنجام.
**بالنتيجة**: سەرەنجام.
**– منتوج**: بەر، بەروبۆ.
**نثار**: بەخشش، خەلات، پارە هەڵدان، شاباش کردن، نوقل و شەکرۆکە بەسەر بووکاندا کردن، شاباش، بەخشین، شاداش، بلاوکردنەوە، بەخشیش، زەڕوەشان، زەڕاوشان، زێڕەوشان.

**النثر**: وەراندن، وەرانی، وەشاندن، هەڵپرووکاندن، ترکاندن. وێژامە، وەژەگ، نڤیسکی، پەخشان، پەرکە.
**نثرية**: وردە خەرجی.
**– منثور**: بلاو، پەخشراو، دەراو. وتەی نەهۆنراوەوە.
**نجابة**: خانەدانی، ماڵهاتی، کابۆشی، ئابڕوومەندی، ئاوڕوومەندی، ڕەسەنی.
**– منجي**: ڕزگارکار.
**نجاة**: ڕزگاری، دەربازبوون، ئازادی، ڕەسین، قوتار بوون.
**نجاح**: پیرۆزی، بەسەر دوژمناندا زاڵ بوون، سەرکەوتن، سەرکەتن، سەرکەفتن، سەرگرتن. ڕزگاری، دەربازبوون، دەربازی، دەرهاتن، ڕەوابوون، پێکهێنانی کاروبار و پێداویستی، قوتاری، قوتارکاری، هێوان، بردنەوە، پێکهاتن، ڕێککەوتن.
**نجار**: دارتاش، دارتراش، خزارچی، هێژارچی، داتاش، چێوتاش.
**نجارة**: دارتاشی.
**نجاسة**: ناپاکی، پیسی، پیسایی، چەپەڵی.
**– منجر**: بێ کار، ڕێژەک، ڕەندەی دارتاشان، کوولەک.
**– منجر**: ڕندراو، ڕنراو.
**– منجور**: تاشراو، داتاشراو.
**نجارة**: دارتاشی، دارتراشی، دارتاشین. ئاردەمشار.
**– مهنة النجارة**: دارتاشی، دارتراشی.
**نجاسة الانسان**: پیسایی مرۆ (گوو).
**نجاسة بولوغ الكلب والخنزير**: گلاوی، ئاوەگڵی.
**نجاشي**: سەرناوی پادشایانی حەبەشەیە.
**نَجُدَ نجوداً**: ئاشکرابوون.
**نجد (ج) نجود**: هەوراز، جێگای بڵند، بەرزی، درۆک. زەوییێکی پانوبەرین و خێزەلانە پارچەیێکە لە خاکی عەرەبستانی سعودی.
**نجدة (ج) نجدات**: هانا، فریاکەوتن، بەهاوار گەیشتن، هێز، تین، ئازایی.
**نجس**: پیس، چەلەم، لیتۆکە، ئاشوو، ناپاک، چەپەڵ.
**نجس في لهجة الاطفال**: قخ، تخە، قخە قخ، گخە، گخە گخ.
**نجف**: گرد، هەوراز. ناوی شارێکیشە لە عیراق لە ڕۆژئاوای فوراتێدا.
**نجل**: مناڵ، بەچکە، زاوزووە، منداڵ، ڕۆڵە، زارۆ. ناوێکیشە لە خاکی بێتە دەرێ و ڕەوان بێت.
**نجم (ج) نجوم**: ئەستێرە، ستێر، هەسارە، چتارە، ئەختەر، هەسێرە.
**نجم البحري**: ئەستێرەماسی.
**نجم ثابت**: ئەستێرەی جێگیر.

**نجوم السيارة**: ئەستێرە گەڕۆکەکان.
**نجمة القبلة**: ئەستێرەی ڕووگە.
**النجم المذنب**: ئەستێرەی کلکدار.
**نجمة**: ئەستێرەیەکە.
**نجمة الصباح**: ئەستێرەی بەیانی.
**- منجم**: ئەستێرەناس، هەسارەژمێر، ئەختەرژمێر، ئەستێرەژمێر.
**- منجم الميزان**: شەهێن.
**- منجم (ج) مناجم**: لە (منجم)دا بیدۆزەوە.
**نجو**: ڕاز، نهێنی.
**نجود الجبل المتسلسلة**: سەریاڵ.
**النجود من الارض**: سەربەل، سەرقەل.
**نجوى**: پچە، چرچە، ژێر لچەکی، فتە فت، ڕازکوتن، لەسەرەخۆ ئاخاوتنی دوو کەسان و لە ڕاز دووان.
**نجيب (ج) نجباء**: زارورێخ، ڕەسەن، بناو و نیشانباش، خانەدان، تۆرن، مالهاست، گەورە، هەڵبژێردراو، خانوومان، هەڵبژێرراو.
**نح**: لابە، وەلابە.
**نحات**: دارتاش، تاشەر.
**- منحوت**: تاشراو، داتاشراو.
**نحاس**: مس (کەپەر).
**نحاس اصفر**: مسی زەرد.
**نحاس احمر**: مسی سوور.
**نحاس**: مسگەر، مسفرۆش.
**نحافة**: لاوازی، باریکی، دڵگۆشی.
**نحب**: بڕوانە (نحيب).
**نحت نحتا العود**: تاشین، تراشی، ڕەوارتن، تەلاشتن، کرووزکرن، داتاشین، داتراشین، ڕنین.
**نحت الحجر**: بەردتاشین و ڕێکخستنی.
**- منحت (ج) مناحت**: تەشووێ.
**نحر نحراً البهيمة**: سەربڕین، وشتر کوژتن.
**نحر**: سنگ، سینە.
**نحرية**: سینەبەند.
**نحرير (ج) نحارير**: زانا، وریا.
**نحس**: شووم، نەگبەت، ناوچاوان سپی.
**- منحوس**: شووم، نەگبەت، بەدئەختەجووتە، نەها، بێولەت، دۆبڕ، دوومۆڕ، بەدبەخت، بەدووم، قەشقە، قەشان، سەرەخۆرە، چارەڕەش، شەلب، بزۆز، قەش، ناپیرۆز، بەدفەڕ، دەستڕەش.
**نحل**: هەنگ، مێشەنگ، مێش هەنگوین.
**- رئيس النحل**: سەرهەنگ.

**- ذكر النحل**: نێرە هەنگ.
**- ملكة النحل**: شاژنی هەنگان، شاهەنگ.
**نحن**: ئێمە، ئەمە، مە، ئەم.
**نحن بانفسنا، شخصياً**: ئێمە خۆمان، بۆ خۆمان، خۆن، وێمان.
**نحو (ج) انحاء**: وەکو، وەکی، مینا.لا، کن، نک، تەنیشت. ڕووبە، بەربە، بەرەو.
**- علم النحو**: زانیارییێکە باسی دەستووری ڕێکخستنی وشان دەکات. هەڤۆکسازی، زانیاری هەڤۆکسازی.
**- كل نحو**: هەموو جۆرێک، گجوور.
**نحوسة**: شوومی، دوومۆری، دۆبڕی، بەدبەختی، بێولەتی، بەدفەڕی، بەخترەش، دەسترەش، چارەڕەش، ناپیرۆزی.
**نحول**: زراوی، باریکی، لاوازی.
**نحوي (ج) نحويون**: هەڤۆکساز، کەسێکە لە زانیاری نحودا شارەزا بێت.
**نحوى**: پاڕانەوە و نزا.
**نحى (ج) انحاء ونحى ونحاء**: کوندە، خیگە، مەشکە، هیزە.
**النحي من الجلد البقر**: مەشکەی گاووس.
**نحى اللبن نحيا**: ماست ژاندن، مەشکەی ماستی ژاندن، ژەنیای، ژەنین، ژنیای، کەیاندن.
**نحى الحليب**: مەشکەی شیری.
**نحيب**: گری، گریان، ڕۆ ڕۆ، وەیشتیرە، هۆلە، هوولە، شین، شیوەن، بانگ، گریانی سەخت، هوولە هوول، هۆلە هۆل، زاری، زاریان.
**- مناحة**: شینوشیوەن کردن.
**نحيح**: هانکە، هانکە هانک، هانەمان، هەنە هەن، هلکە، هلک.
**نحيف (ج) نحفاء**: بێ تین، کەساس، کەنەفت، باریک، لاواز، لەڕ، داڵگۆشت، مردەڵە، فیقن، مردۆخە، یەکباڵ، بێ تووک.
**نحيل**: باریک، زراو، ڕەقەڵە، سیس، لاواز، ژلژ.
**نخ**: بەرەی درێژ.
**نخاريب النحل**: شانەی هەنگووینێیە، خلێف، خەڵقی هەنگوینی.
**نخاس**: بەندەفرۆش، دەلالی چوارپێیان.
**نخاع (في النباتات)**: کرۆک، مێشک، ماددەی چەور و نەرم و سپی وەکو دەزوو لە بڕبڕەی پشتیدا.
**النخاع الشوكي**: بڕبڕەمێشک.
**نخال**: بێژ، دابێژ، داڵەبێژ.
**نخالة الطحين**: کەپەک، سۆ، سۆس، پنس، ئەسپرزە.
**نخالة الحبوب**: کۆتەل.
**نخامة**: چڵم، کڵم، بەڵغەم.

**نخبة**: بژارده، وژانه، هەڵبژێرراو.
**نخر**: خپه، خپه خپ.
**نخر نخراً**: فشه فش کردن بەلووتی.
**منخـــر (ج) مناخـــر**: کـــەپۆ، لووت، تفنـک، کـــوونه لووت، قوولبێقل.
**منخر الحيوانات**: تفنکی ماڵاتان و وڵاخان. لمیۆز، لەوچه، لمۆز، لمووز، لیپۆز.
**منخور**: کلۆر، کولۆر، فرنک، کرمێون.
**نخروب**: کون، درز، قەڵەش.
**نخس**: نەقیزه لێدان.
**منخاس**: نەقیزه.
**نخل نخلاً**: له هێـڵـەگـدان، دابێژتن، وێژاندن، دابێژتن، بێـژتن، پێژتن.
**نخل بأي شيء**: واڵەبێژی.
– **منخـل (ج) مناخل**: هێـــڵـــەگ، ئێلەگ، هەلەگ، وەرێـــژ، هێرنک، وەرێژ.
– **منخول**: دابێژراوه، والاوێت، هەروی.
**نخل، نخيل**: دارخورما.
– **قشر النخلة**: لیف، توێکڵی دارخورما.
**نخوار**: ترسنۆک، لاواز، بەهەواوفیز.
**نخوة**: گەورەیی، بەخۆ هەڵگوتن.
**نخير**: هەناسه.
**نَدّ**: تەپه، گرد، تەپۆلکه، داری بۆن خۆش.
**نِد**: هاوکوف.
**نِداء**: بانگ، گـاز، گـاڵ، هاوار، چریکه، دەنگه، قـاو، جـاڕ، هەراڵه، بانگەواز.
– **حرف النداء**: نشکۆک، مرازی بانگ کردن.
– **مناداة**: بانگ کـردن، چڕین، گـازکـردن، بانـگ واهێـشتن، قاوکردن، گازی کرن، هایکردن.
– **منادي**: بانگ کار، جارچی، گازکار، دەلاڵ، هاوارکار.
**نداء تدليل من الفتاة الى الفتى**: لاوژه، لاوۆ، لاویژه، لاویژگه.
**ندابة**: سەردوولکەبێژ.
**نداف**: هەلاج، هەللاج، پەرەکار، پەڕەوان، پەمۆکوت، پەرەکەر.
**ندافة**: هەللاجی، پەرەکەری.
– **منذف**: کەوانه و کوتکی هەللاجییه.
**ندامة**: پەشیمانی، پاشگەزی، ژووڤانی، پەژیوانی، پژمانی، پێ لەپاش، گەریانەوه، سەرخۆڤه هاتن.
**ندامة**: نم، شێ، تەڕایی.
**ندب، نُدبة (ج) ندوب**: خانەدان، وەدووی هونەر و چاکه کەوتن. دوولکه، بۆ مردووان گریان و پێ هەڵگوتنیان.

**ندرة**: چکبوون، تاقولۆق. کەم، وێزەیی، چکێتی.
**ندف ندفاً**: هەللاجی کردن، پەرەکاری، پەرەکردن، ژەندن.
**الندم**: پەشیمانی، خەم، خەفەت.
**ندمان**: پەشیمان.
**ندوة**: ئەنجوومەن، ئاپۆره، دیوان، کۆڕ.
**ندى (ج) انداء**: ئاوونگ، شـەونم، شـەڤنم، شـێ، قـەراو، نم، خوناو، خوناڤ، خوناووک.
**ندى تندية**: تەڕکردن.
**نديد (ج) ندواء**: هاوتا، وەکو، هاوچەشن.
**نديم (ج) ندمـاء**: هاودەم، هاونشێن، هاڤدەم، ئەرباب، هەمدەم، ڕێ هەڤ. پەشیمان، ژووڤان، پاشگەز.
**نديم الملوك**: شایار، شالیار.
**نذر (ج) نذور**: پەیمان، فووتوو، مەرج.
**نذر نذراً**: لەخۆ گرتن، لەسەرخۆ، پەیمانکردن، مەرج کردن.
**نذر**: ترس، هەراس.
**نذير**: شاتر، تەتەر. ترسێن، ترسێنەر، ترسدەر. پیری.
**نرجس**: نێرگس، نەرگس، زەریم.
– **روضة النرجس**: نێرگسەجاڕ.
**نرد (ه)**: نەرد، تاوڵە.
– **فص النرد**: مۆرەی نەردی.
– **لعب النرد**: نەردێن، تاوڵەکردن.
– **منضدة النرد**: تەختەی نەرد.
**نز**: زەلـکـاو، زۆنـگ، زەنـەک، زنـاو، زنـەک، زەهـاو، ئـاوەزێ، زوهۆر، ئاوەزا، ئاوەزۆ.
**نزاء**: گێچەڵ، کێشه، هەرا.
**نزاح المراحيض**: چەشمەچی، ئاودەست پاککەرەوه.
**نزاع**: کـێـشـه، کـێـشـه کـێش، گـەلش، کـێـشـمـه کـێش، گـژ، گێرەوکێشه، شەڕ و کێشه، شەڕفرۆشی، ڕقەبەری، دوو گورزه، بەهانه، دەمەقاڵه، بۆ ئەودیو، قره قڕ، شووڤک.
**نزاع**: دەمـەقـاڵه، دوو گـورزه، داوا، مـشـتـومـڕ، هەراوکـێـشـه، دەمەقڕێ، پیله، پیلەبازی، قره، خرچۆتک، گێچەڵ، ململانه، مرکێش مرکێش.
**منازع**: پیله، باز.
**منازعة**: له یەکـتـر بەربوون، هاتنەیەک، شەرە پۆیانێ، قرەکردن، پیلەگرتن، بەربەرەکـانێـتـی یەکـتـری کردن، شـەڕ، دنگەشـه، گێچەڵ.
**نزاكة**: (ه) پاکی، پاکێتی، شێوازی، ناسکێتی.
**نزاهة**: پاکی، بێ پەڵەیی، خاوێنی، ڕووسووری، دووری.
– **مُنَزَّه**: پاکوخاوێن، بێ پەڵه.
**نزح الماء او نتحه**: ئاو هەڵێنجان، هەڵگۆزین.

**نزع**: گیاندان، سەرەمەرگ، گیان کەنیشت، لە ریش هەڵکەندن، هەڵکێشان، لێ کردن. دغ دغە (وەسوەسەی شەیتان).
**نزع السن**: ددانکێشان، دیانکێشان.
**نزع الملابس**: داکەندن، ڕووت بوونەوە.
**- منزع**: داڕنراو.
**نزعة**: سەودا، هەوەس، ویست.
**نزعة علمیة**: سەودای زانستی.
**نزغ بین القوم**: دووزمانی کرد.
**النزغ**: فیتدان، دەست لەپشتدان، هاندان.
**نزف نزفــاً**: ئاوی چاڵاوێ تەواو هەڵێنجــان تا وشک بێ. بەنەشتەری وەیا بەچشتێکی تر خوێن بەردان.
**النزف الدمــوي الوراثي**: زگــمــاک خــوێن بەربوون، بنەمــاوە (زگماک) خوێن بەربوون، سکماکە خوێن بەربوون.
**نزف الدم**: خوێن بەربوون لە لووت یا لە ڕەگ وە یا لە شـوێنێکی تر.
**- توقف نزف الدم**: خوێن گیرسانەوە.
**نُزُل (ج) انزال**: بەخشش، خەڵات، پیاوەتی، خواردەمەنییەکە لەپێش میوانان دابنرێت. ئاوی نێرینان.
**نزل نزولاً**: بڕوانە نزول.
**نزلة**: هەڵامەت، پەسیوی، فرفینگ. جارە هاتنە خوارێک.
**النزلة الشعبیة**: پزوو (نەخۆشییەکی ماڵاتانە).
**- منزل (ج) منازل**: قۆناخ، هەوار، بنەگە، بارەگا، بارگە، بنە، کۆچخانە، لاگا، هەوارگە، ئارامگە. جێگای هاتنە خوار و دابەزین.
**- مُنزَل**: هاتووەخوار.
**- منزل القوافل**: کاروانسەرا.
**- منزلة**: پایە، پلە، شان.
**نزهة**: پاک ســرشــتی، خــۆشی، شــادی. ســەیران، گــەڕان، دوورکەوتنەوە.
**نزول**: هاتنەخوار، دابەزین، داچوون، چوونەخوارەوە، سەرەوخوار چــوون، دادان، وەزەران، وەرهــاتــن، پــەیــابــوون، داهــاتــن، نیشتنەوە.
**نزول الاطفال**: باژەڵە.
**نزول ضیفاً**: داکوتان.
**نزول المطر**: دادانی بارانە، داکردن، داکوتان.
**نزیز**: داخواز، شەهوەتدار، زیرەک.
**نزیز الماء**: ئاوەزێ، پاتلاخ.
**- الاراضي النزیزیة**: تەرازن.
**نزیف**: خوێن بەربوون، داڕسانی لووت.
**نزیف الانف**: لووت پژان، کەپۆ داڕسان.

**- ایقاف النزیف**: خوێن ڕاگرتن.
**نزیل (ج) نزلاء**: میوان، مێڤان، مەهوان، مهڤان.
**نزیه**: پاک، بێ پەڵە، ڕووسپی، خاوێن.
**- منزه**: خاوێن، دوور، داوێن پاک.
**- المنزه عن العیوب**: بێ خەوش.
**نساء ونساء**: دەمارێکە لە لەشی مرۆیاندا لەنێو قەدەوە تا پانیە بەنەخۆش و باداری.
**- عــرق النســاء**: دەردێکە لە ڕەگی ناوقــەدەوە پەیدا دەبێ تا پانیەی.
**نساء ونسوة**: ژن، ئافرەت، پێکۆ، پێۆ، ژەنی، ژنک.
**خطف النساء**: ژن هەڵگرتن.
**نسابة**: ڕەچەڵەکناس.
**نساج**: تەوونگەر، جۆڵا.
**نساجة**: تەوونگەری، جۆڵایی.
**نسّاخ**: لەناوبەر، تێکدەر، کووژێنەوە، ڕوونووسەر، ڕوونووسیار.
**نسار**: سەهەند.
**نُسارِیّة**: هەڵۆ.
**نساف**: تێکدەر، تێکوپەکاندەر.
**نسافة**: تێکدان، تێکوپەکاندان.
**نسب (ج) انســاب**: ڕەگــەز، ڕیشــە، ڕەچەڵەک، نەژاد، ڕەســەن، بابک، ڕەگوڕیشە. خزمایەتی، لەپێش، نزیکێ هاویشتی.
**- سلسلة النسب**: بنەچەکە، ڕەگەز، وەجاخ، زنجیرەی ڕەسەن.
**- سيء النسبة**: بەدڕەسەن، بەدڕەچەڵەک.
**- عارف النسب**: ڕەگەزناس.
**- علم الانساب**: پالاژ، لۆگاریتم.
**- معرفة الانساب**: ڕەچەڵەکناسی.
**نســبــة**: پاڵــشت، هاوگــری، چاو، ڕادە، دانەپاڵ، ڕێژە، وەپاڵ، نێــزیکی دوو چشــتــان لە یەکــتــری، هاوگــەری، خزمــایەتی، لەگەڵخستی، ڕێژە (لە ژمارە و پێواندا).
**- بالنسبة الی**: لەچاو، بەپێی، لەبارەی.
**النسبة الثابتة**: ڕێژەی نەگۆڕ.
**النسب القیاسیة**: ڕێژە هاوپێوانەکان.
**النسبة المئویة**: ڕێژەی سەدانە (ڕێژەی سەدی).
**- الخطأ النسبي**: هەڵەی ڕێژە.
**- منتسب**: سەر بە، لەمەڕ.
**- مُنَسَّب**: دانراوی کاتی.
**- مناســبــة**: گــونجــان، ڕاســتکەتی، بەراورد، بەرژەوەند. سەروساخت، ئاشنایەتی.
**- منسوب**: وابەست، هاوگەر، دەست و پا، دەست و پێ.
**المنسوب الی**: لەمەڕ.

**النســيج (ج) نســائج**: چنين، چنانـدن، تەنين، ڕاچاندن، هەڵبەستن، هۆناندن، هێڤازتن، هۆناندنەوە، تەوونكردن.
- **منسـوج (ج) منسـوجـات**: چنراو، تنراو، تەنراو، كـوتاڵ، پارچە.
- **منسوجات الصوفية**: كوتاڵی خوری.
- **منسوجات القطنية**: كوتاڵی لۆكەیی.
**الانسجة الناقلة**: شانە گوێزەرەوەكان.
- **منحة لعمال النسيج**: سەردڕ، سەردڕانە.
- **محكم النسيج**: بۆڕ، پڕ، سفت.
**غير محكم النسيج**: شاش.
**معمل النسيج**: تەوونخانە، دەزگای جۆلایی، كارگەی جۆلایی.
**نسخ نسخاً**: لەبەر نووسـینەوە، ڕوونووسـكردن، شكڵ نووسی. تێكدان، فەركاندن.
**نسخة**: ڕوونووس، دانەیەك، ڕوونوویس، ڕوونڤیس، زاوژۆ.
**نسر (ج) نسور**: سـەرگـەڕ، سـیسـاركـە كـەچەڵ، سـیسـارك، سیسالك، كەرگەز، كەرگەس.
**نسغ**: لینجاو.
**النسغ الصاعد**: ئاووگی بەرزەڕۆ.
**النسغ النازل**: ئاووگی نزمەڕۆ.
**نسف**: هەڵكەندن، وێران كـردن، سـەرەوژێر و سـەروبن كـردن. تێكویەكاندان، تێكدان. بەبا كردن، شەنە و شانە كردن.
**نسف الحبوب والتبغ**: تەتەڵە كردن.
**منسفة (ج) مناسف**: شەنەی كا و خەرمانانە، ملێب، مەلهێب، شەن.
**نسق**: ڕێـك و پوخت كـردن، وشــە ڕێك هۆنینەوە. هۆنینەوە، پێوەكردن.
**نسك الرجل نسكاً ونسوكاً**: بوونە پارسا (زاهد).
**نسك لله**: پەرسـتگاری و قـوربانی كرد بۆ ئەوەی لە خـودا نزیك بێتەوە.
- **مَنسك**: جێگای قوربانی، ڕێگای ئایین، شێوەی پەرستن.
**نسل**: بەرەباب، ڕەچەڵەك، بنەچەكـە، جـیـل، بناچە، توخم، بابك، پشت، دەڤل، دەوڵ، ڕۆڵـە، منـاڵ، بەچكە. زاوزۆ، زاوزێ، زاوزووە.
**نسمة**: سەر، كەس، مرۆڤ، مەردوم، پشوو، گیانی ئینسان.
**نسناس**: دێوییاو، جۆرە مەیموونێكە زۆر وەمرۆی دەچێ، عەنتەر.
**نسول**: ڕزاندن، هەڵوەراندن، داوەساندن.
**نسياً منسياً**: لەبیر كردن، لەیاد چوونەوە.
**نسيان**: لەبیركردن، لەیاد كردن، فەرامۆش كردن، لەبیر چوونەوە، فەرامۆش.
**نسيئة**: وەدرەنگ خستن، كڕین و فرۆشتنی چشتێكی بەو مەرجە كە دوایە پارەكەی بدرێ.

- **منسي**: فەرامۆش.
**نسيب**: خزم، مرۆی پایە بەرز.
**نسيج حريري**: خامەك، چنراوی ئاوریشمی.
**نسيج شعري رقيق**: گلێم، بەرە.
**نسـيج العنكبوت**: كـاكـڵـە مـووشـان، كـەرتێنە، كـونكا پیـرێ، تەباتۆر، تەونی جاڵجاڵوكەی، تەون، داڤ، داڤك.
**نسيلة**: ڕینك، ڕینگال، ڕینگاو.
**نسيم (ج) نسام**: سروە، سر، سریوە، سوور، بای هێـدی، بای نەرم، سریوە، سریوە سریو، سۆزە، شنەبا، شنۆ.
**نسيم البر**: شنەی وشكانی.
**نسيم البحر**: شنەی تەڕ، شنەی تەڕایی.
**نسيم السحر**: شنەی بەرەبەیانی.
- **نفحة النسيم**: سۆزەی بای.
- **هبوب النسيم**: نزە، سروە.
**نشئ**: تازە پەیدابوون، ڕووان، فراژی بوون.
**نشأ نشوءً ونشاءة**: پەیدابوون و بووژانەوە، دروست بوون.
**منشأ**: سەرچاوە، ڕەچەڵەك، بناوان.
**نشاء ونشأ (ە)**: نیشاستە.
**نشاء المنسوجات الجديدة**: شۆ.
**نشاب، نشاشيب**: تیر.
**نشابة**: تیرۆك.
**نشئة**: تازە دەركەوتن، فراژی بوون، زاخاو، هەوەس.
**نشـارة الخشب**: وردە داری بڕاوەوەیە، ئاردەدار، كـەپەكی داری، ئاردە مشار، ئەسپرزە تەلاش.
**منشار**: (ە) مشار، باگۆرە، بڕهك، بڕهۆك، گۆرە، هەرە.
**نشــاط**: زرنگی، ســەرگــەرمی، هەوەسكار، لەش ســووكی، تـێكۆشین، گـــورجی، توندوتۆڵی، پەرداخی، هەوڵدان، تەڕ دەستی، هەوەسكاری، جەختی، چالاكی، خێرایی، سەرخۆش، چاپوكی، گورجوگۆڵی، شادمانی.
- **عديم النشاط**: خاووخلیچك.
**نشاط الفني**: چالاكی هونەری.
**نشاط المدرسي**: چالاكی قوتابخانەیی.
**محاسب النشاط المدرسي**: ژمارەگری چالاكی قوتابخانەیی.
**قلة النشاط**: خاوی، سستی.
**نشاف**: مژۆك، هەڵمژ، وشككەرەوە، مژەك.
**نشال**: كیسـەبڕ، گیرفانبڕ.
**نشب**: ماڵ، كەلوپەل.
**نشد نشداً**: بانگ كردن، لێ پرسین، داواكردن.
**نشـر**: پشـاندن، ڤـەگـەڕاندن، پەخـشـین، پەرتكردن، پرژاندن، پژاندن، ڕاخـسـتن، بلاو كـردن، پەخـشـكردنەوە. زینـدوو كردنەوەی مردووان لە پەسڵانیدا.

– **يوم النشر**: ڕۆژی پەسلان (قیامة).
**نشر الملابس**: جلك هەڵخستن، ڕاکردن، پەخش کردن، ڕادان.
– **منشور (ج) منشورات**: هەڵخراو، پژاو، پشاو، پەرتکراو، پەرتیات، پەخشیات.
– **منشور في الهندسة**: پوازک.
– **منشار رفیع**: گردەبڕ.
**نشرة**: نوشتەییێکە بۆ چارەی شێتان و یا لەبەر چاوی پیس دەنووسرێ.
**نشرة (ج) نشریات**: پەخشیات، پەرتیات، ڕۆژنامە، پەخشەمەنی، پەخشە.
**نشط**: ئاو هەڵکێشان، ئاو هەڵێنجان.
**نشف**: مژین، هەڵمژین، ئاو هەڵچنین.
**نشف نشفاً**: وشک بوونی ئاو، چکبوون، وەشان، چۆڕانەوە، هەڵچنینی ئاو.
**منشفة (ج) مناشفة**: خاولی، دەستەسڕ و خاولی دەست و ڕووی پێ ئەسترین، ڕوومالّ، مەخمەل، پەشتەمالّ، هوری، هەورە، هەولە.
**نشل**: ڕفاندن، گیرفان بڕین.
– **المنشل**: کەوگیر.
**نشوار**: کاوێژ.
**نشوان**: سەرخۆش، مەست.
**نشوة**: مەستی، سەرخۆشی.
**نشور**: زیندووکردنەوە.
**یوم النشور**: ڕۆژی زیندووکردنەوە (پەسلان).
**نشوز**: تۆران، زیز بوون، بێ گوێی، ناسازگاری ژن و مێردان.
**نشیج**: دەنگ، ئاواز.
**نشید (ج) اناشید ونشائد**: بەست، سروود، هەڵبەستێکە لە کۆڕ و جڤاتاندا بەدەنگ بخوێنرێتەوە. بەرزی دەنگ، دەنگی بەرز.
**نشیش**: دەنگی ئاو و شلەمەنییە لەکاتی کوڵانیدا.
**نشیط**: چالاک، وریا، گوڕج، کۆک، توندوتۆڵ.
**نشیف**: کزر.
**نشیف قابل الحرث**: کەش.
**نص نصاً**: بڵندکردن، دەرخستن، ئاشکرا کردن، هەڵگرتن.
**نص الحدیث**: وەڵامێکی گرت و پاڵپشتی وەپاڵ ئەو کەسەدا کە لێی دوواوە.
**نص (ج) نصوص**: پارچە، تیکە، دەق، ئاوناخن، بنەڕەت، کارۆش، زەوینە، سایە. وشەییێکە تەنها واتایەکی هەڵگرێ و وەرنەگیرێ، وتەی بایەخدار و ئاشکرا کە لە واتایەک بەدەر هەڵنەگرێ.
– **منصوص**: وتە و یا ئاخۆتن کە بەنص کوترا بێ و یا لە ڕووی پشکنین و وە یان گێران سوور کرا بێتەوە.

**نصاب (ج) نصب**: سنووری دیاریکراوە لە چشتێکی ئەو هەندە ماڵەیە کە زەکاتی لەسەر بێ، سەرچاوە، بنچینە، بنەچەکە. دەسکی چەقۆ. بەشە سامانێکە زەکاتی لێ بکەوێ.
**نصب**: نیان، بەرپاکردن، دامەزراندن. سەر.
**نصب الشيء**: هەڵیگرت و داینا.
**نصب العین**: پێش چاو، بەرچاو، بەرانبەری چاو.
**نصب الفخ**: تەڵە نانەوە، تەڵە دانانەوە.
– **منصب (م) منصبة**: کوچکەی بەردی، سێ پایەکەی ئاوری، سێ پێ.
– **منصوب**: دانراو، دامەزراو. سەردار، بەردار.
**النصح**: ڕێنوشوێن.
**نصح نصحاً**: ڕێوشوێن نیشاندان، ئامۆژگاری دادان.
**نصر ونصرة**: یارمەتی، یاریکاری، هاوپشتی.
**نصر نصراً**: یارمەتی دان، کۆمەگی کردن، یاریکاری کردن.
**نصرانیة**: فەلە، دیان (بۆ مێیانە). ئایینی فەلان، گاووری.
**نصف (ج) انصاف**: نیو، نیف، نیم، نیمچە.
**النصف الخارجي**: لەتکەی دەرەکی.
**النصف دائرة**: نێوبازنە.
**النصف الداخلي**: لەتکەی ناوەکی.
– **مناصفة**: دوو نیوەکردن.
– **منصف**: نیوەگەر.
– **منتصف**: نیوە، نیوەڕاست.
**نصفین**: دوو لەت، دوو نیمە، دوو بەش.
**نصل (ج) انصال ونصال**: سەری تیری، لەپ، ناولەپی دەست.
**نصل الحاد**: قوولە.
**نصل الرمح**: پەیکان.
**نصل الورقة**: کەڵا.
**نصلة، نصیلة**: قۆزاخە، دووکڵە.
**نصوح**: ئامۆژگار، ڕاموشگەر. ڕاست. وێژە.
– **توبة نصوح**: پاشگەزبوونەوەییێکی ڕاستە کە هیچ نەشکێنی.
**نصول**: کاڵبوونەوە، کاڵی.
**نصیب (ج) نصب**: بەش، پشک، بەهرە، بژە، بەر، مل، دۆ، مووچە.
**نصیبة (ج) نصائب**: ئەو تەختە بەردانەیە کە لە قەراخ حەوزان دەگیرێ.
**نصیح (ج) نصحاء**: پەنددادەر، ئامۆژگار.
**نصیحة (ج) نصائح**: ئامۆژگاری، مۆچ، مۆژیاری، بەسەر داهاتن، بەسەر ڕۆیشتن.
**مناصحة**: ئامۆژگاری یەکتری کردن، پەندی یەکتری دادان.
**نصیر**: یاریکار، یاریدەدەر، یارمەتیدەر، کۆمەگ، هاوپشت.

**نصيص**: قولْته.
**نضاخة**: ئاوێكه له زەوی هەڵقوڵێ.
**نضار**: زێر و زیو و خشڵ.
**نضارة**: ڕەنگ، تەڕایی، تێراوی، ڕەونەق.
**نضال**: تێكۆشان، خەبات، كۆشش.
- **مناضل**: تێكۆشار، خەباتكار.
**نضج**: گەیشتن، پوختە بوون (میوە یا گۆشت).
- **منضاج**: شیشی كەبابی.
**نضح وانضاح**: حەوز، لێ چوون، دڵۆپەكردن، ئاوڕشێنی كردن.
**منضخة (ج) مناضخ**: ئاوپاش، ئاوڕژێن.
**نضخة نضخاً**: ئاوپڕژێن كردن، تەڕكردن، ئاو هەڵقوڵین، ڕشتن كردن.
**نضر**: هەڵچنین، لەسەر یەكتری دانان.
**نضرة**: تێراوی، جوانی، ڕووگەشی، ئاوداری، ڕەونەقداری، ڕەونەق.
**نضوب**: چك.
**نضج**: پێ گەیین.
**نضهدة**: دۆشەگ.
**نضير**: تێراو، تەڕوتانە، جودان.
**نضيض**: جززە، چززە.
**نط نطاً**: هەڵبەزینەوە، بەهێن، چریقیت، لۆتكێن.
**نطارة**: باخەوانی، باغەوانی.
**نطاق**: قسەكار، ئاخەفتەر، زووان ئاوەر، زووندار، زمانتەڕ.
**نطاق**: پشتێنەر، نێوقەد بەند، شاڵ، كەمەر بەند، شۆتك، كەمەر، شینك، كەمبەر.
- **منطق (موقع الحزام)**: نێوقەد. تەرازووی وتار وتن. ناوی زانیارێتكیشە. لۆژیك، زمانڕەوانی، وتە، گوفتار.
**نطح**: شاخ لێدان، قۆچ لێدان.
**مناطحة**: شەڕەشاخ، قۆچ قۆچانێ.
**نطفة (ج) نطف**: ئاوی ڕوون و پاك، تۆم، تۆو، مەنی، مەنێ، ئاوێكە مایەی زاوزێیە لە ئەندامی شەرمی مرۆ و ژناندا. زیندەوەرێكی وردە كە لەناو مەنیدا پس (جنین)ی لێ بەرهەم دێت. دامار، نەژاد.
**نطق نطقاً**: بروانە تكلم.
**نطق**: كوتن، كرك كردن، پەیڤین، دەمویل.
- **حلو المنطق**: شیرین زمان.
- **منطوق**: وتراو، گوتراو.
- **منطوق النظرية**: وتەی بیردۆز.
**نطوق**: بەدەم، بەزار، بەدەمویل، بەزمان، دەمراست، دەمهەڕاش.
**نطول**: ئاوێكە دەرمانی تێدا دەكوڵێنن و لەشی مرۆی پێ دەشۆرێ.

**نطيحة**: قۆچ لێدراو.
**نظائر (في الكيمياء)**: هاووێنەكان.
**النظائر المشعة**: هاوتیشكەوەرەكان.
**نظارة**: وردبوونەوە، سەیركردن، ڕوانین، تەماشاكردن.
**نظارة**: تەماشاكار، تەماشاچیان، دووربینی.
**نظارة**: چاویلكە، چاڵك، دووربینی، دیدەوانی، دیدەڤانی، چاودێری.
- **منظار**: دووربین.
**نظافة**: خاوێنی، پاكێتی، پاكی، پاگژی.
**نظام**: نەریت، خشتی، یاسا، سازگاری، سازی، پوختی، ڕێباز، پەیڕەو، ڕێكوپێكی.
**نظام الادارة**: ڕژێمی كارگێڕی.
**نظام الاقطاعي**: ڕێبازی دەرەبەگی، نەریتی دەرەبەگێتی.
- **منظمة (ج) منظمات**: ڕێكخراو.
**نظر**: مێزە، هێزە، بینایی.
**النظر**: تێ ڕامان، بینینی، دیتن، ڕوانین، تەماشاكردن، نۆڕین، نواڕین. درەنگ كردن، مۆڵەت دان، لێ وردبوونەوە، لێكدانەوە.
**النظر بدقة**: تێوەڕامان، لێ ورد بوونەوە.
- **الاخذ بنظر الاعتبار**: ڕەچاوكردن، ڕەچاوگرتن.
- **بالنظر**: لەچاو، بەپێی.
- **بعد النظر**: پاشەڕۆژ بینی، پاش بینی.
**نظرة**: جارە تەماشایەك، تەماشایەكی سەرپێی.
**نظرة حاقدة**: خەزرین.
**نظرية (ج) نظريات**: تیوور، بیروباوەڕی، ڕێ، ڕا، بیردۆز.
**نظرية حق الالهي**: تیووری مافی خودایی.
**نظريات الاسس**: تیئۆرەی بنچینەكان، تیئۆرەكانی تووانەكان.
- **منظر**: دیتنگا، دیتنگە، بەرچاو، پێش چاو.
- **ضعيف المنظر**: نابووت، پووچەڵ.
- **منظرة (ج) مناظر**: دیمەن، چاوئەنداز، بەرچاو.
- **مناظر**: چاودێر، پیلەباز.
- **مناظرة**: ڕووانینە یەكتری، پێكەوە لە چشتێكی دووان، پیلەبازی كردن.
- **منظور**: دیتراو، ڕەچاوكراو، لەچاو گیراو.
**نظم**: داستان.
**نظم**: هۆنینەوە، هۆنین، ڕێكخستن، هەڵبەستن، دامەزراندن، ڕێك كردن، هۆنراو، هەڵبەست. سامان، سەقام، یاسا.
- **منظم**: بەڕێكی، بەسەروبەر، ڕێكخراو، سەقامگیر، ڕێكوپێك.
- **منظوم (م) منظومة**: هەڵبەستراو، پێوەكراو.

- **منظومة حماسية**: هەڵبەستی دەماربزێو، هەڵبەستی هەست بزێو.

**نظير (م) نظيرة (ج) نظراء**: بڕوانە (مثیل).

- **عديم النظير**: دانسته، دانسقه.

**نظيرة (ج) نظائر**: چەشن، وەکو.

**نظيف**: پاک، خاوێن، پاگژ، پاکوبیاراو، بێ پەڵە، پووس، پوختە، بێ گەرد.

- **مُنَظَّف**: خاوێن.

- **مُنَظِّف**: سڕ، خاوێنکار.

**نعاء**: مرناو، مڕناو مڕناو (جۆرە دەنگێکی پشیلانە).

**نعارة**: قوم قومە.

**نُعاس**: وەنەوزە، قنگەخەو، بووژان، وەنەوژە، خەوەپیشۆک، خەوەکوتکە، چورتم، وێژینگ، بیرەخەو.

**نعال**: پێش دەرگانە، بەر دەرگانە.

**نَعّال**: ناڵبەند.

- **مهنة النعّال**: ناڵبەندی.

**نعامة (ج) نعائم**: وشترمر، وشتر مرخ، حوشتر مورغ.

**نعت (ج) نعوت**: پێ هەڵگوتن، ڕانان، ڕاناندن.

**نعج**: کاوڕە نێر.

**نعجة (ج) نعاج**: مەڕ، مەه، مهی، میهی، میی، پەز.

**نعجة جبلية**: مەڕەکێوی.

- **بنت سنتين من النعاج**: بەردیل.

**نعرة**: (ە) نەرە، نەڕرە، نیڕرە، هاوار، شاخاندن.

**نعس**: وەنەوزە.

**نعسان**: خەواڵوو.

**نعش**: تابووت، دارتەرم، سەرەجە، داربەس، دارەباس، داربەستی، داروبەست، چوارداره، دارەبازە.

**نعل (ج) نعال**: کەوش، پێڵاو، سۆڵ، کاڵە، پێڵاوێکی سووکی چەرمینە.

**نعل الدواب**: ناڵ، سۆلا هەسپی.

**نعل يصنع من نسيج القطن والصوف**: کەلاش، کلاش.

**نَعَم**: بەڵێ، هۆو، ئا، ئارێ، ها، ئەرێ، ئێ، هەرێ. بەو چوار جۆرە ئاژەڵوماڵاتانەی دەڵێن: وشتر، گا، مەڕ، بزن، ماڵات، ڕەشەوڵاخ، زیندەماڵ، چوارپێ. ج انعام: بەهرە، خەلات، بەخشش. بەهەموو جۆرە چوارپێیەکی دەڵێن ماڵات: مەڕ، بزن، چێڵ، وشترەگا.

**نِعمَ**: چاک، باش، باشتر، چاکتر.

**نِعم الاتفاق**: خودا کرد، خۆشبەختانە.

**نعمة (ج) انعام ونعم**: بەهرە، خەزوبەز، چزووبەز، چاکە.

- **منعم**: ماڵدەر، بەخشندە.

- **متنعم**: بەناز و خۆراکی باش پەروەردەکراو.

**نعناع، نعنع ونعنعة**: هێزا، پنگ، پونگ.

**نعنع**: بڕوانە نعناع.

**نعوذ**: پەنا دەبەین.

**نعوذ بالله**: پەنا بەخودا.

**نعومة**: نەرمی، سازگاری.

**نعي**: دەنگدانی مرۆڤانە بەبۆنەی مردنی کەسێکییەوە تا کۆببنەوە و بیبەنە سەر گۆڕستان. قیژاندن، قیراندن.

**نعيب**: قیرەی قەلەڕەشە و ئیتر.

**نعير**: زڕرە، نەڕرە نەڕ، نرکە، نرکە نرک.

**نعيق**: قارە، قیرە، قارە قار، قیرەی قەلەڕەشە و قەلەسابوونی.

**نعيم**: خۆشی ژیان، ژیانی خۆش، بەهرە، خۆشگوزەرانی، ماڵ، خەزوبەز.

**النغز بقبضة اليد في الجنب غالباً**: نقوورچ، نقوورچک، سیمرخ لێدان.

نغز: چاک، ناسک، سەیر.

**نغف**: کەمێڵە.

**نغف الجلد**: هەنگ، لوویەکە لەژێر پێستی ماڵاتاندا پەیدا دەبێ.

**نَغَل**: بیژوو، زۆڵ، بیژی.

**نغمة (ج) نغمات**: نەوا، ئاوازە، دەنگ، دەنگی خۆش، ئاهەنگ، دیلان.

**نغنغ**: پێوانە، پێوانەی دەغڵی.

**نغية**: سووسە (کەمێک لە مەبەست).

**نغيل**: گەند، بیژوو، زۆڵ.

**نفاث (ج) نفاثات**: جادووگەر، فووکار، فووتێکەر، تەکاندەر، فووکەر.

**نفاخة**: میزڵدان، دەبدەبە.

**نفاد**: بەپایان گەیشتن، نەمان، لەناوچوون، بەسەرچوونی کات.

**نفاذ**: پێکهاتن، ڕێککەوتن، دروستبوون.

**نفاذ**: تیژڕۆ.

**نفاذ**: چوونە ناوەوە، کەوتنە ناوەوە، بەجێ هێنانی فەرمان.

**نفار**: سڵەمینەوە، دوورکەوتنەوە.

**نفاسة**: بەهاداری، نرخداری، پڕ بەهایی، پەسندی، چاکی.

**نفاش**: بژکاری، پەڕەکاری، شێ کردنەوە.

- **الفلز النفاش**: بژەمیتاڵ.

**نفاش**: بژکار، پەڕەکار، شێکار.

**نفاض**: ڕاوەشێنەر، هەڵتەکێنەر، تەکێنەر.

**نفاضة السجاير**: ژێر جغارە، ژێر سیغارە.

**نفاط**: کەسێکە نەفتی لە کانگەی دەرێنێ، نەفت فرۆش.

**نفاطة**: بلۆق، تلۆق، دلۆق.

**متنفط**: بلۆقدار، پفکەدار.

**نفاغ**: بادەی مەیە.

**نفـاق**: لنجی، نارێکی، دووڕوویی، دوویەرەکی، دووپەندی، دووپلیَ.

**منافق**: گێرەشێوێن، دووڕوو، دووزمان.

**منافقة**: دووڕوویی.

**نفاق الحيوان**: تۆپین، تۆپان.

**نفـاية**: چشـتێکە لەبەر خـراپی و گـەندی و نزمی لە چشـتی تر جووێ کرێتەوە.

**نفح (م) نفحة (ج) نفحات**: بەخشبوونی بۆنی خۆش.

**نفحت الريح**: با هات.

**نفح اللمة**: زولفی جوولاند.

**نفـحـة**: جـارە هاتنێکی بایە یا بۆنی خـۆش، بۆن، فـرچک، فریشک، فرسک.

**نفخ نفخاً**: فوو پێداکردن، فوو لێ کردن، فت کردن، بەرچڤاندن، پفوو، پف کردن. هەلاساندن، پەنماندن.

**النفخ بالمنفاخ**: بەکوورە دەماندن.

**النفـخـة**: پف، فـوو لێ کـردن، جـارە پف کـردنێکە. هەلاسـان، ئاماسی.

– **منفاخ (ج) منافخ**: دەمە، کوورەی ئاسنگەران و ئیترە.

– **منفوخ**: دەمەکراو، فوو لێ کراو، پفدراو.

**نفذ نفوذاً**: جێبەجێ کردن، بەجێ هێنان، ئەنجام پێدان.

**نفـر (ج) انفـار**: دەست کـەسـێکە لە (٣) یا ئەوەتا دە. کـەس، قەس، کەسەک.

**نفر واحد**: کەسێک، کەسەک.

**نفر**: سلەمیەوە و دوورکەوتەوە.

**نفـرة**: هەراسـانی، بێـزوبۆ، جـاڕس، پەلم، مـوونج، پووشڵ، لە بەرچاو کەوتن، بێزوبۆ لێ کردن، پاشەکشە.

– **متنفر، منافر**: بێزوبۆکار، بێزیاو، جاڕس، هەراسان.

– **منافرة**: بڕوانە نفرة.

– **منفور**: بێزوبۆ لێ کراو.

**نفس**: پشوو، هەناسە، پش، قوم، پەنگ، مشە.

– **ضيق النفس**: پشوو سوار، هەناسە سوار.

**نفس (ج) نـفـوس**: گـیـان، خـوێن، پەتۆ، خـۆی، تەق، کـەس، مرۆڤ، ڕەچەڵەکی، هۆڵان، نەوسن، هووێژ، هۆترک، هۆلاک، دەروون.

**النفْس الامارة**: نەووس.

**نفس**: هەمان، هەر ئەو، هەر ئەم.

**نفس السبب**: دەق هۆیەکە.

– **بنفسه**: خۆی، وێش، وێشە.

– **نحن بانفسنا** : وێمان، خۆمان.

**نفس**: پشوو، هەناسە، بێن.

**نفساء (ج) نوافس**: ژنی تازە زاو، زەیستان.

**نفسي**: هووێژی، دەروونی.

**نفش**: شێ کـردنەوە، قـشـوبلاو کـردنەوە. تەکـاندن، ڕاچاندن، هەژاندن.

– **منفوش**: شێ کراو، بژ.

**النفض**: تەکـاندن، هەژاندن، داوەشـاندن، داکـوتان، داتەکـاندن، ڕاتەکاندن، هەڵتەکاندن، هەڵدڕین.

**نفض الشجر المثمر**: ڕاوەشاندن، تەکاندن، ڕاچاندن، هەڵوەراندن، دار تەکاندن، بەری دار هەڵوەراندن.

**نفض الماء**: پرژاندن.

– **منفوض**: هەڵوەریو، تەکاو.

– **منفض**: فڵچە.

**نفط**: (ە) نەفت، نەوت.

**النفطة**: بلۆق، تلۆق، پۆرگ.

**نفع**: کـەڵک، سـوود، بەهرە، قـازانج، هۆ، هاڤل، دەرامـەت، دەسـتکەوت، دەسـتگیـر، کـار، باو، ئایە، بەرگـە، چەخش، دەسکەوت، دەسگیر، سوو وەچ، هەو.

– **لا ينفع**: بێ کەڵک، لەکار کەوتوو.

– **منفعة (ج) منافع**: بڕوانە نفع.

– **ذو منفعة**: سووددار.

– **المنافع المتبادلة**: سوودی بەرانبەری.

**نفق**: نووێن، لە غەم، لە خەم.

**نفقة (ج) نفقات**: ڕۆژانە، بژیوی، خەرجی، ڕۆژی، مووچە، هۆی ژیان و بەڕێوە چوونێ.

**نفل (ج) نفال**: وێنجە، سێ پەڕە، (گیا).

**نفل**: پەرەستنێکە گەڕەک نەبێ.

**نفود**: قاتی، گرانی.

**نفوذ**: تێپەڕین، کار تێکردن، چوونە ناوەوە، دەسـتەلات، هێزی کار پێکهێنانێ، دەسترۆیشتن، کارکردن، تەزوو.

– **منفذ (ج) منافذ**: ڕێگا، ڕاڕەو، دەرەتان، دەلاقە، کەلێن.

**نفـور**: تاربوون، ڕەوین، هەلاتن، ڕەوان بوون، دوورکـەوتنەوە. بێزوبۆ لێ کردن، دڵهەڵکەفتن، دڵگیری.

– **منفور**: تار، شەنی، بێزوبۆ لێکراو، دوورخراوەوە.

**نفوس**: کەس، دانیشتوان.

**نفي**: نەهێـشتن، پەکـخسـتن، پاڵپـێـوەنان، لابردن، نەهێـڕتن، دوورکــردنەوە، گــومکردن، دەربەدەر و شــاربەدەر کــردن، ئاوارەکردن، قۆڵ بۆ نەکێشان، پەسند نەکردن.

– **منافاة**: بەپێچەوانەی یەکتری جوولانەوە، دوورخستنەوە، باس و وتووێژکردن.

**- منافي:** لەناوبەر، دەرکار، دژ، نەیار.
**- منفى:** ئاوارەگا، شارەودەرگا.
**- منفي:** ئاوارە، دەربەدەر، سرگوم، شارەو دەرکراو.
**نفير:** شێـپـوور، نالـە، زاری، دادوهاوار. هێـرش بەدەس گـەل، گەلەکۆمە، گەلە کۆمەگی، هەلاتن، ڕەوین.
**نفـير العـام:** ڕەشبـگیـری، حـێلجـاڕی، ئێلجـاڕی، ڕاپەڕینی تێکرایی.
**نفيس (ج) نفائس:** گران، نرخدار، هێژا، پەسند، گرانبەها، پڕ بەها، بەهادار، گرانبار.
**نفيضة (ج) نفائض:** قەرەوولی پێش و پاش لەشکری.
**نقاء:** پاکی، خاوێنی.
**نقاء (ج) نقي:** پاک، بژاردە.
**نقاب:** پێچە، پەچە، رووبەند، رووپۆش، چارەپۆش.
**نَقَّاب:** کۆلەر، لێکۆلەوە.
**نقابة (ج) نقابات:** بژارگـە، ڕابەری، هەلـسووڕاندنی کـاروباری گەل.
**نَقَّاد:** ڕەخنەگر، وردەگیر، لێ گر.
**نقار (م) نقارة:** هەلکەن، بەردتراش، بەشوێن کاردا گەڕ، دەهۆل لێدەر.
**نقار:** دەمەقالە، شەڕە دندووکێ.
**نقارة:** دەهۆل و زوڕنا، دۆلە سرنا.
**نقارة:** پیشەی بەردتراش.
**نقاري:** دەهۆل لێدەر، دەهۆلژەن.
**نقـاش:** ڕەنگکار، ڕەنگێن، نەخـشـێـن، نەخـشکار، ڕەنگرێژ، شێوەساز، نیگارساز.
**نقاش:** دووکە، دەمەقالە، وتووێژ.
**- مناقـشة:** گـفـتـوگـۆ، دەمـەتەقێ، پیلەبازی، چەقـە چەق، لێ کۆلینەوە.
**نقاض:** ناڕاست، بەپێچەوانە ئاخەفتەر.
**نقال:** گوێزەرەوە، گێرەرەوە، چیرۆکبێژ.
**نقالة:** بڕوانە (نعش).
**نقـالة:** مـرازێکە کـە بۆ ئەندازە گـرتنی گـۆشـە و کـەناران بەکـار دەبرێت.
**نقاهة:** لە نەخۆشی ڕاست بوونەوە، چاک و خۆش بوونەوە.
**نقاوة:** پاکی، چاکی خۆ ڕووبوون.
**نقب:** کـونکردن، قـولکردن، سـۆراخکردن، ڕێگای باریکە لەژێر زەویدا.
**نُقُب:** بڕوانە (منقب).
**نقب عن الاخبار:** بەشوێن دەنگوباسدا گەڕا.
**نقد:** پەسندکردن، جووێ کردنەوەی پوولی خراو لە هی باش باشی و خراوی و وتار دەرخستن. ڕەخنە لێ گرتن، وردەگیری.
**نقد فني:** ڕەخنەی هونەری، نرخ شوناسی.
**نقـد (ج) نقـود:** ئەو پارەیەیە کـە لە بەهای چشـتـدا دەدرێ بەپێچەوانەی قەرز.
**نقداً، بالنقد:** بەنەغدی، وشکە، وشکەسپی.
**سك النقود:** دراو لێدان.
**نقد ادبي:** ڕەخنەی وێژەیی.
**نقد علمي:** ڕەخنەی زانیاری.
**نقداً:** دەست بەدەست، دەس بەدەس.
**نقدي:** نەغد، وشکە، نەخت، نەخدینە.
**نقر نقراً:** لێدان، کونکردن، هەلکەندن، کۆلین.
**نقرة:** چالی پشتە سەرییە، پارچەی تواوەوە لە زیو یا لە زێڕ.
**نقرس:** دەرد و زامێکە لەناو ساویگەو جومگەکانی قامکان پەیدا دەبێ.
**النقس:** مەرەکەب، زوخالاو.
**نقش نقشاً:** ڕەنگاندن، نەخشاندن، جوانکردن.
**نقش (ج) نقوش:** نەخش، ڕەنگ، نیگار.
**نقش:** ڕەنگاندن، نەخشاندن، نیگارکردن.
**نقشة:** قاقەزێکە کە لەسەر ڕووی وی پارچە زەوییەک یا شار و ولاتێک نیشان دەدرێت.
**نقص (ج) نواقص:** بڕوانە (نقصان).
**نقص نقصاً ونقصاناً:** لێ کەمبوونەوە، کورتی هێنان.
**نقـصـان:** ناتەواوی، کـورتی، کـەمی، کـێـمی، کـەمـوکـورتی، کەموکوڕیی، کیماهی.
**نقض:** هەلوەشـانـدن، هەلدڕین، هەلپـەڕینەوە، ڕووخـانـدن، هەلڕووشان.
**نقض العهد:** پەیمان شکاندن.
**- مناقض:** بەپێچەوانە.
**- مناقضة:** بڕوانە نقض.
**نقطة (ج) نقـاط ونقطة:** نوخـتـە، نووک، خـال، تک، هووتک، تنۆک، نچک، نتک، دەرقەل، پت، پنت، نیتک.
**نقطة الاستناد:** شاڕاگر، پنتی ڕاگیربوون.
**نقطة الاصل:** نچکی سەرەتا، نچکی بنچینە.
**نقطة التماس:** خالی لێکەوتن.
**نقع:** تۆز و گەرد.
**نقل:** چشـتـێکە دەیکەنە مـەزەی مـەی یا چێـژی زار بگۆڕێ وەکـو فستق و پۆستە و بادام و جۆرە شەکرۆکەیێک.
**نقل:** گـوێزتنەوە، ئالـوگـوێز، گوێزاندنەوە، گـوازتنەوە، ڕاگـوێزتن، تاوتوێ کردن، گۆزاندن.
**النقلة:** گەورە کچ، مانگوڕ.
**نقلية (ج) نقليات:** بار کێشی، بار گوێزتنەوە.

**نقمة ع نقم**: رق، قين، ئازار.
**نقود** : دراو، پووڵ، پاره، دراف، دهراف، سکه.
– **ضرب النقود** : سکه لێدان.
– **مهنة سك النقود** : کیمیا.
**نقوع**: خووساو.
**نقي**: بروانه نظيف.
**نقي الخد**: ناوچاو پاک.
**نقيب (ج) نقباء**: زانای گەل، سەرۆک و ڕابەری گەل.
**نقير**: دەنگ، لە بەرد یا لە داری هەڵکەندن.
**نقيصة (ج) نقائص**: پەڵە، کەموکوڕی، چپک، نەنگ، شووره‌یی.
**نقيض**: نەیار، ناحەز، دوژمن، بەرگر، بەریەرچ، بەرچەپ، میتەل، چرکە، کرچە، کرچە کرچ.
**نقيضة**: ئەوەیە کە بەپێچەوانەی چشتێکی تر بێ، چاڵاوی پڕ ئاو.
**نقيع (ج) انقعة**: ئاوی ڕاوەستاو و خۆش، خۆشاوی خورما و یا مێوژی ئاوی سارد و خۆش. خوساو، خووس، خووسار، خووتسار.
– **منقوع**: خووساو.
**نقيق**: قرره، قرته، قرته قرت، گاره، گارەگار.
**نكأ**: ئارهاندن، کولاندنەوە، ئێشانەوە، چووزانەوە، هاتنەوەسۆ.
**نكاح**: مارەبڕین.
– **مناكحة**: لێک مارە کران.
– **منكوحة**: مارەکراو.
**نكاف**: ملەخره، ملەخڕێ، گوێ ڕەپە.
**نكال**: ئازار کردن، ئەنراندن.
**نِكاية**: چووزاندنەوە، ئازار پێگەیاندن، کوشتن یا بریندارکردنی دوژمن، کولاندنەوەی برین.
**نكب عنه نكباً ونكوباً**: لێ وەرگەڕانەوە.
– **منكب**: ڕەگ، باسک، شان.
**النَكْباء**: زریان، ڕەشەبا، گەردەلوولە، بای ناسازگار.
**نكبة (ج) نكبات**: (ه) نەگبەتی، نەهاتی، ئاوەکوڵ، بار کەوتوویی، مەینەتی.
– **ابتلاء بنكبة**: لێ قەومان.
– **منكوب**: لێ قەوماو، فەلەکزادە، نەگبەت، چارەڕەش، بەدبەخت، پایەماڵ، کەتی.
**نكة (ه)**: نکە، نکە نک.
**نكتة (ج) نكات**: ڕاژۆ، وتەی باریک و ورد و ناسک، نوختەی ڕەش لە سپیاییدا و یا نوختەی سپی لە ڕەشاییدا.
**النكث**: تەکاندن، داوەشاندن، پەیمانکشاندن.

**نكثنة**: هەڵکفاندن.
**نكح نكاحاً المرأة**: ژنی مارە کرد.
**نكحت المرأة**: ژنەکە مێردی کرد.
**نُكر**: زیرەکی، بلیمەتی، فەرمانی سەخت.
**نَكراء**: زیرەکی، ژنی زیرەک و تیژبیر.
**نكر نكراً ونكوراً**: خۆ لێ نەزان کردن، ددان پێدانەنان.
**نكرة**: نەناسراو، نەناس.
– **منكر**: ددان پێ دانەنەر.
– **مُنكَر**: چشتێ پڕ زیان و خراپ.
**نكس**: سەرەوژێر کردن، هاووردنەوەسۆ.
**نكسة**: کارەسات، لێ قەومان.
– **منكس الرأس**: سەرشۆڕ، سەرنزم.
– **منكوس**: سەرنخوون، دەرنخوون، سەرەوژێر.
**نكفة**: لالغاوە.
**نكفتان**: هەردووک لالغاوە.
**نكهة**: بۆنی زار، بۆنی خۆش.
**نكول**: لارێ گرتن، کشانەوە، لادان، ترس و بێ تینی نیشاندان، کشانەوە دواوە.
**نكير**: بەرەنگێکی تر خۆ نیشاندان، فەرمانی سەخت و دژوار.
**نُم**: بنوو، بخەوە، بخەفە، وەرکەوە، بووێ، بوێ، بووتێن.
**النمأ، (صفار القمل)**: مێشوولکە، متکنە، مێشوولە، مێتکنە.
**نماء**: پتربوون، بڵندبوون، فراژی بوون.
**نماء النباتات**: شین و سەوز بوو نەوەی گژوگیایان، گەشەکردنیان وڵاژی بوون.
**نمّام**: قسەگێرەوە، قسەچین، پاشدوو، دووڕوو.
**نَمام**: ڕیش، توویل.
**نمر (ج) نمور**: پڵنگ، پالینگ.
**نمر صغير**: پڵنۆ.
**نمرة**: هەژمار، ژمارە.
**نمس**: کەڕەکیفە، کەڕوو.
**النمِّس**: مشکەخۆرە.
**نمش**: درۆ گوتن، قسەچینی.
**نمط**: شێوە، ڕەفتار، جۆر.
**نمق نمقاً**: زللە لێدان، دامەزراندن، نووسین.
**نمق الكتاب**: نامەی نووسی.
**نمل (ج) نمال**: مێروو، گێرکە، مێروولە، مۆریلە.
**النمل الصغير**: گێرکە، گێرنگ، مێروولە.
**النملة**: مێکوتە.
**نمنم**: خاکی، زەنگیانە.

**النمو**: پروفرلژی بوون، گەشەکردن، رووان، زاخاو و نەشونماکردن، بەرزبوون، هەڵچوون، زۆربوون، گەشە و گەورەبوون، فەرلژی بوون.

**نموذج**: (ە) نموونە، تیپ، نمینە، سەرمەشق.

**نموذجي**: نموونەیی.

**نمير**: ئاوی زۆر و خاوێن.

**نميق (م) نميقة**: نووسراو، نەخشاو، ڕەنگین.

**نميم (م) نميمة (ج) نمائم**: بڕوانە (نمّام).

**نميمة (ج) نمائم**: پاشدوویی، خوسپە، نەکامی، پۆلک.

**نهاء**: بڕوانە نهایة.

**نهائياً**: یەکجارەکی، نەبێکجاری.

**نهائي**: کۆتایی، بنەبڕ، هەرە دوایی، دمایی، دماهکی سەر.

**نهّاب**: جەردە، ڕێگر.

**نهار (ج) انهار**: ڕۆژ، ڕۆ، ڕۆش، ڕۆچیار، ڕۆژگار.

**نهاق**: زەڕەی کەرێ، سەڕە، زۆڕە، زەڕە، زۆڕە، زووڕە زووڕ.

**نُهاميّ**: ڕەبەن، ڕێگای ئاسان.

**نهاية (ج) نهايات**: پایان، بنەبان، بنەڕەت، کۆتایی، دوایی، ئەوپەڕ، دۆر، دوا دۆڵ، سەرەنجام.

**اللانهاية**: بێ پەڕی.

– **لا نهائي**: بێ پەڕ.

– **بلا نهاية**: بێ بەروودوایی.

– **الى النهاية**: هەتاسەر.

– **في النهاية**: لە ئەنجامدا.

**النهايات الطليقة**: کۆتاییيە بەرەڵاکان.

**نهاية طويلة**: دووڤدرێژ.

**نهب**: تالان، فەرهوود، چەپاو، گالات.

**النهب**: تالانکردن، چەپاوکردن.

– **منهوب**: تالانکراو.

**نهج**: ڕێگای ئاشکرا و گوشاد، پێڕەوی، ڕێباز.

– **منهج (ج) مناهج**: بەرنامە، بارنەمە، کارنامە، پرۆژە، پەیڕەوی، ڕێباز، لیسە.

**نهد**: بڕوانە (ثدي).

**نهر (ج) انهار**: چۆم، ڕووبار، چەم، چا، دەرە، گەلاڵ، ڕووخانە.

**نُهزة**: دەرفەت، نێچیر.

**نهش**: قەپکرتن، گازگرتن.

**نهض**: بڕوانە (نهوض).

**نهضة**: ڕاپەڕین، تەکاندانە خۆ، جووڵە، ئاخێز. هێز، تین.

**نهق**: زەڕە، زەڕڕە زەڕڕ.

**النهق**: زەڕین، سەڕەکردن، زۆڕین.

**نهل الابل نهلاً ومنهلاً**: وشترەکە ئاوی خواردەوە تینووتیراو بوو.

**منهل الماء**: دەراو.

**نَهِم**: نەوسن، چاوبرسی، چڵ، چلێس، زگەڕۆ، زکپەرست.

**نهم**: چاوبرسێتی، بلامکاری.

**نهمة**: نیاز، ئاتاجی.

**نهوض**: هەستان، بڵندبوون، هۆرێزان، ڕابوون، ڕاستەوە بوون، ڕاست بوونەوە، هەڵسان، هەڵستان، لە خەو وەئاگا هاتن، ڕاپەڕین.

**نهي (ە)**: پێشگری، نەهێڕتن، نەهێشتن، بەرهەڵست کردن، پەکخستن، ژ بەرڤەکرن، تخ لێدان، قەدەخەکردن.

– **منهي**: نەهی کراو، تخ لێ کراو.

**نهيق**: زەڕەی گوێدرێژانە، ئەڕڕە ئەڕڕ، نەڕڕ، عەڕڕە.

**نوء (ج) انواء**: تەشق.

**نوء الهواء**: تەشقی هەوا.

**نواة (ج) نوى ونويات**: دەنک، ناوکی قەیس و خورما و میوەی تر، چەقالە، ناوکە.

**نواجذ**: دیانکاکیلە، خرێنە، خلێنە.

**نواح**: بڕوانە (نوحة).

**نوادر العمل**: شاکار، شاکردار.

**نوال (ج) انوال، منوال**: کەرەستەی جۆلایی و تەونییە، بەهرە، بەش.

**نوبة**: قان، نۆبە، نۆرە، نۆگە، نووگە، دان، کەڕەت، چەڵ، هەل. نۆبەتی.

**نوحة**: گریان و ڕۆ ڕۆ، گریان و شیوەن، گریان و زریک و هۆڕ.

**نور (ج) انوار**: (ە)، ڕووناکی، ڕۆشنایی، ڕەوشەن، ڕۆژبەیانی، بیناهی، قتشک، سۆما، بەلەدی، ڕەمی، ڕۆشنی، ڕۆشنا، لە (ڕوون) وەرگیراوە.

**نور القمر**: تریفەی مانگ.

**نورة**: بەردەقشڵ، قسڵ، هەک. دەرمانی گەرماوێیە لە قسڵ و زەرنیقی دروست دەکرێت، داڕوو.

**نورج**: داڕوو.

**نورس**: قاقڵی بازان (باڵندە)، زیقاوڵە، ماسیەوچنە، ماسیگرە، ماسی خۆر.

**نوط**: بەستنەوە، هەلاوەسین.

– **مناط**: ئاوێژتنگە.

– **منوط**: بەستراوەوە، هەلاوەسراو، وا بەست.

**نوع (ج) انواع**: جۆر، چەشن، جەستە، بابەت، توخم، پل، تاخم، جەڵەب.

– **متنوِّع**: تامە تام، جیاواز، جۆراوجۆر.

**نول**: گورد، نەوەرد، ئامرازی تەون و جۆلاییيە.

**نوم**: خەو، وەرم، خاو، خەف.

**نومان**: نوستوو.
**النّوم**: نووستن، خەفتن، خەوتن، رازان، رازانەوە، ڕاکەتن.
**– منام**: نوستنگە، ژووری نووستن. خەون.
**– المنامة**: پێخەف، نووێن.
**نون**: دەوات، خووالسته شێر، کلکی شێر، ماسی.
**– ذو النون**: ناویانگی یونس پێغەمبەرییە.
**نووم، نویم**: خەوالوو.
**نوی نواةً**: ویستن، ئارەزووکردن، گرتنەپێش، لەبن سەری خۆدانان.
**منوی (ج) مناوٍ ومنايا**: دڵخواز، ئارەزوو، ویست.
**نوی**: بڕوانە نواة.
**نيء**: کاڵ، کرچ، نەکولاو، خاو، خام، کالوکرچ، کرچکۆڵە، نەکولیو، هەڵمژار.
**نيابة**: جیات، بر، بات، لەجیاتی، لەبری، لەبرێتی، لەباتی. نوێنەری، بنداری، جێ نشینی.
**نيابةً**: لەجیاتی.
**نياح**: بڕوانە (نوحة).
**نيازك**: گوڵنەستێرە، شۆلە، سۆڵە، گوهنەستێرە.
**نية (ج) نيات**: ویست، مراز، ئارەزوو، کاڤێن، نیهاد، هەوەس.
**نيدة (ربط الحيوانات)**: سەمەند، سەمەندۆک.
**نيدلان**: کابووس.
**نيِّر**: ڕۆشنایی دەر، درەوشەر.
**نير (ە)**: نیری جووتی، ڕیش، نێڵە.
**نيسان**: شەستەباران، گولان، بانەمەڕ، شێستەباران. شەستەبارانی ئێمە لە ۲۱ی نیسان دەست پێدەکات تا ۲۰ی مالس مانگی چوارەمینی مانگانی رۆمییە و (۳۰) رۆژە.
**نيل**: (ە) ڕووبارێکە لە مصر سالێ دوو جاران سەرکێشی دەکات. نیل، هەش، گیایەکە بەشیلەی وی خوری و موو و ئاوریشم رەنگ دەکرێت.
**نَيل**: گەیشتن، بەئارەزوو و ئاوات گەیشتن.
**نَيل المنى، نيل المراد**: نەفدین، بەئارەزوو گەیشتن.
**– منال**: دەسکەوتگە، شوێنی سوود لێ وەرگرتن.
**نيلج (ە)**: نیل، هەش. تەنی، هێس، دۆرنج (کیمیا).
**النيلة**: خم هەش.
**نيلوفر**: لەیلووپەڕ، نیلووپەڕ، نیلوفەڕ، گیایەکە لەناو ئاوێدا دەڕووێ.
**نيوء**: کالی.

# هـ

**هـ**: پیتی بیست و شەشەمینی ئابێی عەرەبییە.

**ە**: ڕاناوی نێرینەیەکی نەدیوە بەدوای وشانەوە دەنووسێ وەکو کتابە: پەڕتووکی وی.

**ها**: ڕاناوی مێینەیێکی نەدیوە بەدوای وشانەوە دەنووسێ وەکو: والدتها: دایکی وی، داکا وی.

**ها**: بۆ بانگکردنە، بڕوانە (یا). بۆ ئاگادارکردنەوە.

**ها (ە)**: ها، بگرە، هانێ.

**هائج**: وەجۆشوخرۆش هاتوو، هار، ڕقوقین. حالور، دڵگەرم، هاندراو، تاو دراو بۆ جووت بوون.

**هائل**: سامدار، ترسێن، بەسام. سەخت، قورس، گران.

**هائم**: دەسەسەر، واق وڕماو، ئاوارە، دەربەدەر. سەرگەردان، سەوداسەر، شەیدا، دوودڵ.

**هابط**: لاواز، نزم. ئەو کەسەیە بێتە خوارێ.

**هابل**: کڕوکاشکار (کاسب)ی فێڵباز، ڕاوکەرێکە فێڵ لە نێچیر بکات.

**هات**: بدە، بێرە، بێنە.

**هاتف**: ئەو کەسەیە تەنها دەنگی ببیسترێ و ڕەنگی نەدیترێ. تەلەفۆن، دوورەژنەو.

**هاتل**: هەوری زۆر بەبارش.

**هاجر**: وتەی پڕووپووچ، جووێ کەرەوە.

**هاجر (ج) مهاجرة**: شەخت بوون، ڕەهنی، ڕوو لێ وەرگێران، دەربەدەر بوون.

– **مهاجر**: ئاوارە، لانەواز، ڕەهەنە.

– **مهاجرة**: لانەوازی، دەربەدەری.

**هاجرة**: نیو ڕۆژ، سەختی گەرما.

**هاجس**: ئەوەیە بەدڵدا تێپەڕێ.

**هاجم**: پەلامار دەر، داڕساو.

**هاجن**: ژنەکچ، کچێکە لەپێش خۆناسینێدا شووی کرد بێ.

**هاجئ**: حونجەیی کار. پاشبێژ، نرتک بێژ، نرتک بژێر، پاشدوو، داشۆر.

**هادم**: کاولکار، وێرانکار، کاوولگەر.

**هادي**: ڕابەر، یارێکار، پێشەوا، ڕێبەر، ڕێ نیشاندەر، ڕانما.

**هادئ**: هێدی، سست، هێمن، سەنگین و گران، ئارام، مات، تەپس؟ سرەوتوو.

**هادية**: داردەست، بەردێکە لە ئاوێدا دەرکەوتبێ.

**هارّ**: (ە) هار، سەگی هار.

**هارب**: هەڵاتوو، ڕەویو، تەقیو، ڕاکردوو.

**هارش مهارشة**: تێکبەردانی سەگان.

**هاروت**: دەڵێن ناوی فریشتەیێکییەکە بەڕکوکینی خودای گرفتار بووە و لەگەڵ فریشتەیێکی تر کە ناو (ماروت)، لە چالاوی بابولێدا سەرەوژێر هەڵاوەسراون.

**هارون**: ناوی برای مووسا پێغەمبەری بووە.

**هاشم**: شکێن، وردوخاشکار.

**هاخم**: هەپروونکار، پەرتوبڵاوکەرەوە.

**هاخمة**: هەپروون.

**هاطل**: لێزمە، ڕەهێڵەبارانە، ڕهێڵ، شەسس.

**هاقل**: مشکی نێر، ڕزق.

**هال**: بەردەتراویلکە، سەراو، سەراب.

**هالة (ج) هالات**: خەرمانەی دەورەی مانگێیە، جۆخینە، ئاخڵە.

**هالك**: لەناوچوو، تێداچوو، تەفروتوونا بوو، مردوو.

**الهالوك**: کورگە.

**هامّة (ج) هوام**: جانەوەری خزندە و گەزۆکی ژەهردار وەکو مار. زیندەوار.

**هامة**: سەر بۆ هەموو چشتێک، کەللە.

**هامة**: کوندە بۆ، شابوو.

**هامش**: شیرا، پەراوێز.

**ها هنا**: ئەلێرە.

**ها هو**: وا، ئەوا، ئاتە، ئەمەتا، تی، ئەمەتانێ، ئەوەتا، ئەوەتانێ، ڤا، ها هەوە، بۆ تاکێکی نێرینەی کەسی سێیەم بەکار دەبرێت، لەوێیە، وا لەوێیە.

**ها هي**: هەر وەکو (ها هو) وایە بەڵان بۆ تاکێکی مێینەی کەسی سێیەم بەکار دەبرێت.
**هـاون (ە)**: هـاون، ئـاوونـگ، ئـاوان، هـاوان، ئـاوەن، هـاوەن، هاونگ، هەوان، هۆد.
**هاویة**: جەهەنەم، دۆژە.
**هب هباباً**: دوورکەوتنەوە، نەدیوبوون.
**هباء (ج) اهباء**: تۆز، گەرد. مرۆی بێ هۆش و هێر، هێڕ، گەوج.
**هباءٌ**: بەخۆڕایی.
**هباب**: تۆز و خۆڵ، تۆزێکە کە لەناو تیشکی ڕۆژێدا بەناو ڕوچنە و کولانەکاندا دەبینرێت.
**هبار**: قوونسوو، عەنتەر، سەگسار مەیموونی نێر.
**هبّاش**: زۆر کۆکەرەوە، گردو کۆکەرەوە.
**هِبة (ج) هبات**: بەخشش، بەخشین، دیاری، خەلات، پێشکەش، پێشکێش.
- **موهبة (ج) مواهب**: بروانە (هبة).
- **موهوب**: بەخشراو، پێشکەش کراو.
**هبت هبوباً**: هاتنی با.
**هَبَر**: گۆشتی نەرمە، نەرمک، گوڵمە، گۆڵمە.
**هبرة**: گوشتپارە.
**هبش تهبیشاً**: کۆکردنەوە.
**هبطة القلب**: قرچەی دڵ.
**هُبَل**: بوتێک بوو لە کعبە لەپێش ئیسلامدا دەپەرسترا.
**هبـوط**: هاتنەخـوار، کـەم بوونەوە، لاواز بوون، لە کـورتی دان، نەوین، نیشتن، وەزەران٬دابەزین.
- **مهبط (ج) مهابط**: نزمی، نشێوی.
**هتاف**: هوورا، شاباش، چەپڵەڕێزان، ئافەرین، بژی، هەربژی.
**هتاك**: ئابڕووبەر، بەدزمان، پەردەدڕ.
**هتر**: بروانە هتک.
**هتر (ج) اهتار**: درۆ، ناڕاستی. سووچ، تاوان، هەڵە.
**هتف، هتاف**: دەنگی وشک و ڕەق و بڵند.
**هتك (ە)**: ئەتک، هەتک کردن.
**هتك الحیاء**: ئەبڕووبردن، ئەتک کردن، سووک و ڕیسوا کردن.
- **مهتوك**: ڕیسوا، ئابڕوو براو، بێ ئابڕوو.
**هتم**: شکاندن، شکانی ددانی بڕۆک.
**الهتن**: ڕەهێڵە، لێزمە.
**هث هثاً**: درۆکردن.
**هثاث**: درۆزن.
**هج هجاً**: بروانە (هدم هدماً).
**هَجّاء**: بروانە (هاجێ).

**هِجاء**: پاش ملەکردن، لەپشتی سەردان، پاشگۆتینی، پاشبێژی، نرتک بێـژی، جنێـودان. پچڕاندنی وتە و ئەژمـاردنی پیـتەکان بەسەروبۆریانەوە، حونجەیی کردن، چەچە، حینجە.
**حروف الهجاء**: ئەلف و بێیە لە (ا) تا (ی).
**مهاجاة**: جنێوپێکدان، لە پاشملەی یەکتری دووان.
**هجر (ج) اهجار**: جودایی، دووری. وڕێنە، وراوە.
**هجران**: دووری، دووری.
**هجرة**: بەجێ هێشتن، جووێ بوونەوە، جێگۆڕی کردن، ڕەوکردن، کۆچکردن. دووری.
**هجرة مهاجرة**: دەربەدەرکردن، شـارەو دەرکردن، جێ پێ گـۆڕین، ڕەوکردن.
**مهاجر**: لانەواز، ڕەهەنە.
**مهاجرة**: دوورکەوتنەوە، جووێ بوونەوە، دەربەدەری.
**هجس**: ورتە ورت.
**هجم هجـمـاً وهجـومـاً**: پەلامـاردان، هێـرش بردنەسـەر، شـالاو بردنەسەر.
**هُجنة**: وتەی شوورەییدار، شوورەیی و ناشیرینی.
**هجـو**: خـراپەگـوتن، بەخـراپە هەڵبـەسـتن بۆ کـەسـێکی دانان، بەهەڵبەست لە خراپەی کەسێکی دووان، بەدگۆیی، بەدوێژی، داشوشتن.
**هجوع**: بەشەو نووستن.
**هجوم**: هێـرش، شـالاو، تەکـان، شـاتاوڵ، پەلامـار، هەڵمـەت، پێدادان، دارِسان، دارِسکان، هژووم.
- **مهاجم**: پەلاماردەر، شالاوبەر.
- **مهاجمة**: بروانە (هجوم).
**هجیر**: نیوەڕۆ، کاتی نیوەڕۆیە، گەرمای نیوەڕۆیە.
**هجیر**: دەریاچە، باهە، حەوزی گەورە.
**هجین (ج) هجن**: دوورەگ، ئەو کـەسـەیە باوکی ئارەو و دایکی بێگانە بێ و یا باوکی باشتـر و خانەدانەتر بێ.
**هجین**: ولاخی ڕەسەندار لە لایەن دایکییەوە.
**هدأب، هدبة**: ڕیشوو، ڕیشی.
**هدأف**: دەسـتـراسـت، پڵـوتکە، سـەگـمـانە، نیـشـانە ئەنگێـو، ئەنگێوە، نیشانچی، سەگڤان.
**هدأم**: وێرانکار، ڕمێن، ڕووخێنەر.
**هُدام**: گێژی، سەرسووران.
**هدایة**: ڕێ نیشـاندان، شارەزا کردن، ڕێبەری، ڕابەری.
**هدب (ج) اهداب، (اهداب العین)**: ڤـرۆڵ، مـژوولانـگ، مـژە، مژگول، موژانگ، بژانگ، بشکول، بشکۆڵ.
**الهدب**: دۆشین، چنین، بڕین.
**هدة**: گرمە، گرمە گرم.

**هدّد**: بروانە تهدید.
**هدر هدراً**: بەخۆڕایی چوون.
**هدر**: بروانە معتوە.
**هدر**: خۆڕایی، فیڕۆ، لابۆرە، لاپۆرە، مفت، خۆڕاوبۆڕا، بێ نرخ، بادی هەوایی، بایی هەوایی.
**هدراً**: بەفیڕۆیی، بەخۆڕایی.
**هدرجة**: هایدرێن.
**هدف (ج) اهداف**: نامانج، نیشانە، نیشان، بالەتە، کۆلک، خاڵ، ئارمانج، شەقڵ. مەبەس، مەبەست، ئارەزوو، ئاوات. شوێنی بڵند.
**هدل**: گمە گمی کۆتری.
**الهـدم**: تێکدان، تێکوپێکدان، وێرانکردن، کاولکردن، خاپوورکردن، تێک شکاندن، داتەپاندن، هەرستاندن.
– **مهدوم**: وێرانە، کاوول، خاپوور، خرتک، خرتکە، خستراو، کەمباخ، داخان، کاولکراو.
**هدنة (ج) هدن**: دەست هەڵگرتن، وازهێنان، ئاشتی، جەنگ وەستاندن، شەڕ ڕاگرتن.
**هدهد وهدوداً**: وێرانکردن، شکاندن.
**هدهد (ج) هداهد**: هەپۆ، پەپوو، پەپووسلێمانکە، پەپووک.
**هدهدة**: ڕاژاندن، ژاندن.
**هدوء**: هێدیتی، شێنەیی، ئارامی، هێمنی، ئاشتیی، کپی، ئاسپایی، سرەوت، داکاسان، کش، کشوماتی.
– **بهدوء**: بەئاسپایی، بەحاستەم.
**هدود**: گەردەنە.
**هُدى**: ڕێگەی ڕاست، ڕاستە ڕێگا.
**هَدْى، هَدِیة**: بووک، مەڕی قوربانی.
**هدى**: ڕابەری، یاریکاری، ڕێگای ڕاست.
**هَدى**: مەڕێکە بۆ قوربانی و یا ئاژەڵوماڵاتێکە بەدیاری ببرێتە کەعبە و لەوێ بکرێتە قوربانی.
**هدید**: هەڕەشە، هەڕەشەوگوڕەشە، گەف. گرمە، گرموهۆڕ، گیف، قرمە، قرمە قرم، قرموهۆڕ، هاڕڕەی ئاو یا هەور.
**هدیر**: گمە گمی کۆتر و دەنگی وشتری. وڕە وڕ، هاژە. گەف.
**هذا**: ئەمە، ئەم، ئەیدا، ئێد، ئیم، ها، ئەیە، یە، ئینە، ئەڤ، ئەڤە، ئی، ئاتە.
**هذار**: چەنەباز، وڕ وڕە.
**هذه**: هەر وەکو (هذا) وایە بەڵان بۆ مێیینە بەکار دەبرێت. ئەڤێ، ئەوێ، وێ، ئەوێهێ.
**هَذَبَ هذباً**: بڕین، خاوێن کردن، ڕێکوپێک کردن. هێمن و پاکخووکردن.
**هذر**: فیشاڵ، لاف، پڕ بێژدی.
**هُذلول**: مرۆی سووک، تیری سووک، گورگ گرد و تەلی گچکە.
**هذى**: ئە ئەوە (بۆ مێیینە).
**هذیان**: وڕێنە، ڤڕاڤە، چشتی پرووپووچ، برسکاندن، پەرتوبڵاو، وەڕینە، هەڵێتوپەڵێت.
**هر (ج) هررة**: گوریە، پشیلەی نێر.
**هر (ە)**: هرە، هەرە، برۆ.
**هَرَب هرباً**: هەڵاتن، ڕاکردن، ڕەمکردن، پەکین، پشتدان، تاران، تەورین.
– **مهرب**: هەڵاتگە، دەرەتان.
**هرة**: پشیلە.
**هرج**: هەرا هەرا، هەراوهوریا، هەرا، کێشە، کێشە کێش، ئاژاوە، تێکەڵاوی، پشێوی، شپرێوی، ئاشووب، سەخڵەتی، شلۆقی.
**هرج مرج**: ئاخۆران، تاڵان و برۆ.
**هرج هرجاً**: تووشی گێچەڵ و کێشان هاتن.
– **مُهَرَّج**: زۆربڵێ، چەقەچناوە، زۆروەڕ.
**هرد**: زەردەچێوە، زەردەچوو.
**هرس هرساً الشيء**: کوتان، بەزەبر هاڕین.
**هرس**: (ە) هەرەس، ڕووخانی ڕونووە بەفری کێوانە.
**هرط**: ساقەسوورە، جوچکەی باڵندانە کە تازە لە هێلکە هاتبێتە دەرێ پەڕ و باڵی دەرنەکرد بێ، تووکنە، زەرنەقووتە، زەڕنەقووتەڵە.
**هرطمان**: گاگۆز، گلێنە، کزن و ولێرە.
**هرع هرعاً الیه**: بەپەلە بۆ لای وی چوون.
**هرل**: زرکوڕ، کوڵەوەس، زڕمنداڵ. منداڵی ژنێکییە لە مێردی پێشووی.
**هَرَم**: پیری، کۆنەساڵی، هەرەم.
**الهرم**: پۆیەتێژ (لە ئەندازیاریدا).
**الهرم (ج) هرمون**: زۆرپیر، پۆرسپی.
**هَرَم**: ئەویەری پیرییە. پۆیەتیژ، قووچەکەیەکی سێ یا چوار گۆشەیە.
**هرم (ج) اهرام**: قیتکاییێکی سێ یا چەند سووچە کە لەکاتی پێشوودا بۆ گۆڕستانی پادشایانی میسری دروستکراوە.
**هرماس**: شێری دڕندە، بێچووە پڵنگ.
**هرمیس**: کەرگەدەن.
**هروب**: هەڵاتن، پشتدان، ڕاکردن، ڕەمکردن، فرتەکردن، فڕکاندن، هەڵهاتن، غاردان، دەرچوون.
– **مَهرَب**: ڕاگە، دەرەتان، هەڵاتگە.
– **مُهَرِّب (ج) مهارب**: قاچاخ، قاچاخچی.
– **مهرَّب**: کەلوپەلی قاچاخ.
**هرور**: گلوو، گلە، گلار، بۆڵ (ئی ترێ).

**هرول (ج) مهرولاً**: گورکە، گورکەلۆق، ڕۆیشتنێکە لە نێوانی ڕۆیشتن و غاردانێدا، بەهەڵتەک هەڵتەک ڕۆیشتن.

**هرولة**: گورگەلۆقە، هۆرتە هۆرت.

**هروم**: ژنی بەدخوو و بەدڕەوشت.

**هرهرة**: (ە) هەرا هەرا، دەنگە دەنگ.

**هرير**: مرە مر، مراندنی سەگ، هەرا هەرا.

**هريسة**: (ە) هەریسە، کەشکەک، کەشکێن، چێشتێکە لە گەنمەکوتا و گۆشت دروست دەکرێ.

**هريرة**: پشیلەی گچکە و مێ.

**الهز**: لەراندنەوە، شەکاندن، هەژاندن، ڤرڤراندن، لەرزاندن، لەنگاندن، ڕاژەنین، لەراندن، لڤاندن، وەشێن، لەرزە، ڕاوەشاندن، جوولاندن، هاژاندن، هەژیاندن.

**الهز بشدة**: ڕاتەکاندن.

**هزاز**: هەژێن، جوولێن، هەژێنەر، لەرزێن، لەرزۆک.

**هزء**: قەشمەری، گاڵتە پێکردن.

**هُزار**: بولبول.

**هزّاز**: لەرزۆک، لەرزێن.

**هُزال**: لاوازی، لەڕی، لەجەری.

**هزال**: برژانگ.

**هَزّال**: گەمەکار، شۆخی کار.

**هزالة**: گەمەکاری، شۆخی کاری.

**هزبل هزبلة**: زۆر هەژار و دەستکورت بوون.

**هزة**: جوولان، جوولە، تەکان.

**هزة ارضية**: بوولەرزە، بوومەلەرزە، شەکان، لەرە، لەرزەک.

**هزَج**: گۆلە و دەنگی هەوری، دەنگی خۆش.

**هزر هزراً**: لێدان، دەرکردن.

**هزع**: بڕوانە اضطراب.

**هزل**: قەشمەری، گەمە، گەپ، شۆخی، قسەی پڕوپووچ.

**هزل هزلاً**: بێ تووک و لاواز بوون.

**هزله**: لاوازی کرد.

**هزلي (ج) هزليات**: قەشمەرجار، زارۆک، لیپۆک، گاڵتەچی.

**هزم**: کەشەوور، قرمە.

**هزم العدو هزماً**: دوژمن شکاندن، شکست تێخستن، ڕاڕفاندن.

**- مُهَزِّم**: بەزێنەر، ڕاڕفێنەر، ڕاونەر.

**- مهزوم**: شکاو، هەڵاتوو، تەقەتێکەوتوو.

**هزمة**: چاڵی، لغاوە، لالغاوەی زاری. پەڵە، تانە، هەور (لەککە).

**هزهاز (ە)**: هازە هاز، هاشە و هاژەی ئاوێ.

**هزهز هز هزةً**: کەنەفت کردن. جوولاندن، بزواندن.

**هزيز**: هاشە هاش، شنە، هاڕەی ئاو یا هەور، هاژە، هاژە هاژ، هاشەی با.

**هزيل**: لەڕ، زەبوون، لاواز، بێ تێن، بێ تووک، سیس، ژاژ، کەرتەلەڕ.

**هزيم**: قرمە، قرمە قرم، گرمە، گرموهۆڕ، هاڕەی ئاش.

**هزيمة (ج) هزائم**: ڕەو، کۆڵ، کۆڵدان، هەڵاتن، ڕەو تێکەوتن، ڕەم، ڕدمین، ڕەوین، ڕەڤین، شکان.

**الهس**: چپە، سرتە.

**مهامسة**: چپە چپ و سرتە سرت لەگەڵ یەکتری کردن.

**همسيس**: ورد و هەراشکردن، کوتراو، سرتە.

**هش (ە)**: هەش، خم.

**هش (ە)**: هۆش، هۆنش، ئۆش، بۆ ڕاوەستاندنی گوێدرێژان بەکار دەبرێت.

**هش**: خاو.

**هشاشة**: شادمانی، گوشادە ڕوویی، شادبوون.

**هشام**: جوامێری، بەخشش.

**هشيم**: گزرە. گیای تێکشکاو و ژاکاو و گەچراو.

**هضّ هضاً**: شکاندن، کوتان.

**هضبة**: بان، بانی، بڵندایی، بەرزایی.

**هَضم**: هەپروون کردن، هەرس، تواندنەوەی خۆراکە لە چیکڵدانەدا، تواندنەوە و بڵاوکردنەوە، بەگیان کەوتن.

**- الجهاز الهضمي**: ئامرازی هەپرووني.

**- سوء الهضم، الهاضمة**: دەوی، تەبعی، دەوا.

**- سيء الهاضمة**: تەبع.

**هطول المطر بغزارة**: شەستەبارانە، شێستەبارانە، دادان، داباریین.

**هطول المطر خفيفاً**: نمەبارانە.

**هفهفة**: جریوە، خشخش، خشە، خشە خش.

**هفوة (ج) هفوات**: تاوان، سووچ، چەوتی.

**هك**: کوت لێ دان، کوت لێ ژەنین.

**هكذا**: بڕوانە (کذا).

**هل**: ئایا، ئەرێ، هەرێ، هەیاران، مەر، مەگەر، داخوا، چما، ما، چمان، ئەیە، ئاخۆ، ئەیدا، داخۆ.

**هلا**: بڕوانە (هل).

**هلاّب**: بۆران، ناوی چەند ڕۆژێکی ساردیشە لە مانگی ڕێبەنداندا.

**هلاس**: دەردە باریکە، دیق، وەرەم.

**هلاك**: لەناوچوون، پێچوون، تەفروتوونا بوون، تێدا چوون، سەردانان، فەتارەت، فەتەرات، قڕ، لەناوچوو. مردن، تۆپین، منداربوون.

**هلاكة**: لەناوچوون، تێدا چوون.

**هلال**: مانگی یەک شەوە، مانگی تازە، نووێ هەیڤ.

**هُلام**: جۆرە خۆراکێکە لە گۆشتی گۆلکێ دروست دەکرێ.

**هلة**: سووک، ئاسان.
**هلع هلعاً**: بەپەرۆش و کز بوون.
**هَلك هلاكاً**: لەنێوچوون، مردن، تەفروتووتا بوون.
**هَلُم، هلُموا**: وەرە، وەرن.
**هلهال**: کراسی ناسک، پارچەی خراپ چنراو.
**هلهل (ج) هلاهل**: تلیلی، تریلیلی، هەیا هوو تریلیلی، دەنگێکە لە گەرووەدا دەنێرێ و دەبرێ.
**مهَلهَل**: بێ سەروبن، بێ سەروبەر.
**مهلهِل**: تریلیلی کار.
**الهلهل**: بەفر، وەفر.
**هلوع**: چلێس، نەوسن، زگبرسی، قرم لێخۆشکار، چاوبرسی، چاوچنۆک. خۆنەگر، ترسەنۆک، نەوێر، نەوێرەک، نەوێرۆک.
**هلُوف**: بەراز، مالۆس.
**هَليلج**: (هـ) هەلیلە.
**هَليم**: ئەوەیە کە پێوە دەنووسێ.
**هُم**: ئەوان، وان، ئانیشا، ئانیلە، ئەوان، ئازی، ئەی، ئەڤان، ڤان، یان. ڕاناوی گەلی نێرینەی نەدیوە.
**هَمّ (ج) هموم**: ئاراو، خەم، خەفەت، دڵتەنگی، پەرۆش. ویست، مەبەست.
– **مهموم**: خەمبار، دڵتەنگ، دەغەزدار.
**همّ هماً**: پەرۆشدار و خەمناک بوون.
**هما**: ئەوان، ڤان. تەنها بۆ دوو کەسی نەدیوە چ نێر بێ و چ مێ.
**همّاز**: تانووتکار، ئەزمێن، ئەزمان ڕەش.
**همّاس**: شێری دڕندە.
**هُمام**: میر، پیاوی گەورە، خونکارە، بەخشندە، چالاک.
**همّام**: خەمکەی خەمان.
**هماي**: هوما (باڵندە).
**همايون وهمايوني (ە)**: هومایوونی، شاهانە، میرانە.
**همّة (ج) همم**: ئەوەیە کە گرنگ لێ بۆ کردن، دڵمەزنی، ویستی قایم، مەردایەتی، هەوەس، چاپوکی، چالاکی.
– **ذو همّة**: دڵمەزن، مەرد.
– **مهم**: گرنگ، پێشەم، پۆتەکە.
**همَج**: مێشی ورد، مرۆی نزم و گێل و هێڕ.
**همجي**: خوێڕی، لووگی، ناڕەسەن.
**همس**: سرتە، سرتە سرت، سریوە، سریوە سریو، چپە، چپە چپ، چریە، چریە چرپ، سرکە، سرکە سرک، چڤە، چفە چف، پچە، پچە پچ، چڤە چڤ، خشە، خشە خش.
**همش همشاً**: کۆکردنەوە، گردکردنەوە. وتەی بێ کەڵک گوتن. گەزتن.
**همك همكاً**: ڕقەبەری، بەربەرەکانی کردن. هەوڵ تێدا دان.
**همهم**: زریکاندنی پڵنگان.
**همهمة**: مینگە، مینگە مینگ، دەنگە دەنگ، هەللا هەللا، هەرا، هەرا هەرا، فروجۆ، هەراوهۆریا، خرتۆل.
**همود**: ئارامی، دامرکان.
**هميان (ج) همايين**: (ە) هەمانە، هەمبانە، هەمیان، تێشوودانە، دۆخین.
**هُنّ**: ئەوان، وان، ئانیشا، ئانیلە، ئەی، ئەڤان، ڤان. (ڕاناوی گەلی مێیینەی نەدیوە).
**هن (ە)**: هێن، هەرامە، وانیک، هێن و مێن. ئیریچی.
**هَنا**: خۆشی، نۆشی گیان بوون، خوەشی.
**أهنأ**: خۆشی.
**هنأ تهنئة**: پیرۆزبایی کردن.
**هُنا**: ئێرە، ئێرانە، ئەیرە، لێرە، لەیرە، ئەیردانە، ئیمکە، ئیگە، ئیندا، ئێرگە، ئێرهە، چوندە، چێگە، ئەگرە، ڤێرێ، لها، هر، ئەیدا، ڤرا، لەگرە، هر، هرە.
**هُناك**: وێ، ئەوێ، وڕ، وێرێ، ئاگــە، ئەینە، ڤێ، لایێ هێ، لەوێندەرێ، وێندەرێ، لەوێیە.
**هنالك**: ئەوێندەرێ، وەردێ، دەراهێ، لەوێندەرێ.
**هنة**: (ە) هێن، هەرامە، هێن و مێن.
**هنداز**: (ە) ئەندازە، ڕادە، وزە.
**هندباء**: کاسنی، گیایەکی خۆڕسکە لە قەراخ ئاو و کشتوکاڵاندا شین دەبێ، لکەکانی کورت و ریشەکانی ئەستوورن گوڵەکانیشی شینن، ڕەگوریشکەی لە پزیشکیتیدا بەکوڵاوی بەکار دەبرێت، تا بڕ و هێز دەری چیکڵدانەیە، ریشەکەی دوای وشک بوونی دەکوترێ وەکو قاوەی بەکاری دەبەن و بەلان تام و بۆنی وی نادات.
**هندام**: (ە) هەندام، ئەندام، بەلا، بەژن.
**الهندسة**: ئەندازە، هەندازە، ئەندازیاری.
**هنئ هنيئاً**: بێ ئازار بەگیان کەوتن، لە گیان خۆشهاتن.
**هنيئاً**: بێ ئازار بەگیانت خۆش بێ، نۆشی گیان بێ، ئەنۆش.
**هنيهة**: دانگا، تاوێکی، گاڤێکی، گاوێکی.
**ههنا**: ئەلێرە، ئەنیگە، ئەچێگە، ئەلڤێرێ، ئەڤێرا.
**هو**: ئەو، هەو، ئینە، وی، وەی، ئەزێج، ئیی. هەوە، ڕاناوی تاکە کەسێکی نێرینەی نەدیوە.
**هاهو**: هەوە، خۆیەتی، بگرە.
**هواء (ج) اهوية**: (ە) هەوا، چشتی بەتاڵ، بێندەر، با، سوو، کمژ، ئێوار.
**هوأع**: قورپ، قڵپە، هێڵنج.
**هوام**: زیندەواری ژەهردارە.
**هَوان**: نزمی، سووکی، پەستی.

**الهواية**: خولیا، مەڕاق.

**هوة**: کەندەڵان، کەند، کەنەڵان، مای، ماھ، هەڵدێر.

**هوة مجروفة**: زەندۆڵ.

**هؤلاء**: ئەمانە، ئەڤێتها.

**هود (ج) هائد**: جوو، جوولە، ئەو کەسەیە کە لە تاوان و گوناهان پەشیمان دەبنەوە.

**هودج (ج) هوادج**: کەژاوە، تەختی ڕەوان.

**الهوذة**: کوڕ کوڕ، کەت، قەتێ.

**هور**: زۆنگاو، زۆنگ، زونگاو. ئەستێر، ستێر، هەسێڵ، ئەستێرک.

**هوز**: ڕستەیەکە لە ڕستەکانی ئەبجەدی لە (هەوز).

**هَوَس**: (ە) هەوەس، ویست.

**هَوَس**: دیوانی، کەمهۆشن، گێژی، کاس.

**هَول (ج) اهوال**: ترس، سام، پەرژەنگ، جەفل، ساف.

**هون**: سانایی، ئاسانی، ساناهی، هێواش. ئاسوودەیی، ئاشتیی، ئارامی، هەداری.

**هون**: ئاوونگ، هاوونگ.

**هوي**: دڵداری، هۆک، کەڵکەڵە، سەودا، هەوا، سەوا، سۆز، خولیا، حەز، هەوەس.

**هويّ**: زرینگانەوەی گوێچکە.

**هوية**: ناسنامە، ڕەچەڵەکی چشتی پێناس.

**هوينة**: وار وارە، لەسەرەخۆ، هێواش، یەواش، هێدی هێدی.

**هي**: ئەو، ئەواها، ئەوێ، وەی، وێ (ڕاناوی یەکێکی مێیینەی نەدیوە).

**هَيء**: بڕوانە اسرع.

**هَيء**: (بۆ سەرسووڕمانێ) (ە) ئەیهۆ، هەیهۆ، حەو، هەی، هەی، هەو.

**هيءِ هيءِ**: (ە) هەیهەی.

**هيأ**: بڕوانە تهيئه.

– **مهيأ**: ساز، ئامادە، ئەیڤەز، بەرجەنگ، بەردەست، پوختە، گلاڵە، گەلاڵە، بەسەروبەر، دروست، چمک، دەبار، دەردەست.

**هيّأ**: زووبە، تاڵووکە بکە، تەڕدەست بە.

**هيا**: (لە میهرەبانییەوە) دادەی، ئادەی.

**هيا**: (بۆ بانگ کردنێ) ها، هۆی.

**هِياج**: شەڕ هەڵایساندن.

**هيّاج**: بەد وێژ، زمان پیس، بەد گۆ.

**هياج**: تاودان.

**هيام**: سەوداسەری، ئەودالی، خولیایی، سەودا، هەڵوەرا بوون.

**هيئة (ج) هيئات**: پەیکەر، قەلافەت، چارە، ڕواڵەت، دیمەن، شێوە، قەبارە، قورم، فەسال، چۆنیەتی، شکلی شتی، سەروسەکوت. بتۆم، کۆمەڵە، دەستە، جووم.

**هيبة**: سام، ساف، ترس، رهوو، زەبروزەنگ.

– **ذو هيبة**: سامدار، بەسام، پڕسام، بەساف، بەدیمەن.

– **مهابة**: ترس، ساف، سام.

– **مهيب**: بەسام، سامدار، پڕسام، بەترس، بلیمەت، سامناک.

**هَيت**: جوولان، بزووتن.

**هَيثم**: جوجکەی هەڵۆ و سیسارکە کەچەڵەیە.

**هيجاء**: بڕوانە حرب.

**هيجان**: شەڕ هەڵاییساندن، شلووقیان، شۆڕش، ئاژاوە، جووڵان، پشێوی، خرۆش خرۆشین، خروشان، خرۆشیان، دڵگەرمی، فرتەنە.

– **مهيّج**: هاندەر، تووڕێنەرەوە.

**هَيد**: ناساز، سەخڵەت، ترساندن، ئازاردان، جووڵاندن.

**هيدان**: مرۆی ترسەنۆک.

**هيدروجين**: هیدرۆژین، هایدرۆجین.

**هير**: بای ڕۆژهەڵاتی.

**هَيري**: گوڵی شەوبۆ، گوڵی هەمیشە بەهار.

**هيشر**: قانگەلاشک.

**هيضة**: ئاهۆ، ڕشانەوە، چاوقووڵکە، چاوەقووڵە، سکەشۆرە، زگەشۆرە.

**هَيطل (ج) هياطلة**: ریوی، رووس، نێوی یەکێکییە لە نەتەوە زەردپێستەکان.

**هيف**: ڕەشەبا، سەبوون، ورە، هوڕڕە.

**هيكل (ج) هياكل**: (ە) قەلافەت، نیگار، هەیکەل، پەیکەر، قورم، ڕواڵەت، کۆتەڵ، ڕەنگوروو. وێنە، نیگار.

**هيمان**: تینووی سەودا و ئەڤێنی.

**هيهات**: دوورە، ئای چەندە دوورە، ئەیهۆ، هەیهۆ، هەیهۆ، هەیهۆ هەیهو.

**هيولاء**: قەلافەت، کەلافەت، سەکوت، تەشک. کەرەستەی بەراییە.

# و

**و**: پیتی بیست و حەوتەمینی ئابێتی عەرەبییە.

**و**: وە، (W,U) ئامرازی وێکخستنە بۆ لێک نزیک کردنەوەی دوو وشە یا دوو ڕستان بەکار دەبرێن.

**وا (ە)**: وا، وای، ئەیوای، ئەیواه، ئاخ، ئای، ئۆه، ئەی، ئۆف، ئۆ، هاوار، هاوار هاوار، هاوار و بانگ. (بۆ هاوار و دادە).

**وابر**: کولکن.

**وابل**: بارانەی تنۆکە گەورەیە، تاڤی، خوڕڕەمە بارانە، ڕەهێڵە، ڕهێڵ، ڕەهێڵەبارانە، لێزمە، شەس، شەستەبارانە.

**واثب**: هەڵبەز، هەڵبەزەوە.

**واثق**: بڕواکار، باوەڕکار، قایم، دڵنیاکار.

**واجب (ج) واجبات**: پێویست، گەرەک، تار، مقام، دبووک، ئەرک، فەرمان، هەرک.

**واجب الوجود**: ئەو کەسەیە کە هیچ جۆرە پێداویستییەکی بەکەسێکی ترەوە نییە کە بریتییە لە خودا، یەزدان، توانا، دەستکەوتوو، دەوڵەمەند.

**واجهه مواجهةً**: دیتن، ڕووبەڕوو بوون، یەکتر دیتن.

**واحة**: مێرگ، ئاوایی گچکەیە لە چۆڵی.

**واحد (م) واحدة**: یەک، یێک، ئێک، یوو – وە، هێک.

**واحداً**: یەکێ، یەکێک.

**وأد**: زیندە بەچاڵ، زیندە بەگۆڕ، زینگە بەچاڵ.

**وادق**: بەفاڵ.

**وادي (ج) أودية**: دەرەوەن، شیو، دۆڵ، دەرە، نهال، گەروو، گووهۆر، دۆپ، دەربەند، نەقاب، گلال، گەری، گەلی، قەم، شیڤ، کوندڕ.

**وارث (ج) وراث وورثة**: خوێنگر، شەڕکەر، شوێنگر، خوێنەخوا، خوێنەخوێ، بەشبەر، پاشماک گر، خاوەند کەلەپوور، میراتگر.

**وارد**: هاتوو، گەیشتوو، گەییوو، نزاو، وەرگرتە.

**واردات**: داهات، دەرامەت، هەجەل.

**وارع**: بڕوانە (زاهد).

**وازنه موازنةً**: بەراوردکردن، پێک کێشان، پێک گرتن، جووتەنی، تەریب کردن، بەیەکتری گرتن.

**واسط**: نێونجی، کەسێکە لە نێوەڕاستێدا دانیشێ، ناوجیگەر.

**واسطة (ج) وسائط**: هۆ، بۆنە، ناوەندی، کۆستەکی، بەرەوان، ڕوو، مایە، ناڤبەر، دەستاوێژ، ئێوەر، سادار، سەبارەت.

**- بواسطة**: بەهۆی، بەبۆنەی، لەو، لەوڕا، ژوویی.

**واسع**: بەدەرەتان، گوشاد، فراوان، دەرەتان، بەروەدەر، پانوپۆڕ، بەر بەرەلا، وراق، پان، ڕاهی، فرە، فلت.

**الواشي، واشي**: قسەچن.

**واصف**: هەڵنەر، پێ هەڵگۆ.

**واصل**: گەیشتوو، گەییوو، پەیوەست بوو، نزاو.

**- مواصل**: هاتووچۆکار، سەر لێ دەر.

**- مواصلة**: پێکگەیشتن، وێکهاتن، هاموشۆ، هاتووچۆ، پێداهاتن، گەیشتنە یەکتری، وێکهاتنەوە.

**واضح**: ئاشکرا، دیار، پەیدا، خویا، خووانی، ئافتاوی، شتیار، ڕەوشەن، ڕوون، ڕووناک، بێ پەردە.

**واضع**: زاو، زاگ، زاییگ، زێسان، زەیستان.

**واضع**: دانەر، ڕۆنەر.

**واطئ**: نزم، نەوی، نشێو.

**واظب مواظبة**: لێ خەفتان، ئاگاداری کردن، لەسەر ڕۆیشتن، پایەداری، لەسەر ڕۆیین، نەتراندن.

**واعظ (ج) وعّاظ**: مۆچکار، پێودەر، مۆچیار، مۆژیار، پەند دادەر، ئامۆژگار.

**واعده مواعدةً**: پەیمان پێکدان.

**واعي**: هۆشیار، تێگەیشتوو.

**وافد**: هاتوو، گەیشتوو.

**وافٍ**: تەواو، ڕەبەق، تەف، بەس. تێرا، تێچن.

**وافر**: زۆر، گەلێک، فراوان.

**الوافرة**: دووگ، بەز.
**واڤق موافقة**: سازگاربوون، ڕێککەوتن، لووان، پێکهاتن، دەستدان، سازگاری، قۆڵ کێشان.
- **موافق**: هاودەنگ، هاوڕا، ساز، سازگار، لەبار، بەدڵ، ڕا لێ، یەکدەست.
- **غیر موافق**: ناساز، بێکێس، ناقۆڵا.
- **موافقة**: سازگاری، هاوڕایی، هاودەنگی، ڕا لێ بوون، قۆڵ کێشان.

**واق، واقي**: باڵندەییێکە وەمراوی دەچێ و لە کەنار ئاوان دەژی، ڕەنگی بۆرێکی مەیلەو ڕەشە چەند پەڕی بەرزی سپی وەکو تاجی هەیە ڕەنگە ماسیگرە بێ، چونکە ماسی دەخوا دەنگەکەی وە (واق واق) دەچێ.
**واقع**: کەوتوو، کەفتوو، کەتی، پێ لەجێ دامەزراو، بنچینەی کار، ڕووداوی هاتووە خوار.
**واقعة (ج) وقائع**: هەنگامە، ڕووداو، بەسەرهات، سەرێتهاتی.
**واقعي**: ڕاسی، ڕاستی، ڕاستییەکەی.
**واقف**: وێستاو، ڕاوەستاو، وەستاو، وێساو. زانا، ئاگادار. کەسێکە هەندێک یا هەموو سامانی خۆی پێشکەش بەتەکیە، خانەقا و یا مزگەوتان بکات.
**واقي**: خۆپارێز.
**وإلاّ**: ئانگۆ، دەنا، ئانە، ئانی، ئەگەر نا، وەگەرنە.
**واله**: شێفتە، سەرگەردان، سەوداسەر.
**والد (ج) والدون**: بڕوانە اب.
**والدان**: دایک و باب.
**والدة (ج) والدات**: بڕوانە (أم (ج) امهات).
**والدة**: زاو.
**والدين، والدان**: دایک و باب.
**والي (ج) ولاة**: سەردار، فەرمانبەر.
**وئام**: ئاشتی.
**وامق**: دۆست، گراو، یار، سەوداسەر، ناوی یاری عەذرایە و داستانی دووروودرێژە.
**وامي**: قەرزدار، داماو.
**واه (ە)**: هەیرۆ، ئاه، واه.
**واهاً**: لەکاتی سەرسوورمانێدا بەکار دەبرێ، ئاها، هاها.
**واهب**: بەخشندە.
- **موهوب**: پێ بەخشراو، بەهرەمەند، بەهرەوەر.

**واهمة**: دردۆنگی، کۆ، هەراسە، هەستی دڵ بۆچوون.
**واهن**: شلوشۆڵ، چرووک.
**واهي**: سست، بێ بونیان، ناقایم، ئێرەتی، حامی چرووک.

**وباء (ج) أوبئة**: (ە) وەبا، ئازار، ئاهۆ، قڕان، درم، درمانە، ڕشانەوە، نەخۆشییەکی ترسناک و کوژندەی گشتییە، گۆ یا نیشانەکانی: میز گیران، زۆر سەرما بوون، زۆر تینوو بوون، دەنگ نووسان، پێست وشک بوون، چاو قووڵ بوون و ڕشانەوەیە.
**وبائي**: درمی.
**الوبال**: (ە) ئازوباز، سەختی، ئازار، خراپەی دوایی.
**وَبَر (ج) اوبار**: کوڵکی وشتر و کەروێشک و ئیتر.
**وبيل**: سەخت، دژوار، کاروباری گران.
**وتّار**: ژێساز.
**وتد (ج) اوتاد**: سنگ، گولمیخ، کوولا، پێگۆزەک، سنگک، پێسیر، بەر، پزی، کەلەمۆک.
**وتر (ج) اوتار**: ژێی کەوانی کارگەچی و تیر و ئیدیکەیە، ژێ. دەمار، ڕەگ، ڕە.
**وتر هندسي**: تیرە.
**الوتر الرفيع**: داف، داو، هەودا.
**وِتر ووتر**: تەنها، تاف، تاک.
**وتيرة**: ڕێگا، ڕەووش.
**وتين**: ڕەگی دڵ.
**وثاب**: تەختی نووستنێ، نووسن.
**وُثاب**: هەڵمەت بەر، هەڵمەتدەر.
**وثاق**: بەند، ڕستە، بەن و یا پەتێکە مرۆی پێ ببەسترێ.
**وثب**: بلندبوون، قەچنقاندن. بازدان، هلپەهێن. پەڕین.
**وثبان**: قوتە قوت.
**وثبة**: پڕدان، خۆ هەڵدان، ڕاپەڕین، هەڵمەت، شۆڕش. قەڵەمباز، کومەتە، وزاق.
**وثن (ج) اوثان**: بوت، پوت.
**وثني**: بوتپەرست.
**الوثنية**: بوتپەرستی، بوتپەرسێتی.
**وثوب**: دەرچوون، چوونەدەر، دەرپەڕین، جوولان، وەزین، هەڵبەزینەوە. بەڕۆژ بەسەر دادان، پەلامار بردنەسەر لە ڕۆژێدا.
**وثوق**: بڕوانە (اعتبار).
**ميثاق**: بەلێن، پەیمان.
**وثيق**: قایم، مەحکەم، پکێت.
**وثيقة (ج) وثائق**: بڕوانامە، بەڤانامە، باوەڕنامە، گرێوێکە کە جێگای دڵنیایی و باوەڕی بێ، ئەوەیە کە بایەخی پێ بدرێ و پشتی پێ ببەسترێ.
**وثيمة**: شەغرە.
**وجاء**: جێگای کەمتیار، ئارامگەی کەمتیار.

**وجاهاً:** ڕووبەڕوو.

**وجاهة:** ماقووڵی، بەڕوویی، جوامێری، جوانمەردی، پایە، ڕێز، قەدر، جووانی.

**وجب وجوباً:** گەرەک بوون، پێویست بوون.

**- موجب:** هۆ، بۆنە، گەرەک، پێ.

**وجبة (ج) وجبات:** جار، چەل، هەل.

**وجد:** شەوق، چەژە، خۆشی، سەودا، ئەڤینی.

**وجد وجداً ووجوداً:** دەست کەوتن، وەدەست هێنان، دۆزینەوە، پەیداکردن، تووشهاتن.

**وجِد:** بوون، بێن.

**وجدان:** دڵ و دەروون، هۆڵمان، دڵ هەڵگرتن، دەروون، نفس و هێزی دەروونی، هێزی ژوورەوەیە کە چاکە و خراپەی پێ لێک جوایەز دەکرێتەوە. دۆزینەوە.

**وجداني (ج) وجدانيات:** دەروونی، دڵ هەڵگرتن، ئەوەیە کە دڵ هەڵیگرێ، ئەوەیە کە هێزی دڵ و دەروون بیدۆزێتەوە.

**وجدة، وجدان:** دۆزینەوە، پەیداکردن، دیتنەوە.

**وجز وجزاً:** کورت کردنەوە، کەمکردنەوە، قوڵ کردنەوە.

**- موجَز:** کورت کراوەوە، قوڵە کراوەوە.

**- موجِز:** قوڵە و کورتکردنەوە.

**وجس:** دەنگی هێدی. دڵەکوتێ، دڵبووردنەوە.

**وجع (ج) اوجاع:** ژان، ئێش، ژووار، ئازار، هەو، سۆ، کزە، کزرە، کولی.

**وَجَل:** ترس، هەراس.

**وجنة (ج) وجنات:** کولمە، گۆنا، ئەلیک.

**وجه (ج) وجوه:** ڕوو، دیار، ڕووچ، ڕوخسار، ڕووچک، بەر، پەیکەر، پل، چڕ، چروچاو، چرووچەم، دەموچاو، دێم، دیدار، دیم، دیما، دیمەن، ڕووچک، سەروچاو، دیمە، ڕەنگوڕوو، چارە، شێوە.

**وجه:** ڕێگا، ڕێ، لا، ئارەزوو.

**لوجه الله:** لەڕێگای خودایدا.

**وجه:** ڕوو، ڕووکاری چشتی، لا، کن.

**وجّه:** ڕووتێکردن.

**وجهاً لوجه:** ڕووبەڕوو.

**وجهة:** لایەن، تەنیشت، ئەوەیە کە ڕوو لەو بکرێت.

**وجوب:** پێویست و گەرەک بوون، تار، مقام، ناچاری.

**وجود:** بوون، بێن، بیێن، هەسی بوویێن، پەیدابوون، سۆراخ، گومان، نوونگ.

**وجيئة:** چێشتێکە لە خورما و کوللەی کوتراو دروست دەکرێ.

**وجيز، وجيزة:** کوڵە، قوڵە، کورت.

**وجيع:** دەردناک، ئێشدەر.

**وجيه (ج) وجهاء:** ڕوودار، بەڕوو، پایەبەرز، ڕیش سپی، بەدیمەن، بەڕێز، قەدرگران، ڕوو باش، ڕوو خۆش، خاوەند پایە.

**وجيهة:** کەیلان، ژنی جوان و خاوەند پایە.

**وح:** (هـ) وەحە، وەحە وەح، وەلە بۆ دەرکردنی ڕەشەوڵاخان بەکار دەبرێت.

**الوحام:** مەگیرانی، بێزوو.

**وحد:** تاک، تاق، تەنیا، تیق.

**وحدان:** یەکان.

**وحداني:** تاک و تەنیا.

**وحدانيّة:** تاکوتەنیایی، تەنیایەتی، تەنهایی، یەکێتی، باری تەنهایی.

**موحِّد:** کەسێکە باوەڕی بەتاک و تەنهایی خودای دەبێ.

**وحدة:** تاکی، سەڵتی، تەنهایی، تنانی، تەنایی، ئێکاتی، تاکە، یەکە، یەکێتی، بێ هەمپایی، یەکتایی، یەکتەنی، یەکیەتی، یەگانەگی. یەکە (کیمیا).

**وحدة الزمن:** یەکەی کات.

**وحدات:** یەکان.

**وحش (ج) وحوش:** کێوی، ناکەوی، ڕەمەکی، کۆڤی، هۆڤ، ڕووێڵ، ڕەوەگ، جانەوەری بیابانی.

**وحشة:** کێوێتی، هەڵەتاوی، ڕەمەکێتی. ترس، سام، سەهوو، دڵتەنگی.

**وحشي، يتوحش:** کێوی، ڕەمەکی، ڕەوەک، ڕووێڵ، سرگ، شاخی، کۆڤی، کووڤی، هۆڤ، نامۆ، ناهۆگر.

**وحل (ج) اوحال:** قوڕ، هەرگ، هەڕ، هەڕی، هەرگاو، کووڕ، لیتاو، گیل، هەرک، حەرگ.

**موحل، موحول:** باتلاغ، باتلاک، قوڕاوی.

**وحم (للمرأة):** مەگیرانی، بێزە، بێزوە.

**وحوحة (ە):** وەحەو وح بۆ ئاژۆتی و دەرکردنی ڕەشەوڵاخان بەکار دەبرێت.

**وحي وحياً:** بەسرتە ئاخەفتن. (اشارة) لێ کردن، کورتەژن. شاژن ناردنە لا.

**وحي:** دڵ لێدان، خرپە، سرووش، خورپەی دڵ، خورپیان، دڵەخورپێ، کورپە، دڵەتەپێ. وەڵام، نامە، دەڵێن ئەو فەرمایشانەیە کە لە لایەن خوداوە بۆ پێغەمبەران هاتووە.

**وحيد:** تاک، تاق، تاکانە، تاقانە، باد، بێ کەس، بێ هەمپا، تاق و تەنیا، تەراخ، تەک، سەڵتەزەلام، یەکانە، یەکانی، یەکتا، یەکتەن، یەک ڕەنک.

**وخامة:** سەختی، گرانباری ناسازگاری.

**وَخْش:** چشتی بێ سوود، مرۆی سووک، تەبەقی ڕەشەوڵاخان.

**وَخُم**: گـران، ناخـۆش، بۆگـەنی هەوا کـە مـایەی سـەرهەڵدانی نەخۆشیانی وەباییە.
**وخیم**: گران، قورس، ناخۆش، ناسازگا.
**وَد**: بوت.
**وُدّ وداداً ومودة**: خۆشویستن، دڵ بۆ چوون، نەڤین.
**وداد**: خۆشەویستی، دۆستایەتی، هەڤینی.
**وداع**: مالاوایی، ماڵـیاوایی، مالاڤایی، پنیۆس.
**وراق**: خاڵ (بۆ ئاژەڵان).
**وَدَج**: ڕەگی گـەردن، ڕەگی ملی مـرۆڤـانە کـە لەکـاتی ڕق ئەستووریدا هەڵداسێ.
**ودع**: کووژەکە، هاژێڵە، جۆرە سەدەفێکە.
**ودع یدع ودعاً**: مالاوایی خوازتن.
**ودعة (ج) ودعات**: شەیتانۆکە، قاقلۆکە، شەیتان، قاقلەجنۆکە، چەقچەقۆکە.
**ودقة**: باپشکێو، قنچکەسلاوە، سیچکەسلاوە.
**الودك**: دووگ، بەز.
**ودود**: خۆشەویست، مێرەوان، میهرەبان، دڵدەرەوە.
**ودید (ج) اوداد**: دۆست، یار، خۆشەویست.
**ودیعة (ج) ودائع**: سپاردە، ئەسپاردە، ئەسپەردە، سپەردە.
**ودیق**: بەفاڵ.
**ودیم**: قەلادە، قەلێتە، بڕوانە (طوف).
**وذح**: کەمێڵە.
**وذیلة**: ئاوێنە. پارچە زێوێکی مشتوماڵ دراوە.
**وراء**: پشت، دوا، دوایە، پشتەوە، لای پشتەوە. پاش، دوای، پاشان، وایتر، منداڵی منداڵ. جگە، بێجگە.
**وراثة**: شرەگری، خوێنگری، میرات گرتن.
**وراثی**: کەلەپووری.
**وراد**: گوڵکار.
**وراق**: قاقەزفرۆش، نووسەر، پەڕتووک، نووسەوە.
**ورد (ج) ورود**: گـوڵی گـولاوێ، گـوڵەباخ، دارە گـوڵی گـولاوێ، گوڵی ئاڤێ، گوڵەڕەز.ە
**ورد الرجّال**: گێلاخە (گیایەکە).
**وِرد (ج) اوراد**: یادی خوداکردن، پاڕانەوە، هەمیشە بەشێک لە قورئان خوێندن.
**وردي**: گـوڵی، ڕەنگی گـوڵی، گـوڵڕەنگ، گـولک، پەنبـەیی، پەمەیی.
**ورس**: گـیـایەکـە زۆرتر لە یەمـەنێ دەڕوێ و چـشـتی پێ ڕەنگ دەکرێ.
**ورشان**: کۆترەباریکە، قومری.
**ورطة**: گەرداو، گێژاو، گۆنگەڵ، گێژەن، گەڕ، هاڵ، نەگبەتی، نشووڤ، باتلاغ، باتلاک، جێگای تێداچوون و نەمان.

**ورع**: بڕوانە (تقوی).
**ورق (ج) اوراق**: قاقەز، کاغەز، تیانووس. پەڕ، پەڕە.
**ورقاء**: ترێنە، ترێنکە، کۆتری سووز، کۆترە باریکە.
**ورك (ج) اوراك**: سـمت، فـاڵچـە، کـولۆک، کـلـۆت، کلۆک، منێک، وڵمە، کەفەڵ.
**ورل (ج) اورال**: مارخۆرە، دولقەدەرە، قۆڕی، مارخۆر.
**ورم (ج) اورام**: ئاماس، ئاوساوی، پۆرگ، ماسین.
**وروار**: مێشوولەخۆرە.
**ورود**: گەیشتن، پێ گەیشتن، بۆ هاتن، گەهیشتن، گەیین، گەیین بەرەو.
– **مورد (ج) موارد**: سەرچاوە، بنیات، بنیان. جێگای گەیشتن.
**ورید (ج) اوردة**: ڕەگی گەردن، شاڕەگ، ڕەگی گەورە، ڕەگی مل، شادەمار.
**وز (م) وزة (ج) وزات**: قاز (باڵندە).
**وزارة**: شالیـارگە، شالیاری، پایەی وەزیری، وەزیرپایە، وەزیری، وەزارەت.
**وَزّان**: بکێش، بەتەرازوو کێش.
**وزان**: هاونێڵە.
**وزانة**: قورس، گرانی.
**وزر (ج) أوزار**: بڕوانە (إثم)
**وَزَر**: کێوی بلند، پەنا، پەناگاه.
**وزّع**: بڕوانە (توزیع).
**وزغ (ج) اوزاغ**: سەرمازەڵە، پیسپیسۆک، پیسپیسک، کمکە.
**وزغة**: میز میزک.
**وزن (ج) أوزان**: کـێش، کێشـانە، سـەنگ، گرانایی، ڤـەکێش، بەردکێش، دەمهەڤری.
**وزن وزناً**: کێشان، کێشیای، سەنگاندن.
**الوزن النوعي**: کێشانەی تایبەتی، کێشەخۆ.
**وزنة**: بەردی تەرازوو، ئاسنێکە وەرزشکاران وەرزشی پێ دەکەن.
**الوزن الهجائي**: کێشی حینجەیی، کێشی حونجەیی.
**وزیر (ج) وزراء**: وەزیر، شالیار.
**وزین**: گران، قورس.
**وسائل الایضاح**: هۆیەکانی ڕوونکردنەوە.
**وسادة (ج) وسادات**: بڕوانە مخدە.
**وساطة**: ناوەندیاری، نەڤچیتی.
**وسام (ج) اوسمة**: دروشم، نیشان، نیشانەی سەرقۆڵ و شان.
**وَسَخ (ج) اوساخ**: چڵک، چرک، قـرێژ، کرێژ، کرێژک، کرێش، زیرگ.
**وِسخ**: چڵـکن، چەپەڵ، پیس، پیسـۆ، پیسـکۆ، پیسـوپەڵۆس، پیسوپەڵۆخ.

**وَسَط**: نێـو، نێـوان، ناوەند، نێـوەڕاست، جـەنگە، ناوەڕاست، هاوتێ، جەرگە، دووتووان، کرۆک، نیمچە، میـانە، ناوپارە، ناووگ، ناوچە، ناوگەرە، نێوەند.

**- اوساط**: ناوەندەکان.

**الوسطى**: قـامکی نێوەڕاستییە، تلیا ناڤین، تلیا ناوچار، تیلا ناوەندێ، زەڕنەقـوتە، هەڵـمـەقـووت، ناڤـچـار، نێـوەک، ناوونجی، پەنجەی بالابەرزە.

**وسـعـة**: فـراوانی، گـوشـادی، دەرەتان، فـرەوانی، گـوشـایش توانایی، دەوڵەمەندی.

**وسق (ج) أوساق**: باری وشتر کە بەئەندازەی ٦٠ کەویژە.

**الوسم**: نیشانە، داغ، نیشان دیاری، دروشم.

**وسم وسماً**: نیشانکردن، داغکردن.

**وسمة ووسـمـة**: گـیایەکە گـەلایەکـانی وەهی مـووردی دەچێ کە گـەیشت ڕەش دەبێ و بۆ خـەنە بەکـار دەبرێت بۆ برۆ و شـوێنی تر.

**وَسَن (ج) أوسان**: نیاز، ئاتاجی.

**وسنة**: بڕوانە (نُعاس).

**وسواس (ج) وساوس**: دوودڵی، نیگەرانی، خیالاتی پڕووپووچ، ئەندێشەی خراپ بەدڵدا تێپەڕێ.

**وسوس وسوسةً**: دوودڵ و نیگەران بوون.

**وسوسة**: وژارە، واتەویرە.

**وسيط**: نێـوبژیکار، کـۆسـتـەک، ناڤـبـێـنجی، پێناو، ناوەندیار، ناوجێگەر، نێوەندیار.

**وسيع**: گوشاد، فراوان، پێش ئاوەڵە، بەربەرەڵا، فرە، بەرگوشاد، بالۆیاڵ، بەرف کری، پڕ، بەربلاو، پانوپۆڕ، فتوفراوان، فلق.

**وسيلة (ج) وسـائل**: هۆ، بۆنە، دەسـتـاویژ، گـەزەک، نیـزیکی، سفن، نێوەر، ئەوەیە کە بەهۆی وییەوە بەندیواری و نزیکی لە نێوانی دوو یا چەند کەس و نێردا پەیدا دەکات.

**وسيم (ج) وسـماء**: جوانڕۆ، دلڕفێن.

**وشاح**: بەرموور، حەمایەڵ، ئەوەی کە لە شان دەکرێت.

**وِشاية**: زمان لێدان.

**وَشق**: (ە) وشـەک، کـوڕەبەشـە، قـوڕبەشک، کـوڕی بەچک. هووشاک.

**وشك**: پەلە.

**وشم (ج) وشوم**: دەقـاندن، دەقـدان، خـاڵکوتان لەسـەر پـیـسـتی لەش، دروشم، نیشـانەی ئاژەلانە.

**وشنة**: ئالووبالوو، بەلالووک.

**وشوشة**: چپە، چپاندن.

**وشي**: نەخش و نیگاری کراس.

**وشيج**: دارێکە لەنێـو چیـایاندا لەناو قـەڵەشتی بەرداندا شین دەبێ.

**وشيع**: بەردی ئاسک، تەختەبەرد.

**وشيعة الغزل**: کەلافە دەزوو، مەکارە، غەر غەرە.

**وشيمة**: شەڕوکێشە، دوژمنایەتی.

**وصاف**: هەڵزر، هەڵنێر، هەڵگۆ.

**وصـال**: پێکگەیشتن.

**وصاية**: پێ سپێری، ئامۆژگاری، ڕاسپاردن.

**وصعة**: گۆڕیەچنە، گۆڕەوی چنە، گۆڕیچنە (باڵندە).

**وصف (ج) اوصــاف**: هەڵگۆ، ئاکـار، پێ هەڵکوتن، وەسپ، هەڵگۆتن، خاسە، ستایش، ساخولەت، چوونە بەتانوپۆ داچوونە خوارەوە.

**وصف وصـفاً**: پێ هەڵگوتن، بەتەنا داچوونە خوارەوە، بەتانوپۆی جــوانی و چاکی و ئازایی، بەزەیی، دڵفــراوانی داچوونە خوارەوە، ساخولەتکردن.

**وصفة**: چارەنامە، (ڕەچێتە)، دەمبۆری.

**وصفي**: نیشانی، وەسپی، ساخولەنی.

**وصل**: دقناک، پەتە، دڤناک، پسوولە.

**وصل**: گەیشت، یاوا.

**وصلة**: پەیوەندی، پێکگەیشتن.

**- مَوصل**: گەیشتنگە.

**وصمة**: سستی لە لەشدا، کەموکوڕیی، شوورەیی.

**وصول**: گەیشـتن، گهان، گهاشتی، گهشتن، گهایی، گەهیشتی، لێ کەتن، پێگەیشتن، ڕاگەیین، ڕاگەیشتن، گەیین، ڕەسین.

**وصولات**: دقناک، دفنان، گرتنەک.

**- موصول**: پەیوەست، پێوەنووساو، گەیشتوو.

**وصي (ج) اوصـيـاء وموصى**: پێ ئەسـپـێـرراو، پێ سـپـێـر، سـەرپەرشت، بەخـێـوکـار، ڕەنێـو هێنەر، پێ ئەسـپـاردە، ڕاسپێرراو، سەرەوگرد.

**- مُوصِّي**: (ناوی بکەر) ڕاسپێر.

**- موصَّى**: ڕاسپێرراو.

وصية (ج) وصايا: ڕاسپاردە، سپاردە، ڕاسپێری، ئەسپاردە، ئەسپەردە، ڕانەسپاردە.

**وصيد**: دەرگا، ئاستانە، کێو.

**وصيف**: بڕوانە (خادم)، نۆکەر، ژێردەست، کارگەر، نگڵ.

**وصيفة**: کارەکەر، کلفەت، تەیان، دایەن، قـەرەواش، دەرماڵ، کەنیز، کەنیزەک، داێێن.

**وَضَر**: کەمیلە، ڕەقێنەر، ڕەقێلە، قرتاغەی برینان.

**الوضع (ج) اوضــاع**: دانان، ڕۆنان، دانیــان، دانین، چلۆنی، هەڵبــەسـتن، دانین، شـێــوە، شکڵ، بار، دۆخ، پاودان، سەروسەکەت، چۆنی، چۆنێتی، چلۆنی.

**- موضع (ج) مواضع**: جێ، جێگا، جاگە.

**- موضوع**: دانراو.

**وضعية**: چلۆنی، کتۆیی، چتۆیی، چلۆنێتی.

**وضن**: قەیاسە، نەوار.

**وضوء**: دەستنوێژ، دەستنمێژ، دەسمێژ.

**وضوح**: ئاشکرایی، شتیار، ڕووناکبوون.

**وضيع**: ناکەس، نزم.

**وطء**: پایە ماڵکردن، سواری ئەسپی بوون.

**وطاء**: ڕاییخ، ئەوەیە کە لەسەر ڕووی زەوی ڕادەخرێ.

**وطب**: کوندە، هەڵیز، خیگە.

**وطد وطداً**: قایم و ئەستوورکردن.

**وطن (ج) اوطان**: نیشتمان، زێد، مەڵوەند، مەڵبەند، نیشتنگە، دیار، بووم، ئوورت، بەروبووم، خاک، کەڵکۆ، مەڵبەن، مەڵوەن.

- **موطن (ج) مواطن**: بڕوانە وطن.

- **مواطن**: هاوولاتی، خۆجێیی، جەهزا، هەوشاری، هاوجێ، هاوزێ، هاوشاری، هاوکەوشەن، هەمشاری، خۆجەهـ، هاونیشتمانی، هاوزید.

- **متوطن**: نیشتەجێ.

**وطني**: نیشتمانپەرست، نیشتمانی، نیشتمانپەروەر، ولاتپارێز.

**وطنيّة**: خاکپەرستی، نیشتمانپەروەرێتی، ولاتپارێزی.

**المجلس الوطني**: ئەنجوومەنی نیشتمانی.

**الوعي الوطني**: وشیاربوونا نیشتمانی.

**وطواط**: چەکچەکیلە، شەمشەمەکوێرە، شەمشەمەکوێرە، چەکچەکۆلە، بارچمک.

**وظب وظوباً**: لەسەر کاروباران چڕ بوونەوە، لە ئەستۆی خۆگرتن.

**وظيفة (ج) وظائف**: هەرمان، کارداری، کارمەندی، جیرەخۆری، فەرمانبەری، فەرمان، مووچەخۆری، دلامەت کار و فەرمانێکە بەکەسێکی ئەسپاردرا بێ، بسپێرێ، پەسا.

- **موظّف**: کارمەند، کاردار، کاربەدەست، فەرمان پێدراو، فەرمانبەر، مووچەخۆر.

**وعاء (ج) اوعية**: قاپ، ئامان، دەفر، هیت، بادی، گەبۆل، گیر، بایە، لوولە. کیف.

**وعاء خزفي**: شاکاش، کاشی.

**الوعاء الدموي**: بۆڕی خوێن.

**وعاء يحلب فيه الحليب**: لابەرە، گادۆشە.

**وعث**: سەختەڕێگا، ڕێگای چەتوون، بەردەڵان.

**وعدة (ج) وعود**: بەڵێن، پەیمان، هەرێنی، هەرێ، ژووان، بڕیە، گوفت، گفت.

- **موعد (ج) مواعد**: ڕوانگە، خووەندی، پەیمانگە، کاتی پەیمان.

**وعر**: کەوور، کەوور، کەورک، ناهەموار، ناهەنجار، ڕێگای بەردەڵان و سەخت، ڕێگای چەتوون و سەخت.

**وعظ وموعظة**: مۆجیاری، ئامۆژگاری، کەهانەت، مۆژیاری، پێوەرە، پێودر، مووچاندن، مۆچ، تەمێ، پەیڤین، ئاخەفتن، ئاخۆتن.

**وعل (ج) وعلات**: فیلەگێجە، فیلەگێژە، نێریەکێوی، هەڤۆ، هەڤووری، ئاڤۆر، نەڤۆر، کەڵ، کەڵەکێوی. کەڵەناسک.

**وعواع**: وەڕە.

**وعي وعـياً**: ئاگاداری کردن، بەدڵ تێگەیشتن، کۆکردنەوە، پارازتن.

**وعي**: هووره، وشیاری، بێداری، ئاگاداری.

**وعيد**: ترساندن، پەیمانی خراپە و شەڕدان.

**وعير**: بڕوانە وعر.

**وغاء**: شەڕ، جەنگ، لەج.

**وغي**: دەنگوهاوار لە شەڕێدا.

**وفاء**: بەبنەت.

**وفاة (ج) وفيات**: مەرگ، ناکام، گل، گیاندان.

**وفاق**: هاوکاری، سازگاری.

**وفد (ج) وفود**: بتۆم، کۆمەڵە، زەڤان، چوون، دەستەوکۆمەڵە مرۆڤێکە بۆ شوێنێکی تایبەتی بنێردرێن بۆ ئەنجامدانی کارێک.

**وفر (ج) وفور، وفرة**: دەوڵەمەندی. زۆروزەوەندی، فرەیی.

**وفق وفقاً**: بەبەرژەوەند زانین.

**وَفق**: سازگاری بەرانبەری کردنی نێوانی دوو چشتان.

**وَفّق**: وەسەرکەوت، دەرچوو. پیرۆزی دەستکەوت.

**وِفق**: بەپێی، بەرانبەر، تێرا.

**وفور**: زۆری، گەلێک، فرەیی.

**وفي (ج) اوفياء**: ئەمەگدار، بەوەفا، دەڤ بگۆتن، بەئەمەگ، پێزان، کزری، ڕووسوور.

**وفير**: زۆر، گەلێک.

**وقاء**: بڕوانە (وقایە).

**وقائع**: ڕووداوان، کێشە و گێچەڵان.

**وقاحة**: بێ شەرمی، بێ ئابڕوویی، نخایی.

**وقاد**: دەستەچیلە، بن ئاگر، چاوئاگر، چاوڕەشکەنە، دەساوور، بەرچاوکە، چاوڕوونکە، دەسکەچیلە، ئاگرگیرە، دەستاگر، زۆر ڕووناک.

**وقّاد**: ئاگر زۆرهەڵکەر، زۆر ڕووناک.

**وقار**: هێمنی، گرانی، مەندی، مەندایی، لەسەرەخۆیی، سەنگینی، سەلاری، بەژمێری، ئابڕوومەندی، هێواشی، سەنگینی و گرانی.

- **موقّر**: سەنگین و گران، بەشێواز، بەژمێز، بەژمێز، بەژمێر، سەلار، سەنگین، سەنگین و گران، مەند، لەسەرخۆ، نارام، هێمن، گران.

**وقاية**: پارێزگاری، ئاگاداری، بەراوانی، پارێزگرتن، پارازاتن، گۆزاندن.

**وقب:** بڕوانە ثمد.

**وقت (ج) اوقـات:** کـات، وەخت، هەنگام، گـاڤ، پێل، تاو، چاخک، تاڤ، گـاو، بێن، سـا، سـات، کژ، گـا، گـاهو، دەم، چاخ، ژووم، سەقامات.

**- مـوقت:** دەمــدەمی، کـاتی، دەمــەکی، ســەردەمی، دەمی، جارەکی، کات دیاریکراو، سەرپێنی، سەرپێلکی.

**وقتي:** جـارەکی، کـاتی، دەمی، جـاری، چەلی، دەمـدەمی، وازی وازی، دەمینی، هشکەلی.

**وقح:** سەهندە، شەپاڵ، ئاوەسۆ، بێ شەرم، چەقەسوو، دڕنە، بێ ڕوو، چەقــاوەســوو، چوخــتی، دڕ، ڕوو دامــاڵراو، ڕوو داماڵیاک، کووکە، بێ ئابڕوو، ڕوو هەڵماڵراو، بێ ئاوڕوو.

**وقد وقداً:** تروسکان، هەڵبوون.

**وقر:** سەنگین، گرانی.

**وقص:** مل شکان.

**وقع:** جێگای بڵند لە کێوان، پایەی بەرز.

**وقع:** زرم، زرمە، گرم، گرمە، ترپ، ترپە.

**وقع وقـوعـاً:** کـەتن، کـەوتن، کـەفتن، بەرببوونەوە، بەلاداهاتن، گلان، کووڕبوونەوە، تەکەربوون، پێڕاهاتن. ڕوودان، قەومان.

**وقف (ج) اوقـاف:** ڕاوەسـتــان، لەکـاتی ئاخـۆتنێـدا کـەمـێک ڕاوەسـتـان و دوایە دەست پێکردنەوە، چاوەدێری سـامـانێکە بەخێر بۆ مزگەوتان و یا بۆ هەژاران تەرخان کرا بێ.

**وقف وقفاً ووقوفاً:** بڕوانە (وقوف).

**موقف (ج) مواقف:** ڕاگیرگە، جێگای ڕاوەستانییە، هەڵوێست، لاگا.

**موقوف:** ڕاوەستراو، ڕاوەستێنراو، ڕاگیراو.

**وقفة:** جارەڕاوەستانێک، درەنگ، نیگەرانی.

**وقواق:** مرۆڤی زۆر بلێ، دەنگێکە.

**وقود:** دەسـتـەچیلە، سووتەمـەنی، ئازاڵە، بەرچاوگە، بن ئاگر، چاوئاگر، دەسکەچیلە، ئاگردوو، ئاووردوو، سووتەنی.

**وقور:** سەلار، گرانڕوو، لەسەرەخۆ، سەنگین و گران، ئابڕوومەند، بەشێوار، گران، ئارام.

**وقـوف:** ڕاوەسـتـان، وێسـتـان، وێسـان، مـدران، مـدرای، مـان، قەوێتی، ڕاوەستاوی. ئاگاداری، ئاییەنک، قەوێتی، زانین.

**وقوف:** حەپە، عەوعەوی سەگ.

**وَقِيّة:** کێشێکی تەرازوویە.

**وقيعة:** کارەسات، هەنگامە، ڕووداو.

**وکــــاء:** زارەوانە، زار بێـن، دەم بێـن، دەم بەسـت، دەم بەس، بەرەبێن.

**وکاف (ج) وکف:** کورتان، پاڵان، سەکار.

**وکالة:** جێدادی، نوێنەری، دەمڕاست، سـەرکاری، جێ نشین.

**وکر (ج) اوکار:** بڕوانە عش.

**وکز:** مست لێدان، سیخورمە لێدان.

**وکصق:** کەمەند.

**وکف:** بڕوانە (وکفة).

**وکفة:** دڵۆپە، تنۆکە، تکەی سەربانی، دڵۆپ، پەشک.

**وکَلَ توکیلاً:** کردنە نوێنەر، کار پێ ئەسپاردن.

**الوکن:** کولانە، کڕلێن، (ئێ باڵندانە)، هێلانە.

**وکیل (ج) وکلاء:** نوێنەر، دەمڕاست، جێگر، جێگیر، بنەگدار، بنکدار، جـاگر، جاگیر، جێدار، سەرکـار، شـانە، ئمینەکـار، یاریدەدەر، بریکار.

**ولاء:** دۆسـتـایەتی، ڕاسـتـێـتی، نێـزێکی، خزمـایەتی. ئازادی، پیرۆزی، سەرکەوتن، پادشایی.

**وَلاء وولاء:** سامان، پادشایی.

**ولادة:** زان، منداڵبوون، زایین، بوون، لەدایکبوون، زانی گیاندار، زەها.

**- ولادة البهائم في الموسم المناسب:** هلچی.

**- ولادة الکلب:** ترەکین، ترەکان.

**- محل الولادة:** زێد، زایینگە، جێگای لە دایکبوون، مەڵبەند.

**- المولدة:** مامان، بەزاچ.

**- اول مولود:** نۆبەرەی منداڵ، نۆبیشە، نۆزگە.

**ولاية (ج) ولايات:** ولات، دیار، مـحـاڵ، وەلات، ولـکە، ولگە. فەرمانڕەوایی، ئاستان، ولاتێکە والی تێدا دانیشێ.

**ولَج:** ڕێگای ئاوخێزجاران.

**ولَج:** بێچووی هەڵۆیە.

**ولَد:** زا، منداڵی بوو، باری دانا.

**ولد (ج) اولاد:** مـنـداڵ، مـناڵ، وەچە، لاو، لاڤـک، ڕۆڵـە، زا، زاک، زاگـە، زارۆ، زارۆڵە، بچـووک، کـۆرپە، زارۆک، ئایل، چێلی، بیچوو، بەچکە، وەچکە، سەحەل، جگەرگۆشە، لۆلە، وەند، (بۆ نێر و مێ).

**ولد الابن:** نەوە، کوڕەزا.

**ولد الاحفاء:** نەدیوە.

**ولد الاخ:** برازا، برازگ (کە نێر بێ یا مێ).

**ولد الزوج:** هێوەزا.

**ولد الاخت:** خوشکەزا، داڵەزا، (بۆ نێرینە و مێیینە).

**الولد البکر:** منداڵی نۆبەرە، نۆزگە.

**ولد البنت:** کچەزا، (کە کوڕ بێ یا کچ).

**ولد الجاموس:** پالاغ.

**ولد ذو ثلاث اعوام:** هێوەرە.

**ولد الحرام:** بڕوانە ولد الزناء.

**ولد الخال**: خالۆزا، لالۆزا، هالۆزا، پسخاڵ (کە نێرینە بێ یا مێیینە).
**ولد الخالة**: پوورزا، میمکزا، پلکزا، منداڵی خوشکی دایک.
**ولد الزناء**: بیژی، بێ باوک، زۆڵەک، بیژوو، بیژمۆتە، بیژمیلک، بیژیلک، زۆڵ، توخمەتخێڵ، توخمەحیز، قومەزە.
**ولد الزوج**: هەنەزا، ستوە، زڕ منداڵ (کە هی مێرد بێ) (جا کوڕ بێ یا کچ).
**ولد الزوجة**: زڕ منداڵ (کە هی ژنێ بێ) (جا کچ بێ یا کوڕ).
**ولد العمّ**: ئامۆزا، پسمام، مامۆزا، هاپۆزا (بۆ نێرینە و مێیینە).
**ولد العمّة**: پوورزا، پلکزا، کە منداڵی خوشکی باوک بێ.
**ولد الناقة**: دەیلاخ.
**- مدبّر الاولاد**: لەلەی منداڵان.
**- مولد**: زێد، زانگە، زادان.
**ولوج**: چوونە ژوور، کۆپیان، زگکەر، ئافرەتێکە زگان بکات.
**ولود**: بەرەوورزۆ، زەوۆک، زگکار، بزۆک، بەزاووزێ.
**ولولة**: هاوار و بانگ، زار زار، زارین، واوەیلا.
**الولع**: پەرۆش، دڵ پێوەبوون، خۆشەویستێ، قاڕنان.
**ولوغ**: خواردنی چێشت لەناو قاپاندا بەزمانێ و یا بەزمان قاپ و قاچاغ لستنەوەی سەگانە.
**ولي**: دۆست، پارێزگار، یاریکار، جێگیر، یارمەتیدەر، سەرپەرشت. خواپەرست، دۆستی خودا.
**ولي الامر**: کاربەدەست، سەرپەرشت.
**- متولي**: سەرکار.
**- مولي**: سەردار، سەروەر.
**وليخة**: دەڵەمەی شیری.
**وليد**: لە دایک بوو، بێچوو، بەپەڵە، بیبیلە، زا، زاو، زادە، زاگ، زاگە، منداڵ، بەچکە، ڕۆڵە، زەو، زاوزۆ، بەچ.
**وليدة البيت**: خانەزا.
**ولي العهد**: میرزا، میرزادە، شازادە، جێ نشینی میری، پشتەخت.
**وليمة (ج) ولائم**: میواندارێکە بەبۆنەی جەژن و شادمانی بووک هێنانی، منداڵبوون و یا خانووبەرە دروست کرد بێ ئەنجام دەدرێت.
**وهّاب**: زۆر بەخشندە.
**وهابي**: چەشنە بیروباوەڕێکە لە عەرەبستانی سعودیدا بەپێی تێگەیشتنی خۆیان بەفەرمانەکانی سیپارەی (قورئان)ی ڕەفتار دەکەن و پشتیان لە گەلێک بیروباوەڕیانی موسڵمانان کردووە، لەسەر گۆڕان خانوو دروست کردن و یا دیدەنی (زیارەتی) گۆڕان بەگەندو خراو دەزانن.
**وهّاج**: تروسکەدار، ورشەدار، درەوشەر، رووناک، ڕۆشن، گەش.

**وهَبَ وهباً وهبةً**: بەخشین، وەشکردن، بوورین، خۆشبوون.
**موهبة (ج) مواهب**: بڕوانە (هبة)، بەهرە، بەهرەمەندی، بەهرەوەری.
**- موهوب**: بەبەهرە، بەهرەوەر، بەهرەمەند.
**وهبي**: خوداداد، خودا پێداو.
**وهدة (ج) وهاد**: جێگای نزم و نەوی، پەل، هەردە، شوێنی بڵند و نزم و بەکۆسپە.
**وهران**: ترساو.
**وهرة**: لە کارێکی وا دەچوون کە تێدا ڕزگار بوونی نەبێ.
**وهس**: بڕوانە دعس.
**وهق**: کەمەن، کەمەند.
**- الجاذب بالوهق**: کەمانکێش.
**وهل**: ترسێن، ترسناک.
**وهلة**: سەرەتای کار، سەرەتای فەرمان. ترس.
**وهم (ج) اوهام**: هولۆلی، بیر، بیری پووچ، پیرەبووک، پیرهەڤۆک، دڕدۆنگی، گومان.
**وهمي**: نەدیو، چشتی پرووپووچ.
**وهن**: سستی، خاوی.
**وهوهة**: ئاڵاندن، نسکاندن، نسکە، نسکە نسک. دەنگی گەرووی ئەسپییە دوای حیلاندنی نسکە نسکی سەگی لە ترسان، لووشە لووشی نێرەکەر لەکاتی نزیک بوونەوەی لە ماکەر.
**وي**: ئای، ئەیرۆ، ئایرۆ، ئەیەرۆ، وای، ئۆی، واهـ، ئەی قەدکەسێ، های، وەی، هەیرۆ.
**وَيَّج**: نیری جووتی.
**ويح**: ئای، ئایرۆ.
**وَيس**: هەژاری، وەکو (ويح) وایە.
**وَيحك**: وشەیێکە لەکاتی پێ هەڵکوتن و یا سەرسووڕماندا دەیڵێن.
**ويل**: داد، ڕۆ ڕۆ، هاوار، ئای، ڕۆ، ئامان، چریکە، قیژە، کەسێ، وادو، ئەی قەدکەسێ، هاوارو داد، هاوار هاوار، هەرا، لەناو چوون، پێگەیشتنی شەڕ، دادوفوغان، ئەیرۆ، ئایرۆ، شیوەن، گریان، وەی.
**ويلة**: بڕوانە بلاء.
**ويلل**: ئای، وای، ئایرۆ، ئەیەرۆ، ئەیرۆ.
**ويم**: وەیرۆ، هەیرۆ، بڕوانە واه واهاً.
**وَيمة**: بوختان، قسەچێن.

# ي

**ي**: پیتی بیست و هەشتەمینی ئابێی عەرەبییە.

**ي، م، ي**: ڕاناوی کەسی یەکەمە (ئاخەفتەر) وەکو: کتابي = پەرتووکی من. بۆ کەسی دووەمی مێیینەش بەکار دەبرێت بۆ تاک وەکو: قومي: هەستە، إجلسي: دانیشە.

**يا**: ئامرازی بانگ کردنە لە دوور و نزیکەوە ئەرێ، هۆ، هۆی، هێی، نۆی، ئۆ، ها، هاو هاو، ها هاو، ها ها، ئەی.

**يائس، مأيوس**: بێ هێڤی، ناهومێد، بێ هێڤی، بێ هیوا، هەناسەسارد، پەپووک، ناکام.

**يابس**: ڕەق، برنگ، زڕ، ویشک، وشک، نیشک، هیشک، ڕق ڕقۆک، قەرادە، قاقا.

**يابسة**: وشکانی.

**يا ترى**: بڕوانە وشەی (هل).

**يأجوج ومأجوج**: داعبایەکی ئەفسانەیی کورتەبالای وەکو مرۆ وایە، نەتەوەی مەغوولانە.

**يأس**: تەراسـان، دانکەندن، هیـوا براوی، هیـوا بڕین، ناهومێدی، هێڤیتی، کەوەڕێیی، سەر لە بەردی دان، بێ هیوێتی، نەومید، هەڵپەل، هەناسە سارد، بێ هێڤی، هیوا بڕان. لە زگ وەستانەوە.

**ياسر (ج) أيسار**: ئاسان، چەپ، چەپە، قوماریاز، دابەشکاری گۆشتی وشتری قومارێ.

**ياسمين (ه)**: یاسەمەنە مەران، دار و گوڵی یاسەمەند.

**يافع**: تازەپێگەیشتوو، نەودەم، گەنج.

**يافوخ**: شلکەی سەرییە، شنک.

**ياقة**: (ه) ئێخە، ئیقە، بەرچێڵە، بەرۆک.

**ياقوت (ج) يواقيت (ه)**: پاگەنە، یاقووت، ئاقوو، ئاقووت، پاگەند، یەکێکە لە بەردە هەرە نرخدارەکان کە لە کانان دەردەخرێت، ڕەنگی سوور و زەرد و شین و سەوز و سپی هەیە، جۆرە سوورە تروسکدارەکانی وی لە ئەڵماسی نەبێ لە هەموو جۆرە بەردێکی تر نرخدارترە.

**اليافوخ**: فریشک، مرخەک. لەکاتی ئاوات و نارەزوودا دەگوترێ.

**يانسون**: بڕوانە أنيسون.

**يا نصيب**: بەخت و نێوچاوان، خۆزبەخت، ئای بەخت، هۆی بەخت.

**يباب**: کاولوویران.

**يبس يبساً**: وشکبوون.

**يبوسة**: وشکێتی، وشکی، وشکانی، ساردی، نیشکەبەند.

**يبوسة ماينهما**: ساردی نێوانی، لێک ترازان.

**يتوع**: خوژیلک (ڕووەکە)، گیایەکە لق و قەدی وی شیری هەبێ.

**يتيم (م) يتيمة (ج) أيتام**: (ه) هەتیوو، سێوێ، ول، هێتیبوو، بێ باوان، بێ دایک، بێ باب، بێ دایک و باب.

**اليتيم من الاب**: پشت باڤی.

**اليتيم من الأم**: سێوێ، سێویی.

**ميتم، دار الايتام**: هەتیوخانە.

**يثرب**: نێوی پێشووی شاری (مەدینە)یە لەپێش ئەوەدا کە پێغەمبەر (د) لە مەککە بچێتە ئەوێ.

**يجب**: گەرەکە، دەبێ، گەرێ، مشێو، دەوێت، دەوێ، دێ.

**يحتمل، محتمل**: بەچکەم، بەشکم، بەشقم، ڕەنگە، لەوانەیە، دوورنییە.

**يحمور**: بڕوانە (أيل).

**يخ**: (ه) ییخ، ییخە، ئیخ.

**يد (ج) أيد جج أيادي**: دەس، دەست، جەج، چەچە (لە زاراوەی منداڵاندا).

- **راحة اليد**: لەپ، بەری دەستی.
- **رسغ اليد**: بڕوانە رسغ.
- **صنعة اليد**: دەستکار، دەسکار.
- **قبضة اليد**: قوڵمشت.
- **مشط اليد**: بڕوانە مشط اليد.

**يداً بيد**: دەستاودەست، دەسەودەس.

**يدوي**: دەسکرد، دەستکرد، دەسکر (مقابل الآلي).

**اليراع**: پێنووس، قـەڵەم، خـامـە، جـۆرە مـێـشـێـکە بەشـەو دەتروشکێ.

**يراعة**: شمشاڵ، بلووێر.

**يراق**: چەکێکە وەکو شیر و سوپەر و تیر و کەوان و هەم زین و پۆشاکی ئەسپێیە.

**يربوع (ج) يرابيع**: دوو پایلە، دوو پا، رسق، مشکەکوێرە، جۆرە مـشکێکی دەستکورتە، چشـتـی زۆر کـۆ دەکـاتەوە، مـشک کەروێشک.

**اليرقان**: زەردوویی، زەرتک، وردک، نەخۆشـیێکە لەبەر ناسازی جەرگ و باش کارنەکردنی وی مانەوەی زەرداو لەناو خـوێندا سـەر هەڵدەدا، پێـستی لەش و سـپـێـنەی چاوان زەرد هەڵدەگێرێ.

**يرقانة الزرع**: بروانە سوس الزرع.

**يرمع (ج) يرامع**: وردە بەردی سپی و تروسکەدارە.

**يرقة**: پێتویا (کیمیا).

**اليرناء**: خەنە.

**يزد جرد (ه)**: یەزدی کورد.

**يَسار**: گـوشـادی و ئاسـانی و دەوڵەمـەندی گـوشـادی لە بەهرەو ماڵدا.

**يسار**: چەپ، چۆپ، لای چەپ.

**يساري**: چەپرۆیی، چەپڕەوی.

**اليسر**: ئاسانکردن، سازگار.

**يسر يسراً**: نەرم بوون، ئاسـان بوون. کەوتنە ژێر دەست، هاتنە ژێر دەست.

**يُسر**: ئەسـپـایی، نەرمی، ئاسـانی. دارتەسـبـیـح (دارێکە لە بەرەکەی تەسبیح دروست دەکرێت).

**يسر**: سازگار.

**يسري**: لای چەپە.

**يسير**: بروانە قليل.

**يشم**: (ه) یەشم لە بەردێکی نرخدارە وەزەبەرجەدی دەچێ بەڵان لەو رێک و روونترە.

**يعسوب (ج) يعاسيب**: هەنگی نێرەیە، سەرهەنگ، شاهەنگ، میر و شای هەنگانە.

**يعقوب**: کەوی نێرە.

**يعمور**: گیسک، بەرخ.

**يعوق**: بوتێک بووە لەپێش ئیسلامدا عارەبان دەیانپەرست.

**اليغر والغرير**: دەعبایەکە لە نێوانی سەگ و گورپەیدا چوار پەلی کورت و رەنگی بۆرە.

**يغوث**: ناوی یەکێکە لەو بوتانەی کە لەپێش ئیسلامدا ئارەوان دەیانپەرست.

**يقطين**: کـوولەکـە، کـدوو، کـولندر، کـوندکێ، قـوندک، کـوڵند، کودوو، کەدوو، کوندر، کودی، گرێتی.

**يقظ**: وریا، زرنگ، هوشیار.

**يقظان**: بێدار، وشیار.

**يقظة**: ئاگاداری، بێداری، بەئاگایی، قەوێتی، ئارینەک، وریایی، های، هۆشداری، هۆشیاری.

**اليقظة الفكرية**: وریابوونەوە.

**يقين**: بێ دڵا و دڵی، بێ سوو، بێ گومان، باوەڕی.

**يلبة**: تیردان، کلاوێکە لە پێستە.

**يَلَنجُوج**: عودی بۆن خۆش.

**يم**: بروانە (بحر).

**يمام ويمامة**: گاکۆتر، کۆترە کیویلە، گاپەل، کەڤۆکورک، تنتسک.

**يمكن**: دەشێ، دەتوانرێ، ڕەنگە، گاهەس، لەوانەیە.

**يُمن**: پیت، پیرۆزی، بەختیاری، پیرۆزکاری، فەڕ.

**يَمَن**: پارچە خاکێکە لە وڵاتی عەرەبستانییە.

**يمين (ج) أيمن وأيمان**: سـووێند، کیس، سووێن، سـووند. ڕاست، لای ڕاستە.

– **حلف اليمين**: کیس خواردن، سوێند خواردن.

**يمنة**: لای ڕاست، ڕاستگە، ڕاستگا. پیت، پیرۆزی.

**ينبغي**: پێـویـست، دەبێ، نەبێ، دەتـوانرێ، دەوی، دەوێت، دەست دەدا.

**لا ينبغي**: نابێ، دەست نادا، گەرەک نییە.

**ينبوع الماء (ج) ينابيع**: کانی، کانیاو، سەرچاوە، هانە، چەمە، چاوکە، چاوگە، دهنگالە.

**يهود**: جوو، جهوو، جوولەکە.

**يهودي**: جوولەکەییک، کەسێکە لەسەر ئایینی مووسای بێ.

**يهودي الاصل**: بنەجوو، بنجوو.

**يهودية**: مێیینەی (یهود)ییە بە(ئورشیلم)یش دەڵێن.

**يؤ يؤ**: ماسیگرە، ماسی گرەک، باشوکری ماسیان.

**يوجد**: هەس، هەیە، ڤێ هەی.

**يوح**: ڕۆژ، خۆر.

**يوم (ج) ايام**: ڕۆژ، ڕۆژگار، ڕۆ، ڕۆش، ڕۆچیار.

**اليـوم**: هەورۆ، ئەورۆ، ئەمـرۆ، ئیـرۆ، ئارۆ، ئەمـرۆکـە، ئیـمـرۆ، ئیمرۆکە.

– **ايام البيض**: ئەو ڕۆژانەیە کە شەوەکانی مانگەشەون.

**يوم الاثنين**: ڕۆژی دووشەممە، (دووشەممە)، دووشەمبە.

**يوم الثلاثاء**: ڕۆژی سێ شەممە، (سێ شەممە).

**يوم الاربعاء**: ڕۆژی چوارشەممە، (چوارشەممە).

**يوم الخميس**: ڕۆژی پێنج شەممە، (پێنج شەممە).

**يوم الجمعة**: ڕۆژی هەینی، (هەینی).

**يوم السبت**: ڕۆژی شەممە، (شەمە)، شەممە.
**يوم الاحد**: ڕۆژی یەک شەممە، (یەک شەممە).
**يوم الآخرة**: پەسلان، ڕۆژی دوایی (قیامەت).
**يوم الاخير**: پاش ڕۆژ، ڕۆژی دوایی.
**يوم الاستحقاق**: ڕۆژی ماف وەرگرتن، ڕۆژی دانەوە.
**يوم الحشر**: ڕۆژی کۆکردنەوە، پەسلان.
**يومي**: ڕۆژی.

# المصادر - سەرچاوەکان


١- مصباح المنير: تأليف احمد بن محمد علي.
٢- المنجد تأليف الاب لويس معلوف اليسوعي.
٣- القاموس العصري (عربي - انجليزي) تأليف الياس انطون الياس وادوار أ. الياس.
٤- القاموس العصري (انجليزي - عربي) تأليف الياس انطون الياس وادوار أ. الياس.
٥- الفرائد الدرية في اللغتين العربية والفرنسية لاحد الأباء اليسوعين - بيروت.
٦- قاموس في اللغتين الفرنسية والعربية تأليف P. J. Be-lot s. J.
٧- Belot
٨- فرهنگ جامع عربی - فارسی تالیف احمد سیاح (چوار بەرگە).
٩- اختری کبیر تالیف مصطفی بن شمس الدین.
١٠- احمدی تالیف شیخ معروفی نۆدەیی.
١١- التحفة المصرية (عربي - انكليزي).
١٢- دائرة معارف الناشئين نقلتها الى العربية واضافت اليها فاطمة محمد محجور مفتشة الانجليزية في مصر.
١٣- المبادئ الضرورية الجديدة في تعلم اللغة الانكليزية - تأليف جورج آرتين مراد.
١٤- مرشد المتعلم وترجمان المتكلم في اللغتين العربية والفرنسية تأليف المعلم جرجيس نوفل - بيروت.
١٥- قاموس الجيب العلمي تأليف فياض عبداللطيف النجم.
١٦- المعجم الذهبي (فارسي - عربي) تأليف الدكتور محمد آلتونجي حلبي.
١٧- فەرهەنگی مەردۆخ - یادگاری شێخ محەمەد مەردۆخی کوردستانی.
١٨- معجم انجليزي - عربي في العلوم الطبية والطبيعية - تأليف محمد شرف - قاهرة.
١٩- فرهنگ اورنگ - عربي - فارسي یادگاری پرۆفیسۆر مراد ئەورەنگ.
٢٠- كنز اللغة.
٢١- نەوبەهاری ئەحمەدی خانی.
٢٢- الزمخشري، اساس البلاغة، القاهرة.
٢٣- جبران مسعود، الرائد، معجم لغوي عصري، بيروت، ١٩٦٧
٢٤- مجدالدين محمد بن يعقوب الفيروز آبادي، القاموس المحيط، القاهرة.


بۆ بەشە کوردییەکانیشی سوود لەمانەی خوارەوە وەرگیراوە:


١- فەرهەنگی کوردستان. لە دەزگای ئاراس چاپ کراوە.
٢- فەرهەنگی (کۆلکە زێڕینە) کە بەزمانی کوردی، فارسی، عارەبی، فەرەنسی و ئینگلزییە و لە بنچینەدا (٤٠٠) لاپەڕەی دەستنووسە لە ساڵی ١٩٥٥دا بەپیتی کۆن و شکاو و لەسەر قاقەزی گەند بۆ جاری یەکەم ١٣٢ لاپەڕەی لێ چاپکراوە بەڵام لە ساڵی ١٩٦٦دا لەسەر قاقەزی باشتر و بەپیتی نوێتر چاپی دووەمی لە (٢٤٠) لاپەڕاندا ئەنجام درا.
٣- جەمال نەبەز، فەرهەنگۆکی زانستی، هەولێر، ١٩٦٠-١٩٦١ بۆ ئەوەی ئەم فەرهەنگە سوودمەندتر بێ چاوێکیش بەپەروەردە و زانست و چەند لاپەڕە فەرهەنگۆکەکانی دوایی پەرتووکی قوتابخانە سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەییەکاندا خشێنراوە، ئەوا بۆ وێنە و بەڵگە ناوی هێندێکیان لە خواردوە دەخەمە بەر چاوانەوە:(*)
١- بنچینەی زانیاری و پەروەردە.
٢- پەروەردە ئایینی.
٣- پەروەردەی نیشتمانی و کۆمەڵایەتی.
٤- جوغرافیای عێراق.
٥- ڕێزمانەکان.
٦- زیندەوەرزانی و دروستی.
٧- ژمارە و پێوان.
٨- سەرەتای ئەندازیاری.
٩- سەرەتای میکانیکی و خۆماڵەکانی مادە.
١٠- فیزیک.
١١- کیمیا.
١٢- مێژووی نوێ.
١٣- دستوور و فەرهەنگی زمانی کوردی.
١٤- دوو ڕشتە فەرهەنگی عەرەبی و کوردی.
١٥- ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی.
١٦- گۆڤاری زانیاری کورد، کۆڕی زانیاری.
١٧- نەورۆز (گۆڤاری ژمارە ٢ ساڵی (١))


(*) تێبینی: وشەکانی ناو گشت فەرهەنگۆکەکانی دوایی کتێبی قوتابخانەکان و ئیتر هەندێکیان لە فەرهەنگەکانی من وەرگیراون بەڵام ئەوانی تریشیان کە خراونەتە ناو ئەم فەرهەنگەوە ئەگەر هی وایان تێدابێ کە واتاکانیان پڕ بەپێستیان نەبێ و یان پەسند نەکرێ لە ئەستۆی خاوەندەکانیانە.

گیوی موکریانی

# فهرست